سەرپەرشتیاری گشتی
شێرکۆ بێکەس

راوێژکار
ئەکرەم قەرەداخی

سکرتێری ڕۆڤار
یاسین عومەر

ستافی ڕۆڤار
نەورۆز حسێن، سەلام مستەفا
ناسك عەزیز

سەرپەرشتیاری هونەری
قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەر
ئاسۆ سەعید

سەرپەرشتیاری چاپ
فەرهاد ڕەفیق

ڕۆڤار بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر
ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك،
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
دوومانگ جارێك دەریدەکات

ناونیشان
سلێمانی- شارێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

لە دەرەوەی وڵات
Tel: 00441628477660
Fax: 00441628486008

Web Site
www.sardam.info

Email
Sardam@sardam.info

چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم





## سەیوان سەعیدیان

لەدایکبوی ساڵی 1972 لە شاری پیرانشار.
خوێندنی سەرەتایی تا دیبلۆمی لە شاری مەهاد تەواوکردوە.
تا ئێستا 13 پێشانگەی تایبەتی لە شارەکانی تاران، مەهاباد، سنە، قەزوین و سلێمانی کردۆتەوە.
دیزاینی کۆمەڵێك پۆستەرو ئارم و لۆگۆو زیاتر لە 100 بەرگی کتێبو گۆڤاری کردوە.
کاری هونەری لەگەڵ گۆڤارەکانی: سروە (ورمێ) سپی تر، متمانە، سیڤ، کاروان و ....کردووە.
ئێستا قوتابی قۆناغی سێهەمی کۆلێژی هونەرە جوانەکانی زانکۆی سلێمانییە.

## ژمارەکانی ڕابردوو

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەلانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحمود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵلا پەشێو، جگەر خوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی، ئیبراهیم ئەمین باڵدار.

# به یادی نووسەر و ئەدیب و تێکۆشەری شەهید مامۆستا حەسەنی قزڵجی*

**حەسەن ماورانی**

که مندالٚ بووم، شەوانە گەورەکان لە دەوری ڕادیۆ کۆدەبوونەوە و چاوەڕوانی دەسپێکردنی بەرنامەی کوردیی "پەیکی ئێران" دەبوون کە لە شەستەکان و گرمەی شۆڕشی کوردستانی باشور و شۆڕشی چەکدارانەی 67–68ی کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا، تاقە دەنگێکی هەواڵدەری خەباتی کوردەکانی کوردستانی بندەستی ئێران بوو.

زۆر جاران ناسیاوانی بە تەمەن تر دەیانگوت کە ئەوە مەلا حەسەنە کە لەسەر پەیك قسان دەکا. هەموو جارێکی کە میوانێکی ناشارەزا لەوێ بایە باس دەکرا کە مەلا حەسەن چ بلیمەتێکە و باسی بنەماڵەی زاناپەروەری قزڵجی دەهاتە گۆڕێ. کە بە حەق مامۆستا هێمنی ڕەحمەتی، شاعیری پایەبەرزی کورد گوتوویەتی:

لە موکریان باوە دەڵێن: "بنەماڵەی قزڵجی وەك بێچووە مراوی وان هەر لە هێلکە هاتنەدەر مەلەوانن". مەبەستیان ئەوەیە ئەوی لەو بنەماڵەیە بێ هەر لە منداڵییەوە زانا و پیتۆڵە بە ڕاستیش ئەو بنەماڵە بەڕێزە گەلێك پیاوی بلیمەت و زانای لێهەڵکەوتووە کە بێ ئەوەی بۆ خۆیان ویستبیان ناوبانگی زانست و هونەریان لە دنیادا بڵاوبۆتەوە. (سەرەتای کتێبی "پێکەنینی گەدا").

بە گەنجێتی جاروبارە لەگەڵ هەندێ هاوڕێ، بە دزییەوە، گوێمان لە بەرنامەکانی بەشی کوردیی ڕادیۆی "پەیك" دەگرت. دەنگی لەسەرخۆی مامۆستا قزڵجی بە دڵ دەنیشت و بە تایبەت بەرنامە ئەدەبییەکانی چێژی تایبەتی خۆی هەبوو.

پاشی تێکەڵاوبوونی سیاسەت و خەبات، بۆ یەکەم جار لە 1977 بە ڕێگەی قاچاخ کتێبی "پێکەنینی گەدا"م دەسکەوت و بۆ یەکەمجار بە هەموو گیان و دڵەوە شانازیم بە هەبوونی نوسەرێکی باڵادەستی ئەوتۆی کورد کرد کە بە پێکەنین بتگرێنێ.



لە سەروبەندی شۆڕشی دژی پاشایەتی ئێراندا بوو، ڕۆژێك لە تاران لە ماڵێ دانیشتبووم کە زرینگە لە تەلیفۆن هەستا.

–ئەلۆ فەرموو!

لە نەکاوڕا وەك کارەبا گرتبێتم قیژاندم.

–کوڕینە وس بن مامۆستا قزڵجییە!

خاڵم (کاك حەمەدەمینی سراجی) ژمارە تەلیفۆنەکەی ئێمەی دابوو بە مامۆستا کە بتوانێ لە دەنگوباسی ناوەوە ئاگادار بێتەوە. من تەنیا لە ڕوی دەنگ ڕا ناسیمەوە.

پاش شۆڕش بۆ یەکەم جار لە تاران زیارەتم کرد. پیرەمێردێکی کورتەباڵای بەخۆوە بوو کە بە یارمەتی گۆچانەکەی دەڕۆیشت و گەرچی پیر بوو، چاوەکانی وریا و زیت بوون. ڕوخساری پیرەمێردانەی مامۆستا وێڕای ڕەوشێکی خاکسارانە و جلوبەرگی پاك بەڵام دەروێشانە کاریان دەکردە سەر مرۆڤ. خۆش قسە و دەم بە نەقڵ بوو.

بۆ یەکەمجار کە دیتم، هەر وەمدەزانی بەرەو ڕووی پاڵەوانەکانی چیرۆکەکانی "پێکەنینی گەدا" بوومەوە نەك خوڵقێنەری ئەم چیرۆکانە. هەڵسوکەوتی سەنگین و دەمی بە پێکەنین و خۆمانەبوونی مامۆستا سەرنجی هەموو کەسی لە یەکەم بەرەوڕووبوونەوەدا بۆ لای خۆی ڕادەکێشا. مرۆڤ لە هاودەنگی و هاونیشینەکەی تێر نەدەبوو. ژیانێکی دوور و درێژی پڕ لە کارەسات و تەنگ و چەڵەمە، وێڕای ڕوانگەیەکی ساتیری زانستیانە و خوێندەوارییەکی قووڵی وردبینانە و هونەری گێڕانەوەی چیرۆکنووسانە، لە دڵی هەر کۆڕ و کۆمەڵێکدا بە هاسانی جێگای مامۆستا قزڵجییان دەکردەوە.

پاش چەند مانگان، بە هەڵکەوت یان بە کایەی ڕۆژگاری دابنێین، لە دامودەزگای حیزبی تودەدا بووم بە هاوکار و لە ڕاستیدا شاگردی مامۆستا و هەوڵماندا ڕۆژنامەیەکی کوردی بڵاوکەینەوە. لە سەرەتادا بە ناوی "ڕێگای کوردستان" ئیمتیازی دەرچوونی ڕۆژنامەیەکی کوردیمان لە سەر ناوی برادەرێکی کوردی دڵسۆز وەرگرت. مقۆمقۆ و کەمتەرخەمی بەڕێوەبەرایەتی (باشترە بڵێین ئەوانەی لە بەڕێوەبەرایەتیدا دەستیان دەڕۆیشت) بڵاوکردنەوەکەی وەدوادا. پاش ماوەیەکی هەر وەك باوە، کوردی بە کوردان فت دەکەن. نامە و گازندەی چەند کوردێك لە لایەن بەڕێوەبەرییەوە قوتکرایەوە کە گوایە ئەم کابرایە وابوو و واچوو! لە پاشانیشدا حوکمیان دا کە چۆن جەماعەتێك لەم برادەرە بە گومانن کە لە ڕاستیدا خۆیان قونوبانی کاریان نەبوو و ئیرەییان بەو دەکرد!" بەڕێوەبەرایەتی لە خێری ئەم ئیمتیازە چاوپۆشی دەکا. بڕیاریان دا کە وەشوێن ئیزنی ڕۆژنامەیەکی تر کەوین. کات تێپەڕ دەبوو و میری پتر جێگیر دەبوو و گوشاری پتری دەخستە سەر ڕاگەیەنەرە گشتییەکانی نادەوڵەتی. بەم هۆیەش ڕێگای وەرگرتنی ئیمتیاز بەربەست کرا. بەڕێوەبەرایەتی ئینجا بڕیاری دەرچوونی ڕۆژنامەیەکی کوردیی لەسەر ناوی ئۆرگانی ناوەندی حیزبدا. بەم جۆرە ڕۆژنامەی "مەردم" (ئۆرگانی ناوەندی حیزب بە زمانی کوردی) لە دایك بوو. مامۆستا بوو بە بەرپرس و منیش بوومە شاگرد و هاوکاری ئەو.

لە ڕاستیدا بەڕێوەبەرایەتی حیزب کە لەژێر زەختی کوردەکاندا ملی بۆ ئەم بڕیارە ڕاکێشابوو، لە ئاست دەرنەچوونی "ڕێگای کوردستان" نەك دڵگیر نەبوو بەڵکو بەوپەڕی پێخۆشبوونەوە وازی لەو ئیمتیازە هێنا. هۆیەکەشی وەك هەر ئەودەم مامۆستا باسی کرد ئەوەبوو کە:

"ئەمانە پێیان خۆش نییە کە وتاری کوردیی سیاسی لە لایەن کوردەکانەوە بە زمانێك بنووسرێ کە هەتا دوای بڵاوبوونەوە تێی نەگەن".

لە ڕاستیشدا "مەردم"ی (کوردی) وتارە سیاسییەکانی وەرگێڕانی وتارە سەرەکییەکانی "نامە مردم" (ئۆرگانی ناوەندی بە زمانی فارسی) بوو تەنیا هێندێ ڕاپۆرت و وردەواڵە و بەشی ئەدەبی بوو کە سەربەخۆ دەنووسران.

بەهەرجۆر ئەم هاوکارییە و لە ڕاستیدا پێوەندییە کە بەم جۆرە لە نێوان من و مامۆستادا ساز بوو تەنیا بە شاگرد و مامۆستایی و هاوڕێی حیزبی قەتیس نەبۆوە و وەك مام و برازامان لێهاتبوو، ماوەی دوو ساڵان، واتا هەتا چەند مانگێك بەر لە گیرانی مامۆستا (لەو چەند مانگەشدا هەتا لە کوردستانەوە دەچوومە تاران هەر سەریم دەدا) زۆربەی کات بەلایەوە بووم و لە بارەی هەموو ژیان و بەسەرهات و نەقڵەکانیدا قسەی بۆ کردبووم. دەیان جار هەوڵم دا کە هێندێ شریتی لەگەڵ تۆمار کەم بەڵام هەر ئەوڕۆ و سبەینێی دەکرد و وەپاشی دەخست.

بە داخەوە مامۆستا قزڵجی لە 16ی مانگی ڕێبەندانی 1361دا، وێڕای زۆربەی بەڕێوەبەرایەتی حیزب گیرا و پاش چەند مانگان واتا لە پایزی 1362دا خەبەری مردنیان دا بە کەسوکاری.

لە ماوەی زینداندا تەنیا مامۆستا مەلا ساڵحی ئیبراهیمی ئیزنی درا کە لە زینداندا چاوی بە مەلا حەسەن بکەوێ. من لە پاش مردنی مەلا حەسەن بە هەر شێوەیەك ئاگاداری ئەو چاوپێکەوتنە بوومەوە. کاتێ چاوپێکەوتن حاڵی مەلا حەسەن ئەوەندە خراپ بووە کە بە ڕاکشاوی هێناویانە و مەلا ساڵح گێڕاویەتەوە:

لەسەر تەختێك ڕاکشابوو. قسەکانی زۆر مەفهوم نەبوون. سەرم خوار کردەوە و گوێم بردە بەردەمی. دەیگوت سڵاوی برادەر و دۆستان دەگەیەنم و گەردن ئازایی لە هەمووان دەخوازم.

مەحمودی ڕۆغەنی کە لە زیندانی "ئێوین" بە زیندویی نەجاتی بووە و لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی حیزب لە ژێر ئەشکەنجەدا بووە، لە بارەی مەلا حەسەنەوە دەڵێ:

مەلا حەسەن لە زینداندا مرۆڤێکی لەسەر دڵان بوو جەللادەکان ئەو پیاوە پیرەکان بێڕەحمانە ئازار دەدا. هەر لە ئەنجامی ئەو ئازارانەشدا بوو کە گیانی دا و شەهید بوو.

بەم جۆرە شۆڕە سواری چیرۆکنووس و مامۆستای ڕۆژنامەوانی و ئەدیب و تێکۆشەری دادپەروەریخواز و نیشتمانپەروەری کورد لە ساڵی 1362دا، لە تەمەنی 72 ساڵیدا، بە دەستی پیاوکوژەکانی کۆماری ئیسلامی لە زیندانی ئێویندا شەهید کرا.

### ژیاننامەی مامۆستای شەهید مەلا حەسەنی قزڵجی

مەلا حەسەن لە ساڵی 1292ی هەتاویدا لە گوندی قزڵجەی سەر بە بۆکان لەدایکبووە. خوێندنی لە لای مامۆستا تورجانیزادە (کە مامی مەلا حەسەن بووە) دەستپێکردووە و وەك خۆی دەیگێڕاوە لەگەڵ کوڕی مامی (حافیدی) کە لە پاشان لە شاری کرمانشان بوو بە قازی، جگە لە فارسی و عەرەبی و دەرسی ئایینی، زمانی کوردی و دەرسی "ڕیازیات" (حیساب و جەبر و هەندەسە) و فەلسەفە و مەنتیقیشیان هەر لای مامۆستا تورجانیزادەوە خوێندووە.

لە ساڵی 1317دا وەك کارمەندی فەرمانداری لە مەهاباد دەستبەکار دەبێ و دەبێتە موچەخۆر. لە بارەی ئەو سەردەمەوە دەیگوت فەرمانداری مەهاباد کابرایەکی تریاکی بە ناوی "سریع القلم" بوو. کابرایەکی خوێندەوار بوو. بەڵام لە ڕاستیدا هیچکارە بوو و تەنیا ناوی فەرماندار بوو.

هەر لەو سەردەمەدا دۆستایەتی و تێکەڵاویی لەگەڵ مەلا عەوڵای داودی کە لە دەورەی خوێندن لە لای مامۆستا تۆرجانیزادەڕا دەستپێکرابوو، ڕێکوپێکتر دەبێ و پێوەندیی لەگەڵ چەند گەنجی بە توانا و نیشتمانپەروەری دیکەی وەك زەبیحی و هێندێ پیاوی دنیادیتووی وەك میرزا حوسێن کە میرزای بایز ئاغای مەنگوڕ بووە پتەوتر دەبێ.

وەك مامۆستا بۆ خۆی باسی دەکرد، دەورەی خوێندنی لای مامۆستا تورجانیزادەوە، ئەو دەرفەتەی بۆ پێکهێنا کە نەك هەر لە مامی بەڵکو لە زۆرێك لە دۆستانی مامی کە دایکم لە مەجلسیاندا باسی کوردایەتی و مافی نەتەوایەتی دەکرا بۆ پەروەردەکردنی خۆی کەڵك وەرگرێت. یەکێك لە مامۆستاکانی، زانا و نیشتمانپەروەری کورد، مامۆستا فەوزی بوو لە بارەی فەوزیدا دەیگوت:

"مامۆستایەکی زانا و نیشتمانپەروەری بلیمەت بوو. فەوزی سوسیالیدێمۆکراتێکی پەرەوازەی کورد بوو کە لەودیوی ڕا (مەبەست کوردستانی باشوورە) ڕای کردبوو و لە خاناقای بوو. هانی وەك مەلا خۆی گرتبۆوە. لەگەڵ زۆر ڕووناکبیری موکریان یەکتریان گرتبۆوە و دەرسی کوردایەتی و نیشتمانپەروەریی دادەداین".

لەو سەردەمەدا خەباتی کۆڕ و کۆمەڵانی ڕوناکبیری کورد لە پەرەسەندندا بوو. ناسیاوێتی پێوەندی گرتنی بە نهێنی دەسپێکردبوو.

لە خەرمانانی 1320ی هەتاویدا ڕژێمی دیکتاتۆری ڕەزاشا ڕووخا شنەبای ئازادی کوردستانی بووژاندەوە. مامۆستاش وێڕای ڕووناکبیرە کوردەکان هەنگاوی نایە قۆناخی نوێی خەباتەوە.

لە نەورۆزی 1321دا کارتێکی پیرۆزبایی نەورۆزانەی لە ورمێ چاپکرد و لە مەهاباد و بۆکان بۆ دۆست و برادەرەکانی نارد. مامۆستا قزڵجی لە 1360دا، واتە پاش نزیکەی چل ساڵان ئەوەندە بە خۆشییەوە باسی ئەو کارەی دەکرد کە دەتگوت دوێنێ کردوویەتی. دیارە وەك یەکەم هەنگاوی نووسینی بە ئاشکرای کوردی ئەو کارەی مامۆستا بایەخی خۆی هەیە.

لە ساڵانی 1324-1321ی هەتاویدا تێکەڵاوی کۆڕ و کۆمەڵانی ڕووناکبیری سەردەم دەبێ. ئەو بە پێی سروشتی لە سەرخۆ و هێمنانەی خۆی قەت نەبوو بە کادێرێکی چالاکی و ڕمبازێنی ڕێکخراوەیی بەرچاوان، بەڵکو خوێندنەوە و فێربوون و لێکۆڵینەوە و چالاکی ڕاگەیاندنی کردە چەکی تێکۆشان.

هەربۆیەش لە سەردەمی کۆماردا بە بێوچان ئاوێتەی کاری ڕۆژنامەوانی بوو. سەرەڕای نووسینی لە ڕۆژنامەی "کوردستان"دا، گۆڤاری "هەڵاڵە" کە گۆڤارێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتوری بوو دەردەکرد. پاش ڕوخانی کۆماری کوردستان، وێڕای زۆر تێکۆشەری کوردی دیکە، لە سنوور پەڕییەوە و ژیانی پەرەوازەیی دەستپێکرد. ژیانێکی پڕ لە تەنگ و چەڵەمە و خەبات کە هەتا ڕوخانی ڕژێمی شا واتا 37 ساڵی ڕەبەقی خایاند.

دۆستانی ئەو سەردەمەی مامۆستا کە هەتا ئاخر دیدارەکانمان باسی دەکردن، هەژار، هێمن، زەبیحی، مەلا عەوڵای داودی، پێشەوا بوون. گەرچی وەکی مامۆستا هێمن لە سەرەتای کتێبی "پێکەنینی گەدا"دا نووسیویەتی:

"..مامۆستا قزڵجی بێ ئەوەی سینگ ڕەپێش خاو خۆ ڕانێ. یەکێك لە خۆشەویستترین و نزیکترین دۆستانی پێشەوا قازی محەمەدی ئەدەب دۆست و هونەرپەروەر بوو".

ئەو هەمیشە قازی نەمری وەك "پێشەوا" باس دەکرد.

لە بارەی هەژار و زەبیحییەوە کە ساڵانێکی دوور و درێژی پەرەوازەیی لە گەڵیان بوو، سەرەڕای جیاوازیی بیروڕایان کە هەریەکەی بە لایەکدا ڕۆشتبوون، بەو پەڕی خۆشەویستییەوە دەدوا.

هەژار لە کتێبی "چێشتی مجێور"دا گەلێك بەسەرهاتی دەورانی پەرەوازەیی هاوبەشیانی نووسیوەتەوە و خۆیانی بە "سێ تفەنگدار" ناساندووە. مامۆستا قزڵجیش گەلێ جار باسی ئەم دەورانەی دەکرد. دەیگوت:

"جارێك لە بەغدا زۆر پەرێشانحاڵ بووین. لە چێشخانەیەك کاری قاپ شۆردن و خاوێن کردنەوەمان دەسکەوت و بە پارەیەکی کەم کارمان دەکرد. پاش چەند ڕۆژان هەژار کە حاڵی کەوشەکانی زۆر

شــڕ بــوو، جووتێــك پــێڵاوی تــازەی كــڕی. لــە قرچــەی گــەرمای نیوەڕۆیاندا دەبوایە یەكێك چووبایە و نانی لە نانەواخانە هێناباوە. ئەوێ ڕۆژێ بە هەڵكەوت خاوەنكارەكە ڕووی لە هەژار كرد و ناردی بۆ نان هێنانەوە. هەژاری هەژاریش كە تازەی كەوش كڕیبوو، دڵی نــەهات لــە پێیــان كــا و بــە پێخاوســی وەڕێكــەوت. بەغــداش وەك جەهەنەم گەرم بوو و قیرتاوی سەر جادە توابۆوە و هەژاریش لەبەر سوتانی بنی پێی بە قیرتاوەكە هەر بە هەڵاتن ڕۆشتبوو. هێندەی پێنەچوو كە ئارەقاوی و نێوچاوان گرژ بە تەبەقە نانەوە هاتەوە. كابرای خاوەنكاریش كە ئەمەی دیت و خەبەری لە نەقڵی كەوش نەبوو بە پێخۆشبوونەوە گوتی: ئافەرم! هەی ئافەرم! كوڕ دەبێ ئاوا ئازا بێ. تەماشا چ خێرا هاتەوە. هەی داوەشێن هەركامتان دەنێرم سەعاتێك خۆتان دەخافڵێنن. بەخوا لە مەودوا كوڕم هەر تۆ دەبێ بچی نان بێنی".

لە بارەی زەبیحیدا دەیگوت:

"زەبیحــی حــەزی لــەوە بــوو كــە بۆینبــاخ و كــۆت و شــەلواری ڕێكوپێك لەبەر كا. زۆر پوخت و خاوێن بوو. زۆر جاران سەروبیچمی دیپلۆماتیكانەی ئەو تووشی مەترسیی دەكردین، بەڵام گوێی بۆ شل نەدەكردین، هەتا جارێك لە شورتەی ڕا داوایان كردین. ڕاپۆرتیان لێدابووین كە ئێرانیین. من جلە شڕەیەكی بۆیاخچییانەم لەبەر كرد و ئەویش قات و كراوات و كڵاو. كە چووینە ژوورەوە بێ یەك و دوو ئەویان خستە ناو ژوورێكەوە و گرتیان. كابرای ملازم (ئەفسەر) پرسیاری لە من كرد كە ئایا ئێوە ئێرانین و منیش بە زاراوەی عارەبی قەیساوی گوتم: نازانم دەڵێی چی!

گوتی: تۆ عارەبی یان كورد؟

گوتم: .. (وشەیەكی پیسی باوی نێو خێڵاتی عارەب)

كابرا ئاوری گرت و بەسەر شورتەكاندا نەڕاندی كە هەی.. ئەم بۆیاخچییە عارەبە بەستەزمانەتان بۆ لە نان پەیداكردن خستووە. بەرەڵایان كردم. هێندێ برادەری شیوعی بە بەرتیل و نێوانجی لای ئێوارە زەبیحیان هێنادەر".

لە ماوەی 16 ساڵانەی ژیانی پەرەوازەیی لە باشووردا ژیانی ئەو سێ كەسە بە شێوەیەك لێكگرێدرابۆوە كە بە ڕاستی "سێ تفەنگدار"یش وەها تێكەڵاوی یەك نەبوون. هەركامیان بە شێوەیەك تێكەڵاوی كاروباری سیاسی و كۆمەڵایەتی كوردستانی باشوور بوون. سەدان و هەزاران دۆست و برادەری هاوبەشیان لە جەرگەی خەباتكارانی كورددا هەبووە. لە هەمووی گرنگتر ئەمەیە كە هەرسێكیان لەوپەڕی نەهامەتی و بێدەرەتانیدا وازیان لە ئەدەبی كوردی و پەرەپێدانی كولتوری نەتەوایەتی نەهێنا و لە ئەنجامدا ئەم سێ كەسە وێڕای مامۆستا هێمن كە هەموویان لە ناوچەی موكریان بوون و بە یادگاری كۆماری كوردستان ناسراون، شێوەیەكی نووسینی كوردییان داڕشت كە كارتێكەری گەورەی لەسەر ئەدەبی كوردی هەبووە.

پاش ڕوخانی كۆمار، یەكەم هەوڵدانی مامۆستا قزڵجی بڵاوكردنەوەی ڕۆژنامەی ڕێگا بوو. كاك غەنی بلوریان لە بیرەوەرییەكانی خۆیدابە نێوی "ئاڵەكۆك" (لاپەڕەكانی 95-78)دا بە وردی باسی ئەو ڕۆژنامە و بڵاوكردنەوەكەی كردووە. هەروەها كاك عەلی كەریمی لە كتێبی "ژیان و بەسەرهاتی عەبدولڕەحمان زەبیحی"دا لە لاپەڕەكانی 122-119دا بە كورتی و لە زمانی "محەمەدی شاپەسەندی و كاك غەنیەوە باسی ڕێگای كردووە. مامۆستا قزڵجی هەمیشە كە باسی "ڕێگا"ی دەكرد، زۆر بە گەرمی و ئەمەكناسانە باسی یارمەتییەكانی "شێخ لەتیف" و كاری كارناسانەی تێكۆشەری پەرەوازەی دیكەی كورد "محەمەدی شاپەسەندی"ی دەكرد. گەرچی خۆی دەوری سەرەكیی لە كارەكەدا هەبوو باسی خۆی نەدەكرد. وەك ئەو باسی دەكرد زەبیحی و ئەو و شاپەسەندی و كاك غەنی (كە لەوان گەنجتر بوو) بەم كارە بەرزە هەستان.

مامۆستا دەیگێڕاوە:

"پێویستمان بە ماشێن تایپ بوو. لەم ناوە دەست نەدەكەوت. تەنیا لە سەرای قایم مقام لە سولەیمانی هەبوو. داوام لە شێخ لەتیف كرد كە یارمەتیمان بدا. گوتی پارە هەیە و فەرموون بیكڕن و من پارەكەی دەدەم. پێم گوت كە تەنیا لە سەرای قایم مقام هەیە و ڕێگای دیكە شك نابەم. شێخ لەتیف حەزی لە ڕابواردن و گاڵتە بوو. گوتی: "وەڵڵا دزیم لە سەرا پێناكرێ". شەو "خولە پیزە" (گەنجێكی تێكۆشەری كورد بوو كە لە دژی زوڵم و زۆری ڕژێمی عێراق و دەرەبەگە جاشەكان چەكی بە دەستەوە گرتبوو و یاخی ببوو). ڕاسپاردبوو كە بێتە سیتەك و بزانێ ئێمە چمان دەوێ و بۆمان جێبەجێ بكا. شەو چەكدار لە خەویان هەستاندین و پاشان من وێنەی ماشێن تاییپم بۆ خولە كێشاوە. بەستزمانانە قەت نەیاندیتبوو. پاش چەند ڕۆژان خەبەرهات كە خولە پیزە هێرشی بردۆتە سەر سەرای قایم مقام لە سولێمانی. بەم جۆرە پاش ماوەیەكی تایپمان دەسكەوت".

لە ژیانی پەرەوازەییدا لە توتنەوانی ڕابگرە هەتا وێنەگری كردبوو. لە هەمان كاتدا بە وتار و نووسین و هاوفكری و تەنانەت بناخەدانان هاریكاریی گەلێك بڵاوكراوەی كوردستانی باشووری كردبوو. لە هەموو ئەو ماوەیەشدا هەر تووشی مەترسی و ڕاوەدوونان بووە. ماوەی سێ ساڵان لەگەڵ زەبیحی كەوتنە زیندانی بەغداوە و لەم زیندانەدا پێوەندیان لەگەڵ زۆربەی تێكۆشەر و ڕووناكبیرە كوردەكانی باشوور پتەوتر بوو و لەگەڵ مامۆستا گۆرانیش هەر لە بەندیخانەدا بوونە ناسیاو.

جارێك گیرا و ڕەوانەی ئێران کرایەوە لە شاری "خەسرەوی" لە دەست ژاندارمەکان هەڵدێ و پەنا بۆ حافیدی کوری مامی دەبا و ئەویش بەهۆی شێخ حسام الدین ەوە دەربازی دەکات.

شوێن پێی ژیانی مامۆستا لە زۆربەی چیرۆکەکانیدا دیارە. لە ڕاستیدا زۆرێك لە چیرۆکەکانی لە بەسەرهاتی خۆی و یان ئەو شتانەی کە بە چاوی خۆی دیتویەتی سەرچاوەیان گرتووە وەك:

–عادەتی بازاڕ– میرزا هەر بۆ خۆیەتی.

–هێلکەی هادیخانی– کاتێ لە ئێران لە ماڵە شێخ خۆی شاردبۆوە.

–ئاغا وەجاغی ڕۆشنە،

محەمەدی مەلا کەریم، ئەدیبی هێژای کورد، لە پێشەکی چاپی دووهەمی "پێکەنینی گەدا"دا بەم شێوەیە باسی چیرۆکەکانی مامۆستا قزڵجی دەکا:

"ئێمە لەگەڵ بڵاوکردنەوەی دووەمین جاری بە کۆمەڵی ئەم چیرۆکە ڕیالیستیە میلیانەی کاك حەسەندا کە نمونەی چیرۆکی ڕاستەقینەی بە ئامانج و گەل پەروەرن، گفتی ئەوەش بە خوێندەواران ئەدەین کە هەوڵ بدەین هەر دوابەدوای بڵاوبوونەوەی ئەم کۆمەڵە، چیرۆکەکانی تری و چیرۆکە وەرگێڕدراوەکان و وتارەکانیشی کە لە پاش شۆڕشی تەموزەوە تا گەڕانەوەی بۆ نیشتمان لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی عێراقدا بڵاوی کردوونەتەوە، لە بەرگێکی تردا پێشکەشی خوێندەوارانی ئازیزی کوردیان بکەین".

ڕاستی ئەوەیە قارەمانی چیرۆکەکانی مامۆستا، کاراکتێری وەهمی و نائاسایی و داتاشراو نین. ئەوان هەر ئەو ئەندامانەی کۆمەڵگان کە نەك هەر حارێك و ڕۆژێك. بەڵکو هەمیشە لەبەرچاوی خوێنەرن.

"حەمەڕەش" پاڵەوانی چیرۆکی پێکەنینی گەدا، وەرزێرێکی لێقەوماوی چەوساوەی دەستی سەلەمخۆرەکانە. وێنەی مرۆڤێکی ڕەنجدەری کۆمەڵگای بندەست و پاشکەوتوو ڕاگیرا و لە ئەنجامدا بێدەرەتانی کوردەوارییە کە هێزی کارکردنی هەیە بەڵام وەك هەزاران وەرزێری تری کوردستان کە پاش لێقەومان ڕوویان لە شار کردووە و بێدەرەتان ماونەتەوە، تووشی سواڵ و گەدایی بووە.

لە چیرۆکی "عادەتی بازاڕ"دا کە میرزا کە لە ڕاستیدا مامۆستا قزڵجیە، عەبدولقادر ئەفەندی وەها بە وشە بەیانکراوە کە هەرکەسێ دوو ڕۆژ لە بازاڕەکانی دامەزراو لەسەر بنج و بناوانی دەڵاڵیی و وڵاتانی دنیای سێهەم و بە تایبەتی ناوچەی خۆماندا بگەڕێ، دەیان نموونەی بەرچاو دەکەوێ. یان لە چیرۆکی "بیهێنە، ئەمما ناوی مەبە"، "مەجید بەگ"ی کۆنە ئاغای لێقەوماو و کە لە ئاغایەتیدا هەر ناو و فیزەکەی پێماوە، وێنەی کلاسیکی زۆربەی کۆنە بەگەکانی کوردستانە کە بە هۆی شێوازی پەروەردە بوون و ژیان لەسەر دەستڕەنجی "ڕەعیەت" و بێکارەیی، تەنانەت نەبوونی فام و ڕوانگەیەکی جیا لە ڕاوڕووت کردنی خەڵك تووشی پەرێشانی و تەنگ و چەڵەمەیەکی زۆری ئابووری ببوون سەرەڕای ئەمەش وازیان لە خو و خەدەی چینایەتی نەهێنابوو.

لە سەرەتای ساڵەکانی شەستەکانی زاینیدا (1342– 1341 هەتاوی) پاش زەختی ڕژێمی قاسم بۆ کوردە پەرەوازەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، مامۆستا قزڵجیش تووشی تەنگ و چەڵەمەیەکی زۆر دێت بە یارمەتی حیزبی شیوعی عێراق بەرەو ئەڵمانی دیمۆکراتیك دەڕوا و لەوێندەرێوە هەر بە هۆی شیوعییەکان و کوردەکانی ئەندامی حیزبی تودەی ئێران لەو حیزبە گرێدەدرێتەوە. بەر لە گەڕانەوە لە پلینۆمی 16ی کۆمیتەی ناوەندیدا بە ئەندامی ڕاوێژکاری ئەم کۆمیتەیە هەڵبژێردرا و لە پلینۆمی 17دا بوو بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی.

لەم سەروبەندەدا ڕادیۆی پەیکی ئێران دامەزرابوو. ئەم ڕادیۆیە بەرنامەی فارسی و کوردی و ئازەری و عارەبیی بڵاودەکردەوە. مەلا حەسەن هەر لەو ساڵانەدایە کە دەبێتە بەرپرسی بەشی کوردی و هاوکاری بەشی عەرەبی وەك خۆی دەیگوت: "زۆر جاران کەسیان نەبوو بەشە عارەبییەکە هەڵسوڕێنێ و ئەویشم بە ملەوە دەبوو".

ماوەی پتر لە شانزدە ساڵان هەموو ڕۆژێ نیو سەعات بەرنامەی ڕادیۆیی بە زمانی کوردی، ئەویش بەشی زۆری بە تەنیایی (کاك کەریمی حیسامی کە لە پێشدا لە ڕادیۆدا کاری دەکرد لە 1347ی هەتاوییەوە لە لایەن حیزبی تودەڕا ئەرکی کار لە کوردستان و یارمەتی دیموکراتی کوردستانی پێ ئەسپێردرا و مەلا حەسەن بە تەنیا ماوە). کارێکی نە سوك و سانە. لەم ماوەیەدا ئەو توانیی بێجگە لە هەواڵ و دەنگوباسی بزوتنەوەی کوردی باشور و ڕۆژهەڵات گەلێك کاری بە کەڵکی ئەدەبی بکا وەك "شەرحی حاجی قادری کۆیی" کە یەکێ لە بەرنامە پڕگوێگرەکانی ئەم ڕادیۆیە لە کوردستان بوو، هەر لەو ماوەیەدا کتێبێکی ئاکادیمێکی بولغاری لەسەر ئەدەبیات بە کوردی وەردەگێڕێتەوە بە ناوی "تیئۆری ئەدەب" کە پتر لە 500 پەڕە بوو. ئەم کتێبە کە بڕیار وابوو لە لایەن حیزبی تودەوە لە چاپ بدرێ ئێستاش هەر بەدەست لابالی هەلی خاوەری سکرتێری ح. ت)یەوەیە.

هەڵبەت زۆر وتار و نووسراوەی تری مامۆستا لە ئارشێوی ڕادیۆی پەیکدا ماونەتەوە کە پێش ڕوخانی ئاڵمانی ڕۆژهەڵاتی درابوونەوە بە حیزبی تودە و ئینجائەمان چیان بەسەر هێناون کەس نازانێ.

لەم ماوەیەدا وەك خۆی باسی دەکرد گەلێك وتار و نووسراوەی لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردستان و ڕێگای ئازادی و ڕزگاریی و برایەتی و کوردستان و ڕێگای ئازادی و رزگاری و

برایەتی و کوردستانی باشوردا (بە تایبەت لە 1975–1970ی ز) لە چاپ دران یەکێ لەم کارە بەنرخانەی ماموٚستا، لێکوٚڵینەوەیەکی زمانەوانی لەسەر وشەکانی کوردی بوو کە پاش شوٚڕش لە تاران لە لایەن حیزبی تودەوە لە چاپ درا بە نێوی:

"سوان و تێکشکان و جێگوٚڕکێی پیتەکان لە زمانی کوردیدا".

پاش گەڕانەوە بوٚ نیشتمان کە خوٚی تراژیدا یەك بوو، واتە مروٚڤ 36 ساڵان لە وڵات پەرەوازە دەبێ و ماڵ و منداڵی خوٚی نابینێ ئاخوا چوٚن دەتوانێ بەرەو ڕوویان بێتەوە دەتوانم بڵێم دانیشتنی ماموٚستا لەلای ماڵومنداڵی وەك باوکی ئاسایی نەدەهاتە بەرچاو. لێك غەریب و هەرکام بە ژیانێکی تر خوٚیان گرتبوو. ژانی دەروونی ئەم بەرەو ڕوو بوونەوەش لە کاتی باسکردنیاندا بزەی لە چاوە زیتەکانی دەبڕی و پەردەیەکی خەمی بەسەر شێوە دوانیدا دەکێشا.

لەو ماوە کورتەیدا کە بە نیوە ئازادی لە ئێران ژیا، هەمدیسان بەرهەمی خامەکەی ڕەنگین و بە پێز بوو. جگە لە کاروبارێکی زوٚری وەرگێڕانی وتار و نامەی عارەبی کە بەسەریاندا ڕشتبوو، سەرجەم 61 ژمارەی "مەردم" بە زمانی کوردی بڵاوکراوە کە پتر لە سەتی حەفتای نووسین و وەرگێڕانەکەی لەسەر شانی ماموٚستا بوو. هەر لەم ماوەیەدا چەند چیروٚکی زوٚر جوانی تری لەم ڕوٚژنامەیەدا بڵاوکراوە کە دەتوانم بڵێم هەرکامیان شاکارێکی بێ وێنەن. بە تایبەت چیروٚکی "چەکمەڕەق" هەروەها گەلێك کورتە چیروٚکی زاتیریی نووسیبوو وەك:

"بێچوە قەل" (لە بارەی حیجابی ئیسلامییەوە) کە بە داخەوە مەودای لە چاپدانیان نەبوو و لە کاتی گیرانیدا وێڕای خوٚی تێدا چوون.

چەند خو و سروشتی تایبەتی ماموٚستا قزڵجی بە ڕاشکاوی ئەویان لە زوٚر کوردی تری سیاسی و پەرەوازە و تەنانەت نووسەر و تێکوٚشەریش جیا دەکردەوە.

یەکەم ئەو زوٚر خاکی و خوٚمانە و بێ تەکلیف بوو. دووهەم بێ شیلە و پیلە و ڕاستبێژ بوو.

سێهەم بە لە سەرخوٚیی بەڵام دەقوودوٚغری قسەی خوٚی دەگوت: بوٚ وێنە جارێك لە ماڵەکەی ماموٚستا لە تاران بووین و کیانوری و عەموویی و شەهید کاك ڕەزا شەلتوکی هاتبوونەوێ باسی بارودوٚخی کوردستان دەکرا. ماموٚستا قزڵجی کە بە هوٚی ئێکزیما هەمیشە خەریکی خوراندنی پشتی دەستی بوو، لەسەرخوٚ گوتی:

هاوڕێ کیانوری توٚش بەم خەتی ئیمامەت سەرمان بە فەتەرات دەدەی.

کیانوری هەڵبەزییەوە بەڵام بە حورمەتەوە گوتی:

–بەڵی ماموٚستا؟

ماموٚستا گوتی (بە فارسییەکی زوٚر کوردانە): ئاخیر قوربان موللا و اینقیلابی (مەلا و شوٚڕشگێڕ!)

جارێك خەریکی وەرگێڕانی بەیانێکی کوٚمیتەی ناوەندی بە کوردی بوو کە لەودا نووسرابوو "باند قاسملو" (تاقمی قاسملو)، ڕووی لە کاك ڕەزا شەڵتوکی کرد و بە بزەوە گوتی:

–ئەرێ کاکە ڕەزا تاقمی چەند میلیونیشمان هەیە؟

شەهید شەڵتوکی گوتی:

–لەبەر چی ئەو پرسیارە دەکەی؟

ماموٚستا گوتی:

–ئاخر چەند میلیون کەس لەگەڵ قاسملویە و ئێمەش دەڵێین "تاقم"ی قاسملو. بابە تاقم بە چەند کەس دەگوترێ نەك بە چەند میلیوٚن!

بە پێچەوانەی ئەوانەی کە لە وڵاتانی سوسیالیستیڕا گەڕابوونەوە و لە بەهەشتی بەرینیان بوٚ خەڵك دەگێڕاوە. ماموٚستا هەم باسی لانی باشی دەکرد و هەم خراپ. زوٚر جار دەیگێڕاوە کە چوٚن لە باکوٚ فلاَن کەس ڕێشوەتی داوە و لە بوڵغاریا.. کێ بە دیاریەك و بەرتیلێکی بچوك کارێکی جێبەجێ کردووە و یان فلاَن و فیسار بە چەند دوٚلار و ویسکییەك کارنامەی زانکوٚیان وەرگرتووە. لە هەمان کاتدا باسی کرێ خانووی مفت و کارەبای مفت و کار بوٚ هەموانیشی دەکرد. هەموو ئەمانە پیشاندەری ڕوانگەیەکی ڕاستبینانە و سروشتێکی ڕاستبێژانە بوو کە هەیبوو و ئەویان لە کەسانی زانای تر بەرچاوتر دەکرد.

ماموٚستا مەلا حەسەنی قزڵجی نە وەدوای ژیانی ڕواڵەتی کەوت و نە وەدوای پارە دەرهێنان کەوت و نە پلە و پایە. ئەو ئەویندداری نیشتمان و هوٚگری ڕزگاری چینی چەوساوە بوو. ئەو گیروٚدەی ئەدەبیات و نووسین بوو و عاشقی پەرەگرتنی زمانی کوردی بوو. لەم ڕێگەیەشدا و هەر بەم تاوانەش لە ئەشکەنجەگادا شەهید کرا دەنا جەللادەکانیش باشیان دەزانی کە هیچ نهێنییەکی ڕێکخراوەیی بەلای ئەوەوە نییە.. دەشیانزانی کە بە 72 ساڵ تەمەنەوە توانای مانەوەی بەر ئەشکەنجەی نییە. بەڵام خامەکەی و بیری تیژی کوٚمەڵایەتییەکەی و بە کوردی نووسینەکەی بوٚ کوشتنی ئەو بەس بوو.

یادی بە خێر و ڕەوانی شاد بێ!

*سەرچاوە: گوٚڤاری "هاوار"، سوید، ژ 9، 2000، ل 33–37.

**هەندێ بەش لە کۆمەڵە چیرۆکی**

# پێکەنینی گەدا

**پێشەکی بە قەڵەمی**
**مامۆستا هێمن**



**سەرەتا**

شەو درەنگانە، بێدەنگییەکی بەسام ژووره ساردوسڕ و چۆڵوهۆڵ و نیوە تاریکەکەی داگرتووم. لە خوێندنەوەی ئەم چیرۆکانە بوومەوە. لە حاڵێکدا کە کارێکی زۆریان کردۆتە سەر مێشك و دەمارم و وردە فرمێسکیان پێ هەڵوەراندووم، بە ئەسپایی دەفتەرەکەم دادەنێم، ئەسرینەکانم دەسترِمەوە، چراکە دەکوژێنمەوە، لە جێگاکەم دەخزێم و چاو لێك دەنێم، بەڵکو بتوانم سەرخەوێك بشکێنم و خەم و پەژارەم بڕەوێنم.

کەچی خەیاڵ هەڵم دەگرێ، دەمبا.. دەمبا.. دەوەناو دەوەن، ڕەوەزا و ڕەوەز، بەسەر بەفر بە سەری کوێستانانداِ، بەناو دارستان و لێڕە چڕو پڕەکاندا، بە نواڵە زەنوێر و بژوێنەکاندا، بە پێدەشت و گۆڕ و نەرمانەکاندا، بە بەستێنی چۆمی (تەتەهوو)دا، بۆ شارە خونچیلانەکەی مامۆستا، بۆ (بۆکان)، بۆ بووکی شارەکانی کوردستان، بۆ کانگای ئەوین و دڵداری، بۆ مەکۆی خەبات و فیداکاری، بۆ بەرسەرای سەرداری شەهید، بۆ سەر حەوز و کانییە جوان و بەناوبانگەکەی، بۆ تەماشای بەژن و بالا و خاڵ و میل و چاوو برۆ و کەزی و ئەگریجە و پووز و بەلەك و سەر و شەدە و شان و دەسماڵ و قەد و پشتێنی کیژە بۆکانییان، کە دەستە دەستە و پۆل پۆل، وەك مێگەلی مامز و ئاسك، بە لەنجەولار و تاسکەتاسك دێنە سەر حەوز، گۆزە سوور و نەخشاوەکانیان بەناز لە ئاو هەڵدەدەن و، وێنەیان لە ئاوێنەی ڕوون و بێگەردی حەوزەکەدا جیلوەیەکی ئاسمانیی هەیە کە فریشتە و پەری وەبیر دێنێتەوە و، شعوور و زەوق مشتوماڵ دەکا و هەست و خەیاڵ دەبزوێنێ.

گویێم لە دەنگی ئەو منداڵە ڕەزا سووك و بزۆز و ڕووتەڵە هەڵوافرۆشانە دەبێ، کە تەبەکی هەڵوا دەگێڕن و بە هەوایەکی خۆش پێی هەڵدەڵێن و هاوار دەکەن:

هەڵوای تەن تەنانی

هەتا نەیخۆی نایزانی

لە جێگاکەمدا ئەمدیو و ئەودیو دەکەم، بە ناهومێدییەوە هەناسەیەك هەڵدەکێشم و لەبەر خۆمەوە دەڵێم خۆزگە و هەزار خۆزگە منیش وا پیر و کەنەفت و شەکەت و کەلەلا نەدەبووم، ئەوەندەم هێز و گوڕ و تین و توانا دەما تا پڕ بە ئامێزم لەو چیرۆکانە هەڵگرتبا و بە هەموو شار و دێ و کووچە و کۆڵان و بازێڕی کوردستاندا گەڕابام و یەك بە خۆم هاوارم کردبا: خەڵکینە! ئەگەر شتێ لە هەڵوای تەن تەنانی شیرینتر و لە گوڵاڵەی نواڵان بە بۆن و بەرامەترتان دەوێ وەرن وەرن بخوێننەوە، بخوێننەوە تا ئاهی خۆشتان لە دڵ و دەروون بگەڕێ. بخوێننەوە تا تامەزرۆییتان بشکێ. بخوێننەوە تا کوڵ و کۆتان دامرکێ. بخوێننەوە تا کۆمەڵەکەتان بناسن و لە دەرد و ئازار بگەن. بخوێننەوە تا پتر شاییتان بە زمانەکەتان بێ. تا نەیخوێننەوە، نازانن قەڵەمی سیحراویی مامۆستا قزڵجی چ شوێنەوارێکی بەنرخ و بێ وێنەی خوڵقاندووە. بیری ورد و خەیاڵی بڵیند و هەستی ناسکی ئەم نووسەرە بلیمەتە چ نموونەیەکی ئەدەبی بەرزی داڕشتووە و پەنجەی بەهێز و ڕەنگینی ئەم هونەرمەندە گەورە لیزگەیەکی چۆنی لە دوڕو مرواری و گەوهەری نایاب بۆ هۆنیونەوە.

لەموکریان باوە دەڵێن: "بنەماڵەی قزڵجی وەك بێچووە مراوی وان هەر لە هێلکە هاتنەدەر مەلەوانن". مەبەستیان ئەوەیە ئەوی لەو بنەماڵە بێ، هەر لە منداڵییەوە زانا و پیتۆڵە. بە ڕاستیش ئەو بنەماڵە بەڕێزە گەلێك پیاوی بلیمەت و زانای لێهەڵکەوتووە کە بێئەوەی بۆ خۆیان ویستبیان ناوبانگی زانست و هونەرییان لە دنیادا بڵاوبۆتەوە.



مامۆستا حەسەنی قزڵجی ڕۆڵەیەکی هەڵکەوتووی ئەو بنەماڵە گەورەیە، کە مایەی شانازیی نەتەوەکەمانە. ئەو ڕێبازی باوك و باپیرەکانی نەگرت و ڕێگایەکی تری هەڵبژارد و، لە باتیی خزمەتی ئاین کە ڕێگای باوك و باپیرەکانی بوو، خزمەتی ئەدەبی وەئەستۆی خۆی گرت، ئەویش چ ئەدەبێك؟ ئەدەبێکی بەرزی کۆمەڵایەتی.

یەکێك لە سیاسەتە شوومەکانی ڕەزاخانی پەهلەوی لە ماوەی دەسەڵاتی ڕەشی فاشیستی خۆیدا، هەوڵی بێوچان و بێڕەحمانە بوو بۆ تواندنەوەی گەلی کورد لە کوردستانی ئێراندا. بۆ جێبەجێکردنی ئەو مەبەستە شەیتانییە، داب و شوێن و جلوبەرگ و زمان و ئەدەب و مۆسیقا و سەمای کوردیی بە توندی قەدەغە کردبوو.

بەڵام بەو هەموو هێزە شەیتانییەوە نەك هەر کوردی کۆڵنەدەری بۆ نەبەزی و دەڕۆستی نەهات، بەڵکو ئەو سیاسەتە و زەبروزەنگی پۆلیسی ڕەزاخان بوو بە هۆی ڕاپەڕینێکی بەرینی فیکری لە کوردستاندا.

هەزاران پێچ و پشتێن و ڕانك و چۆغە و پەستەی پیاوی کورد و شەدە و هەوری و دەسماڵ و کۆڵوانەی ژنی کورد دڕاو سووتا، بەڵام جلوبەرگی کوردی وەك سوننەتێکی میللی هەر ماوە.

لە قوتابخانە و ئیدارە، تەنانەت لە کوچە و خەیابان هەزاران کورد بە تاوانی کوردی گوتن گیران و ئازار دران و سووکایەتییان پێکرا، بەڵام زمانی کوردی وەك سەرمایەی نەتەوایەتیمان هەر پارێزرا، کورد نەتواوە و ئابڕووتکاوی و ڕیسوایی مێژوو بۆ پۆلیسی ڕەزاخان مایەوە.

لەو سەردەمە تاریك و تنووك و ئەنگوستە لە چاوەدا، لە مەڵبەندی موکریان بۆ بەربەرەکانیٚ دەگەڵ سیاسەتی تواندنەوەی کورد، کۆمەڵێکی نهێنی لە زانایان و ڕووناکبیران و گەورەپیاوانی کورد بە ڕابەری مامۆستا مەلا ئەحمەدی فەوزی، سەیفی قازی، پێشەوای نەمر، قازیی بۆکان، شێخ ئەحمەدی سرێلائاوا و گەلێکی تر لە ڕووناکبیرانی ئەو سەردەمە پێکهاتبوو کە ئامانجی ئەساسی و هەرە گەورەیان پاراستن و پەرەپێدانی زمان و ئەدەبی کوردی بوو. کتێب و ڕۆژنامەی کوردی کە لە عێراق بڵاودەبوونەوە، بە زەحمەت پەیدایان دەکرد و بە ئیحتیاتەوە بەسەر لاوانی بڕواپێکراودا بڵاویان دەکردنەوە، تا فێری کوردی خوێندنەوە بن. ئەوان، بە تایبەتی مامۆستا فەوزی، دەستەیەك لاوی ڕووناکبیریان پێگەیاند کە لە دواڕۆژدا شاعیر و نووسەری زۆر خزمەتکار و بەناوبانگیان لیٚ هەڵکەوت. یەکێك لە دەست پەروەردەکانی فەوزی و هاوبیرەکانی، کاك حەسەنی قزڵجی خۆمانە کە هەر لەو دەمەی ڕا فێری کوردی خوێندنەوە ببوو. ئەوە بوو دەگەڵ سایەی شوومی پەهلەوی لاچوو و تەمومژی نەگبەت و چارەڕەشی کورد ڕەوی، وەك ئەستێرەیەکی گەشی ڕووناك و پرشنگدار لە ئاسمانی ئەدەبی کوردیدا درەوشایەوە و لاپەڕی گۆوار و ڕۆژنامەکانی کوردی بە نووسراوە جوانەکانی ڕازاندەوە.

لە زەمانی کۆماری دیموکراتی کوردستاندا مامۆستا قزڵجی بێئەوەی سینگ ڕەپێش خاو خۆ ڕانیٚ، یەکێك لە خۆشەویستترین و نێزیکترین دۆستانی پێشەوا قازی محەمەدی ئەدەب دۆست و هونەرپەروەر بوو. بێجگە لەوەی لە ڕۆژنامەی (کوردستان) ئۆرگانی حیزبدا دەینووسی، سەرنووسەری گۆوارە جوانەکەی (هەڵاڵە)ش بوو.

پێشەوا لە ئاخرین ڕۆژانی دەسەڵاتیدا خەریك بوو مامۆستا قزڵجی و چەند شاعیر و نووسەری لاو و تازە پێگەیشتوو بنێرێتە دەرەوە تا بە قەولی خۆی چاو و گوێیان بکرێتەوە و شتی تازە فێربن. بەڵام بە داخەوە نەگەیشت و ئەم ئاواتەشی وەك زۆر لە ئاواتە پیرۆزەکانی نەهاتەدی. وەك ئێستا لە بیرمە و تا گڵەبانی چاوم دەکەن لە بیرم ناچێتەوە، ڕۆژێکی سارد و سەهۆڵبەندانی مەهاباد بوو، زریانێکی ساردی دەهات و کەڕەسیسەی دەکرد. خۆم کووزوو کردبوو و بە پەلە دەڕۆیشتم جێگایەکی گەرموگوڕ ببینمەوە. تەماشام کرد پێشەوا لەبەر بێلاکەی هاتوچوو دەکا و ڕۆژنامەی کوردستانی بە دەستەوەیە و یەکێك لە نووسەرانی ڕۆژنامەکەی لەلایە. خەریك بوو فیزماڵکی دەمیٚ و خۆم ببوێرم. دیتمی و بانگی کردم. هێشتا دوور بووم فەرمووی: دیوتە ئەو قزڵجییە چۆنی نووسیوە؟

زانیم مەبەستی ئەو پارچە ئەدەبییە جوانەی قزڵجییە کە لەو ژمارەدا چاپ کراوە. گوتم": بەڵیٚ دیومە و بە ڕاستی چاکی نووسیوە. کاکی نووسەر هەڵیدایە و گوتی: بەڵیٚ چاك دەنووسیٚ، بەڵام کەم دەنووسیٚ.

پێشەوا بزێکی هاتیٚ. سەری ڕاوەشاند و ئەم دوو شیعرەی (سەعدی)ی خوێندەوە:

خاك مغرب شنیدەام کە کنند
بە چهل سال کاسەء چینی
صد بە روزی کنند در بغداد
لاجرم قیمتش همی بینی

کە خوالێخۆشبوو (مەلا مستەفای سەفوەتی) ئاوای کردوە بە کوردی:

بیستوومە کەوا لە ڕۆژهەڵاتا
بە چل ساڵ ئەیکەن یەك کاسەی چینی
لە (مەردەشت) ئەکەن سەدی بە ڕۆژیٚ
بۆیە قیمەتی وایە ئەیبینی

دیسان ڕووی لە من کرد و فەرمووی: بریا زۆری وامان هەبان و پێش ئەوەی من جوابی دەمەوە بۆ خۆی گوتی: ئەگەر بۆ خۆمان بین زۆری وامان لیٚ هەڵدەکەون.

داخی گرانم زۆر زوو هێلانەکەمان لیٚ شێوا و سایەی ئەو پیاوە نیشمانپەروەر و ئەدەبدۆست و هونەرپەروەر و قەدرزانەمان لەسەر وەلاکەوت. قزڵجیش وەك زۆر لەشاعیر و نووسەرەکانی کورد

بێئەنواو بێداشدار و دڵسۆز مایەوە و لەدەست زوڵم و زۆری ڕێژێم ئاوارە و پەڕیوەی هەندەران بوو.

هەر بۆ خۆی دەزانێ لەو ماوە دوور و درێژەی لێقەومان و دەربەدەریدا چەند تاڵ و سوێریی ژیانی چێشتووە. چەندی سەرما و گەرمای دنیا دیوە. چەندی پەند و گوڵمەز بەسەرهاتووە. چەند گیراوە و ئازاردراوە و ئەمدیو ئەودیوی پێکراوە و بۆ پەیداکردنی پاروە نانێکی بێمنەت ناچار بووە بەو دەستەوستانیی خۆیەوە، کاری چەند سەخت و گرانی بەدەمی بکا و سەر بۆ ناکەسان شۆڕ نەکاتەوە.

مامۆستا لە کۆڕی خەباتدا قاڵ بووە، خاراوە و، لە گڵ هاتۆتە دەرێ. لەو هەموو کوێرەوەری و دەربەدەری و چەرمەسەرییە شت فێربووە. زانستی بەرەو ژوورتر چووە، تەجرەبەی وەسەریەك ناوە، کۆمەڵی خۆی باشتر ناسیوە. هەستی بە ئێش و ئازاری کردووە و دەرمانی بۆ دۆزیوەتەوە و بۆتە فەیلەسووفێکی پسپۆڕ و نووسەرێکی ڕیئالیست و واقیعبین.

پاڵەوانی چیرۆکەکانی قزڵجی هیچ کامیان بۆ خوێنەرێکی کورد نەناسیاو نین، هەموویانی لە چین و توێژەکانی کۆمەڵی کوردەواری هەڵبژاردووە، کارەساتی ژیانی وانی بە کوردییەکی ساکار بەو زمانەی هەموو کوردێکی نەخوێندەوار و ساویلکەی لێ حاڵی بێ، شی کردۆتەوە. خوێنەری ورد تێدەگا مامۆستا قزڵجی تا چ ڕادەیەك شارەزای زانستی ڕەوان شناسییە و چۆنی ڕۆحی پاڵەوانەکانی ناسیوە و چۆتە ناخی هەناو و دەروونیانەوە.

مامۆستا قزڵجی کۆمەڵی کوردەواریی لە هەموو کەس چاکتر ناسیوە. خوێنەر لەم چەند چیرۆکە کورتەدا نموونەی ژیانی دەرەبەگێکی چەکمەڕەق، کۆنە بەگێکی بارگین تۆپیو، شێخێکی دەستبڕ، دەروێشێکی زەرگ وەشێن، جووتیارێکی زۆرلێکراو، باب نۆکەرێکی زمان لووس، کاربەدەستێکی بەرتیل خۆری بێگانە، تاجرێکی سووت خۆر و تەماعکار، جاسووسێکی نیشتمان فرۆش، تەنانەت ژنێکی چارەڕەش و بێبەشی کورد، دەبینێ.

خوێنەر پاش خوێندنەوەی زوربەی چیرۆکەکان پێکەنین دەیگرێ، بەڵام چ پێکەنینێك؟ پێکەنینێکی تاڵتر لە کەکرە.

ئەوەی بۆ کوردێکی دڵسۆز جێی داخ و خەفەتە ئەوەیە کە زیاتر ڕووداوەکانی ناوەڕۆکی ئەم چیرۆکانە دەگەڕێنەوە بۆ سی ساڵ لەوەی پێش. کەچی دەبینی ئێستاش ئاڵوگۆڕێکی ئەوتۆ لە وەزعی کۆمەڵایەتی کورددا ڕووی نەداوە کە ئەم چیرۆکانە تازەیی خۆیان لەدەست بدەن.

ئێستاش جوتیار بە چەشنێکی نوێ دەچەوسێنرێتەوە و لەبەر زۆریی ئیجارە و قیست و سووروسات دەست لە زەویوزاری خۆی هەڵدەگرێ و ڕوو لە شاران دەکا. ئێستاش توونی حەمام پڕن لە هەژارە بێجێ و ڕێیەکان. ئێستاش بازرگانی سووت خۆر و ساختەباز، شێخی کۆنەپەرست و دەستبڕ، دەروێشی فریودراوی زەرگ وەشێن لە کوردستاندا کەم نین.

ئێستاش دایك و بابی کورد بۆ چارەی دەردی منداڵە نەخۆشەکانیان دەست و دامێنی ئامینەخانی نووشتەنووس دەبن و زۆر ئامینەخانی بێبەش و چارەڕەش ماون کە لەبەر وەزعی نالەباری کۆمەڵایەتی، هەوەس ناچاریان دەکا بە فێڵ ڕەشد فێرکەن نووشتەیان دەکۆشی باوێ.

ئێستاش سەرکار ڕەزایی پاسگاکانی کوردستان لە جەنابی سەرهەنگ بە ئیجارە دەگرێ و بۆ ئە ستاندنی بەرتیل و سازکردنی پەڵپ و بیانوو حوسێن قولیی هەر بەدەستەوەیە.

خوێنەرانی بەڕێز! من لەو سەرەتا کورتەدا ناتوانم مامۆستا قزڵجی بە ئێوە بناسێنم. خۆتان کتێبەکەی بە سەرنجەوە بخوێننەوە تائەم نووسەرە هەڵکەوتووە بناسن و لەبیری بەرزی بەهرە وەرگرن.

با تێکڕا فەرمایشەکەی پێشەوای نەمرمان دووپاتە بکەینەوە و بڵێین: "بریا زۆریوامان هەبان".

## چیرۆکەکان

### پێکەنینی گەدا

لە بەربەڕۆچکێك هەڵترووشکابوو، چیلکەیەکی بە دەستەوە بوو لە خۆڵەکەی بەردەمی دەوەژاند. بەیانیی ڕۆژێکی دوامین مانگی پاییز بوو. خۆڵەکە بە زوقمی شەو تەڕ ببوو. جێگای چیلکەکەی بە ڕوونی لێدیاربوو. بە درێژایی دوو بست خەتی ڕاستی لەپاڵ یەکتردا کێشابوو. لەولاشەوە جەغزێکی خاڵی و بەتاڵی کێشا.

ئەمانە نموونەی ئەوە بوون کە بە دڵیدا دەهات. بیری بەلای شتێکی دیکەوە بوو. هیچ ئامادەی ئەوە نەبوو کە سەرنج بدات تەبەقی زێڕینی ڕۆژ لەو بەرەوە لە کام کەژ و چیاوە سەری لە کەل دەرهێناوە بە پرشنگی خۆی گوندی (تەپەڕەش) زێڕەوشان دەکات. ئە وەی کە لەو کاتەدا مەبەستی ئەو بوو تینی خۆرەکە بوو کە تەزووی سەرمای شەو لە لەشی دەرکا و نەختێ گەرمی کاتەوە.

ئەگەر لەو وەختەدا سەری بەرزکردایەتەوە لە بەرانبەری خۆی بیڕوانیایەتە تەبەقی ڕۆژ، ڕەنگ بوو لە کولێرەیەکی گەنمەشامیی داغ بەولاوە هیچی تری بە خەیاڵدا نەهاتایە. "بێ کراس گەزەجاو بە خەو دەبینێ". کابرای نەخۆش و برسیش کە چاوی تراویلکە دەکا، دوور نییە ڕۆژی لێ ببێتە کولێرەی زەرد و زۆڵی گەرمە تەنووری گەنمەشامی.

لەشــی کــە تــا پــێش تاوهــەڵات سـڕ ببـوو، ورده ورده بـە تینـی خۆرەکە دەبووژاوه و خاو دەبۆوه. تومەس دەستە ڕەق و تەقەکانی ماندوو ببوون. ئیتر وازی لە چیلکە ئاژنینی خۆڵەکە هێنا، لەسەر زەوییە تەڕەکە دانیشت. بە هەردوو دەستی ئەژنۆکانی گرتە باوەش و سـەری بـەرداوه، تـا تـەوێڵی نیشـتە سـەر کەشـکەژنۆکانی. لـەو حاڵـەدا ئەگـەر پـان و پـۆڕ و مـل ئەسـتوور و ڕیـش شـانەکراو بوایـە، دەتگوت سۆفی بیارەیە "موراقیب" بووه.

نێزیکـەی سـەعاتێك بـەو جۆره مایـەوه. لـەوه دەچوو بـە گـەرمای خۆرەکـە خاوەبووبێتـەوه و خـەوی لێکـەوتبێ. بـەڵام لـە بزووتنـەوەی پەنجـەکان و سـەری، کـە ناوبـەناو دەیجوڵانـدن، وا دیـاربوو ماشـەری خەیاڵەکەی هەڵدەکات.

سـەری ماشـەرەکەی لـە چیلکە وەژاندنەکـەوه دەستپێکردبوو. بە خەتـەکانی کـە لـە پـاڵ یەکـدا کێشـابووی، بیری لـە شـێف و وەردی زەوییەکەی دەکردەوه. بە جەغزەکەش جێ خەرمانەکەی نیشان دەدا کـە ئێسـتا و ئێسـتاش شـەنە و کـەو و بێـژینگی بـە خۆیـەوه نـەدی. چونکە ئـەو ساڵە شـارەزوور نـەهاتی بوو، سن و کوللە هیچیان بۆ نەهێشتبۆوه و تـا بیری لێبکاتـەوه، بـەڵام دەرد و مەینـەتی ئەوەنـده زۆر بوو نەیاندەهێشت مێشکی وچان بدات و تاوێك بحەسێتەوه. لە هـەموو لایەکـەوه گـەمارۆیان دابـوو، یـەك لـە دوای یـەك تارمـاییی خۆیـان نیشـاندەدا. دەهاتـەوه بەرچـاوی چـۆن خـۆی و ژنەکـەی تووشـی سـێبەڕۆ بـوون و سـێ مـانگی ڕەبـەق کـەوتن. چـۆن حـاجی ڕەشـید لــە سـلێمانییەوه هـات جووتەگاکـەی لـە جیـاتیی سـەلەم بـرد و ڕۆیشت. چۆن منداڵەکەی هاوڵەی گرت و مــرد. چــۆن ژنەکــەی لــە خەفــەتی منداڵەکـەیان و لـە برسـانا بـە دەم سێبەڕۆ وه گیانی دەرچوو، یاسینی فریانەکەوت. بە ئاسانی هەست بەوه دەکرا کە بیر لـەم نەگبـەت و نەهاتییانــە دەکاتــەوه، بــەڵام دژوار بـــوو بزانـــرێ داخـــوا هـــەودای وتوێژەکـەی دەپسـێ، یـان هـەڵی دەکـا تـا دەیگەیەنێتە جێگایەکی وا بڕیارێك بدات.

کوتـوپڕ بـە شـێنەیی سـەری هـەڵێنا، دەتگوت ملی وەکو فەنەرێکی ڕەواوه وایە و توانای ئەوەی تێدا نەماوه سەرەکەی بۆ بەرزکاتـەوه. ورده ورده سـەری هـەڵێنا تـا لەسـەر ئەسـتۆی ڕاسـت وێسـتا. ئـەمجار پەنجەکانی لەبەر یەك ترازاند و دەستی نا سەر زەوییەکە بەو نەختە هێزەی کە لە



دەستیدا مابۆوه یارمەتی قاچەکانی دا، هەموو جمگەکانی کەوتنە قرچەقرچ تا ڕاستەوه بوو. بەلارەلارەوه چووه ماڵەوه. لە شتومەکی ناوماڵ تاقە لێفەیەکی مابۆوه، دوو بەرکۆژەی بە بەن لێنابوو ڕۆژانی باران و سەرما دەیدا بە شانیدا و بەرکۆژەکانی گرێ دەدا.

لێفەکەی دا بە شانیدا، گاڵۆکەکەی بە دەستەوه گرت و کەوتەڕێ. کەس نەیدەزانی تا کوێ بڕدەکات و دەیەوێ بچێتە کوێ، بەڵام وا دیاربوو ورەی بەرنەداوه، هێشتا دڵی لەدەست و قاچی بەهێزتره. ڕۆیشت و ڕۆیشت تا دوای ماوەیەك لەچاو ون بوو.

پـاش چـەند ڕۆژ (حەمـەڕەش) لـە هەڵەبجـە سـەری هەڵـدا. بـەم حاڵەوه دەچووه ناوبازاڕ داوای کاری دەکرد، بەڵام کاری چی؟ خەڵك کرێکاری دەویست کە هەر لە بەیانییەوه تا ڕۆژئاوا پشوو نەدا و وەکو خولخولـە هـەڵخولێ. گـەلێ لەوانـەی بـۆ کرێکـار دەگـەڕان، کـە حەمـەڕەش داوای کـاری دەکـرد سـەریان ڕادەوەشـاند و دەڕۆیشـتن، لەبەرخۆیانـەوه دەیـانگوت: کرێکـاری چـاکی! نـۆرەی ئەوەیـە لـە کارەکەمدا بمری، کن و دفنی تۆشم بە ڕیشەوه بێ!

بە ڕێکەوت هیی واشیان بوو ئانایەکی دەدایە و دەیگوت: باوکم تۆ ناتوانی کار بکەی، ئەوه بده بە کولێرەیەك و وازبێنە. حەمەڕەش بـە درێـژایی ژیـانی کـوڕی نـاو مـەزراو شـیناوەرد بـوو، بـە شـان و باهووی خۆی ژیابوو، ئەو گەوزەی ئەو لە درەودا دەیوەشاند کەم پاڵـە هـەبوو بیوەشـێنێ. ئێسـتا کـە تووشـی ڕۆژێکـــی ئـــاوا ڕەش هـــاتبوو وای وەڵام بدەنــەوه، کــزه لــە جەرگییــەوه دەهــات. ئانــەکانی وەرنــەدەگرت و هــەموو جــارێ دەیگوت: لالۆ! من گەدایی ناکەم، داوای کار دەکـەم. بـەڵام ئـاگری برسـیەتی کـە بڵێسـەی سەند، ئازا و خوێڕی وەکو یەك دەسووتێنێ. کە زانیی کەس بە کرێی ناگرێ، ناچار چەند ئانایەکی وەرگرت و دوو سێ کولێرەی کڕی.

لــە بــن دیوارێــك دانیشــت. برسـیایەتی ئەوەنده زۆری بۆ هێنابوو تا بڵێی یەك و دوو کولێرەکانی ماشتەوه. پشوویەکی داو لەبەر خۆیـەوه گـوتی: وا باشـە جێگایـەك بدۆزمـەوه شەو تێیدا بحەوێمەوه، ئەگینا بەم سەرمای دەمـەو زسـتانە لـە کۆڵانـان و لـە بـن دیـواران ڕەق دەبمـەوه. هەسـتا، بێئـەوەی بزانـێ بـۆ کـوێ دەچـێ، لـەو کۆڵانـەوه ڕۆیشـت بـۆ کۆڵانێکی دیکە، هێندێك بەوێدا گەڕا و ڕووی کـردە کـۆڵانی سـێهەم، لـەوێ تەماشـای کـرد دووکـەڵێکی ئەسـتوور بــە هــەوادا دەچــێ. گـــوتی: هەرچـــییەك بـــێ ئـــەوه ئـــاگرێکی

گەورەیـە، وا چـاکە بچـم شـەو لـە پەنایـدا بحاوێمـەوە. وەکـو شـوێن گەڕێکی چاك شوێنی دووکەڵی هەڵگرت تا دۆزییـەوە. دووکەڵەکە لـە کونێکی ڕەشی گەورەی وەکو ئەشکەوت دەهاتە دەرێ، خۆی کرد بە کونەکـەدا. لـەناو چڕە دووکەڵدا تارمایی کابرایـەکی دی پەیتاپـەیتا ئاگرەکەی خۆش دەکرد، سڵاو و ماندوونەبوونی لیٚ کردو پرسی:

–لالۆ ئەم ئاگرە چییە وا بێوچان هەر خۆشی دەکەی؟

ئاگر خۆشـکەر گـوتی: براکـەم ئەمـە تـوونی حەمامـە. کـاری مـن ئەوەیە ئەم توونە تاودەم.

حەمەڕەش: لالۆ وەرە پیاوەتی بکـە لـە ڕێـی خـوادا جێم بکـەرەوە شەو لێرەدا بحاوێمەوە، با لە سەرمانا ڕەق نەبمەوە.

توونچـی: برالـە تـوونی حـەمام پاڕانـەوەی بۆچـیە؟ وەرە هـۆ لـەو قوژبنە پاڵ کەوە.

حەمەڕەش لەگەڵ توونچی ڕێك کەوت، شـەوانە یارمـەتی توونچـی دەدا تا تاویٚ بخەوێت و نـەختیٚ بحەسێتەوە. بە ڕۆژیـش دەڕۆیشت لەناو بازاڕ بوایـە، لـە کۆڵانـان بوایـە، چـەند نـانێکی گـەدایی دەکـرد و دەهاتـەوە. مەبەسـتی ئـەوە بـوو هەرچـۆنێك بـیٚ بگاتـە بـەهار، ئـیتر بچـێتەوە دێهـات شـوانی و گـاوانی بـیٚ، ڕەنجبـەری و سـەپانی بـیٚ، هەرچییەك بیٚ، ملی کارێك بگریٚ و لە تەنگانە دەرچیٚ.

ڕۆژێك زۆر تۆف بوو، بە باوە کڕیـوەی دەکـرد، کـەس نەیـدەتوانی ماڵەوماڵ بکا، حەمەڕەش تا چێشتانیٚ سەبری کرد بەشکەم نـەختیٚ هـەوا خـۆش بـیٚ، بـەڵام گڤـەگڤی با تـا دەهـات توندتر دەبـوو. کولـوە بـەفری گێـژ و خـول دەدا و دەکـرد بـە کـونی توونەکـەدا، دەتگـو لـە عاسمان هەرەوەزیان کردووە و بەفر هەلاجی دەکەن.

حەمـــەڕەش گـــوتی: ئـــەمڕۆ ناگەمـــە نـــاو بـــازاڕ، ماڵەوماڵیشـــم پێنـاکریٚ. وا چـاکە ڕووبکەمـە ماڵـە دەوڵەمەنـدێك داوای دوو نـان بکـەم. هەرچـۆنێك بـیٚ ئەمڕۆکـەی پـیٚ بەرمـە سـەر، تـا بـەیانی خـوا کەریمـە. لێفـە شـڕەکەی بـە شـانیدا دا، دەسـتی دا گاڵۆکەکـەی و لەقەلـەق کەوتـەڕیٚ. ئەوەنـدە بایەکـە ڕایدەوەشـاند بەفرەکـە بۆیـەی سـپی تێهەڵدەسـوو. فایـدەی نـەبوو، سـەرتاپا دەتگـوت لـە قـیرت هەڵکێشـاوە، ڕەشـاوی لیٚ دەچـۆڕا وە و بەدوایـدا خـەتێکی ڕەشـی لەسەر لاپەڕی بەفری سەر زەوییەکە دەکێشا، بەڵام لەو وەختـەدا کـیٚ هـەبوو ئەوەنـدە ورد بـیٚ ئـەم خەتـە بخوێنێتـەوە و بـە سـەرهاتی ئـەو تێبگا؟

لەولاوەی هێنـدیٚ خـانووی قوڕین و کشومات کۆشـکێکی تـەرز و بەرزی بەرچاو کـەوت لـەناو حەوشـەیەکی گـەورەدا لـە چـەند لاوە لـە بانەکانی دووکەڵ هەڵدەستا و لەگەڵ کڕێوە و ڕەشەبا شەڕی دەکـرد. وا دیـاربوو هۆدەکـان سـۆبەیان تـیٚ دادەئایسـا و گـەرمگوڕ بـوون. پەنجەرەکانی پـەردەی سپییان پێوە بوو، بەڵام دەبینـدرا بـەم چلەی زستانە گوڵیشیان لێیە. حەمەڕەش بیرێکی کردەوە و گوتی:

–بێژن لەو دنیا بەهەشت هەس، کەچی ئەمانـە هـەر ئیسـە وان لـە بەهەشتا.

ڕۆیشت تا گەیشتە بەر قاپیی حەوشەکە. دەرگاکە ئەوەندە سەوز و جـوان بـوو نـەیوێرا بـە دەسـت لێـی دا چـونکە دەسـتی ڕەش و دووکەڵاوی بوو، دەترسا قاپییەکە پیس کات و بەگژیدا بچن. ڕەانیـە دەوروبەری خۆی، دارێك، بـەردێك بدۆزێتـەوە پێـی لـە قاپییەکە بدا. بەفر هەموو شتێکی داپۆشیبوو، هیچی دەس نەکەوت. ئاخرییەکـەی چـەند مستـی لـە قاپییەکـە دا. دەسـتی کـە هـەر ئێسـقانی ڕووت بـوو تەقەی لە قاپی هەستاند، وەکو بـەدار لێـی دەی دەنگـی دایـەوە لـەناو حەوشەکە.

کابرایەکی سەر زلە، بە سەری ڕووت و باوەشیٚ قژەوە، کولێرەت لە لاملی ساوییایە چەوری دەکرد، سەری لـە پەنجەرەیـەك دەرهێنـا و نەڕاندی: سەعە ئەوە کێیە بەم بەیانییە لە قاپی دەدا؟

حەمەڕەش گوێی لە دەنگی کابرا بوو، لە دڵی خۆیـدا گـوتی: دەك کوچکت لیٚ واریٚ! بەیانی چی؟ ئەوا نیزیك نیمەڕۆس.

سەعە قاپییەکەی کردەوە، چاوی بە حەمەڕەش کەوت. لە وەڵامی کابرادا گوتی: بەگم، بێژم چی! داوەڵیٚ ڕەشە، وادیارە گەدایە.

حەمەڕەش گوتی: خێرومەند! خوا نەیبڕیٚ، فرە برسیمە، دو نـانم بدەنیٚ.

سـەعە قیژانـدی بەسـەریدا: بـڕۆ بـەڕێی خۆتـەوە، کـابرا! خـانم لـە ماڵ نییە، چۆتە حەمام.

حەمـەڕەش سـەرنجی بـەژن و بـاڵای سـەعەی دا، لێـوە چرچـەکانی تـا لای بنـاگوێی لێکترازان. ئەگـەر ئینسـانێکی سـاغ و تێـر و تەسـەل بوایە زوو دەزانرا خەریکە پێبکەنیٚ، بە دەنگێکی کوتوپڕەوە گوتی:

–کـوڕە، جـوان خاسـەکە، خاسـیان وتـووە "هەرکـەس گـوێز لـە هەمانەی خۆی ئەژمێریٚ". تۆ گوێت پێوە نەبوو، من داوای نانم کرد. خانمی چی؟ من برسیمە، شتێکم گەرەکە بیخۆم، شتێکم گەرەك نییە گەمەی لە تەکا بکەم!

## عادەتی بازاڕ

لـە بەغـدا کەلـە حەیدەرخانـەوە بـە جـادەی ڕەشـیددا، بـەرەو (بابشەرجی) دەڕۆیشتی، هـەوەڵێن مەیـدان نـاوی (سـاحەتولئەمین) بوو. لەو مەیدانەوە جادەیەکی کورت بە بەر خانی حاجی قەدووریـدا دەپەڕییەوە بۆ ئەوبەری دەجلە، بە ویشیان دەگوت (شاریعولئەمین).

پێش ئەوە بگەیتە خانی حـاجی قـەدووری، کۆڵانێك لـەو جـادەوە دەچووە بـازاڕی مسگەرەکان، ئـەو کۆڵانـە ئەوەنـدە تـەنگ بـوو ئەگـەر حەماڵ بە کۆڵە تووتنەوە پێیدا دەڕۆیشت ڕێگـە دەبڕا. هـەر ئەوەنـدە بـوو هـۆڕن لێنـەدەدرا و پۆلیسـی هاتوچـۆو نەوێستابوو، دەنـا دەبـوو بوێستی تا قەتاری حەماڵ تێدەپەڕیٚ.

ئەو حەمالانە فەردە تووتنەکانیان دەبردە خانی عەبدولقادر خەفاف، یا سەڕاف. بەهەرجۆر، تۆ نە حەماڵی نە تووتن کڕ. کابرا سەڕاف بێ یا خەفاف، بۆ تۆ فەرقی نییە. با ئێمەش وەکو حەماڵەکان پێی بڵێین عەبدولقادر ئەفەندی، تا لەم چەقی ڕێیەدا بەدەست ناوەکەیەوە گیر نەخۆین.

بەغدا وەکو پیوازی توێ توێ وایە، ئەوەی بە بەرچاوەوەیە توێی سەرەوەیە و شارەزابوونی ئاسانە،جادەیەو ئەم بەرو ئەوبەری مەغازەیە، لەسەر مەغازەکانەوە یانەی حەکیم و ددانساز و پارێزەر و شتی لەم بابەتەن. تابلۆیان لەسەر دەرگاکانیان، وەکو تەبکە بۆ مشتەری ناوەتەوە. هەرکامێك لەوانەش گلۆڵەیەك ڕاز و نهێنی خۆی هەیە. ئەمە ڕواڵەتی بەغدا یا توێکڵی سەرەوەی ئەو پیوازەیە. ئەگەر بتوانی بە نێوان ئەو توێکڵانەدا خۆ بگەیەنیتە ناوەڕۆکەکەی، شتی زۆر سەیر دەبینی. دوور نییە ئاخرەکەی ڕێت بکەوێتە خەزێنەکەی (عەلی بابا).

ناوەڕۆکی ئەو پیوازەش ڕواڵەتێکی هەیە کە ناوی بازاڕە. بازاڕ هەمووی سیپە و حەشارە بە تەنیشت یەکەوە. لەهەر حەشارێکدا ڕاوکەرێك دەستی داوەتە چەکی نیوگەز، یا تەڵەی تەرازووی ناوەتەوە و خۆی مات داوە. نەچیر وەك لافاو لەم سەرەوە بە ساخی دێن و لەو سەرەوە کە دەردەچن، هیی وایان هەیە نیوگەز گیرفانی دڕیوە و هیی واشان هەیە کیسەکەی بە تەڵەوە بووە.

ئەمەش هێشتا شتێکی زۆر سەمەرە نییە. ناوبەناو لە نێوان ئەو سیپە و حەشارانەدا، درزێك، قەڵشتێك هەیە، ئەگەر خۆت باریك بکەیتەوە و بە درزێك لەو درزانەدا بڕۆی، دەگەییە شتی زۆر سەیرو سەمەرە کە پێیان دەڵێن: خان. مشکی سەر خەزێنە بەناوبانگە، دەڵێن مشك کونێکی پێچەڵپووچی، درێژی، تاریك هەڵدەکەنێ، ئاڵتوون دەدزێ و لە قوژبنێکی کونەکەیدا کۆی دەکاتەوە. شەوانە گاڵتەیان پێدەکا و کەیفی پێ دێ. ئەو خانانەش کونەمشکی سەرخەزێنەن.

خانی عەبدولقادر ئەفەندی یەکێ بوو لەو کونەمشکانە. قاپییەکەی بچووك بوو، حەماڵەکان فەردە تووتن، کەتیرە، مازوو، خوری و شتی وایان لە بەردەرگاکە دادەنا و دەیانهێنا ژوورەوە. لە قاپییەکەوە تا ژوورێ، دالانێکی دوو سێ میتری بوو. دەڵێین ژوور چونکە ناوێکی دیکە نییە پێی بڵێین. لەوە دەچوو ئەسڵەن حەوش بووبێت. کەی و، چ وەختێك سەری گیراوە؟ نازانین! ئێستا ئەوا لە قاتی دووهەم بانێکی قایمی بەسەرەوەیە و ئەم حەوشەی کردۆتە هۆڵ. لە حەواشەوە عەبدولقادر ئەفەندی سنوری موڵکی خۆی دیاری کردووە، تەنانەت هەتاویش بە خۆڕایی ناتوانێ ڕێی بکەوێتە ئەوێ.

لە سووچێکی ئەم هۆڵە قەپانێکی گەورە وەکو تەڵە نراوەتەوە. لەلای قاپییەکەوە جێگایەك هەیە. پێش ئەوە کە حەوشەکە بانی بخرێتە سەر، هەیوان بوە. ئیدارەی عەبدولقادر ئەفەندی لەوێیە. دوو قەنەفەی لێ دانراوە و مێزێکیان لە نێواندایە. وا دیارە ئەوانەش هاوتەمەنی خانەکەن. بەڵام شەربەی ئاو و پەرداخەکە، بێگومان لەو قەنەفانە گەنجترن. لە تەنیشت ئەو کۆنە هەیوانەوە، قاپییەکی قورس و قایم هەیە هەمیشە داخراوە و کلیلەکەی لە گیرفانی عەبدولقادر ئەفەندیدایە. ئەو قاپییە، وەکو (زاکیر)ی خانچی دەیگوت، دەچێتە (سەرداب) یانی ژێرخانێکی گەورە کە سێ سندووقی پۆڵای لێیە.

ڕۆژی هەوەڵ کە مانگی بە چوار دینار لای ئەفەندی دامەزرام، ئەرکی ڕۆژانەی منی دیاری کرد: مەخاریجی ڕۆژانەی ماڵەوە لەو دەفتەرە بنووسە. چەند فەردە تووتن دێ و چەندەش دەڕوا لەو دەفتەرە بینووسە. لە ژوورەکانی قاتی دووهەم لەگەڵ زاکیر گوونییەکان بژمێرن، تازە بە جیا و، کۆنەی ساغ بە جیا و، دڕاو بە جیا دانێن و لەو دەفتەرە بیاننووسە. ئیشەکانی تریش خۆم بە ڕۆژدا لێرەم پێت دەڵێم.

مەخاریجی ماڵەوە ڕۆژی هەوەڵ: ترێ 50 فلس، گۆشت 150 فلس، نان 60 فلس، تەماتە و سەوزی 30 فلس، جەریدە 10 فلس.

ڕۆژی دووهەم: شووتی 50 فلس، ئەوانی دیکە وەك خۆیان.

ڕۆژی سێهەم: لە جیاتی شووتی، کاڵەك.

ئاخری مانگ ئەفەندی گوتی: کوا دەفتەری ماڵەوە؟

–ئەوەتا.

–حیسابی هەموو ڕۆژێکت نووسیوە؟

–نەخێر، چی بنووسم؟ هەموو ڕۆژێ 300 فلسە. ئەوا ئێستا دەنووسم مەخاریجی ئەم مانگە 9 دینار.

–کاکە، ئەمە دەڵێی چی؟ گۆترە نییە. ئەمە تیجارەتە. (بە چپەوە) کچەکەشم لە ماڵەوە دەینووسێ.

سەری مانگ بەرامبەریان دەکا، بەڵکو زاکیر فڕوفێڵی کردبێ.

–ئەفەندی عەیبە. لە 300 فلس فڕوفێڵ چی دەکرێ.

–کاکە تۆ نیقاش مەکە. ئەمە تیجارەتە.

–باشە، ئەفەندی، باشە.

ڕۆژێك لەگەڵ زاکیر چەند سەعات گوونیمان جیادەکردەوە، گەروومان پڕبووبوو لە تەپوتۆز، لە تیوانا دەهاژاین، گوتم: زاکیر بچۆ دوو پیپسی کۆلا بکڕە با لە تینوانا نەخنکێین. زاکیر زۆری بەلاوە سەیر بوو، لە بیچمی وا دەرکەوت کە لە مێژووی ئەو خانەدا هەوەڵین جارە شتی وا دەبیسێ. گوتم: بۆچی واقت وڕماوە؟ ئەوە 32 فلس، ڕاکە زوو وەرەوە.

دانیشتبووین پیپسی کۆلامان دەخواردەوە، ئەفەندی پەیدابووم. بێئەوە سڵاو بکات، بە ڕوویەکی گرژەوە هات دانیشت. زاکیر پیپسی کۆلاکەی بەجێهێشت و چووە گیان گوونییەکان. خۆم بەوەوە شەکەت نەکرد ئەفەندی بۆچی ڕووگرژە. پیپسی کۆلای خۆم خواردەوە. بانگم کرد زاکیر وەرە پیپسی کۆلاکەت گەرم دەبێ،

ئەفەندی، دەمی وەك مەشکەی کۆن تەقی و نەڕاندی: کاکە، ئەمە خانە، گازینۆ نییە. تۆ خۆت کار ناکەی، خەریکی زاکیریشم لیٚ بەدعەمەل کەی؟ من خۆم پیپسی کۆلا ناخۆمەوە. ئیٚوە پارەتان لە کویٚ بوو پیپسی کۆلا دەخۆنەوە؟ کاسبی چۆن وا دەبیٚ؟

–ئەفەندی خۆ گوونییەکانمان نەگوشیوە پیپسی کۆلای لیٚ چۆڕابیٚتەوە. من بە پارەی خۆم کڕیومە. جگە لەوەش خۆمن حەماڵ نیم، کاتبم، ڕاستت پیٚ بڵیٚم، لەبەر تۆ نییە یارمەتی زاکیر دەدەم، بەزەییم بەودا دیٚتەوە.

–بەزەیی چی؟ زاکیر خانچییە، دەبیٚ کاری خۆی بکات. تۆ وا دیارە بە کاری بازاڕ نایەی. وا بزانم بۆنی (یەعیش و یەسقوت) لە میٚشکت دیٚ!

–نەوەڵڵا، ئەفەندی، من کابرایەکی کاسبم، لەو کوردستانەوە هاتووم، سەرم لەم بەزمانە دەرناچیٚ، ئەگەر ڕازی نی، دەڕۆم. ئەوەندەی بیرکەوتەوە کە شەش دینار لە کاتبەکەی پیٚشوو کەمتر بە من دەدا. خاوبۆوە و گوتی: باوکم، برام، تۆ غەریبی، دەمەویٚ فیٚری کاسبی ببی. عەقڵی خویٚندەواری لە سەرت دەرکە. ڕۆژی 32 فلس پیپسی کۆلا مانگی دەکاتە نیٚزیکەی دیناریٚك، کۆی کەرەوە، پاش چەند ساڵی تر بیکەرە دەسمایە و کاسبی پیٚوە بکە، بۆ خۆت دەبیە پیاو. ئیٚمەش هەر وامان کردووە.

تا ئەوکاتە تەواو بەوردی سەرنجی سەر و گویٚلاکی ئەفەندیم نەدابوو. بە ڕاستی مشکی سەرخەزیٚنەم بیرکەوتەوە.. سەریٚکی گرمۆڵە، دوو چاوی بچکۆلە و زیت، لووتیٚکی باریك، دەمیٚکی دریٚژ، پیٚستیٚکی وەك کۆنە مەشکە. لەسەر قەنەفەکە قوت ببۆوە و خیٚرا خیٚرا دەیڕوانییە من، دەیڕوانییە قەپانەکە، دەرگای ژیٚرخانەکە. جاروبار لە شووشەکانی پیپسی کۆلا مۆڕ دەبۆوە. تیٚگەیشتم کە شووشەکان وەك (مەرگەمووش) ئازاری دەدەن. هەڵم گرتن و چووم بۆ لای زاکیر، ئەوەندەی هەوڵم دا زاکیر پیپسی کۆلای نەخواردەوە، سپی هەڵگەڕابوو، خیٚرا خیٚرا گوونیی دەژمارد. گوتم کوڕە ئەوە بۆچی دەترسی، خۆ دنیا سەری بە پووش نەگیراوە؟ بە دەنگی بەرز تا ئەفەندی گویٚی لیٚ بیٚ، گوتی:

–ئەفەندی ڕاست دەکا. ئیٚمە کاسبین نابیٚ هەڵەخەرجی بکەین. لە پاشان بە چپە گوتی: ئەم کابرایە دەرم کا لە هیچ خانیٚك ڕام ناگرن، دەڵیٚن یا دەست پیسە، یا سەرسەرییە. کاریٚکی دیکەش نازانم، منداڵەکانم لە برسانا دەمرن.

تۆزیٚکی پیٚچوو ئەفەندی بانگی کرد وەرن. هاتینە خوارەوە. مام سەعدوون و چەند کەسی تر لە دهۆکەوە کەتیرەیان هیٚنابوو.

–کاکە تۆ بچۆ دانیشە، بییاننووسە. زاکیر وەرە بییانکیٚشە..

زاکیر فەردەی کەتیرەی دەخستە سەر قەپانەکە و ئەفەندی خۆی تەماشای دەکرد. بنووسە: 48 کیلۆ –40 کیلۆ– 32 کیلۆ– 46 کیلۆ. دوای قڕە و هەرایەکی زۆر نرخیان بڕی: کیلۆی بە 200 فلس.

–هەمووی بوو بە چەند کیلۆ؟

–166 کیلۆ.

–چوار جیٚگایە، 8 کیلۆی لیٚ فڕیٚدە.

مام سەعدوون: عەبدولقادر ئەفەندی چۆن 8 کیلۆ؟ ئەم کیسانە یەکی کیلۆیەکیش نابن.

–کاکە ئەمە عادەتی بازاڕە. ئیٚرە بەغدایە، بەغدا.

–6 کیلۆی تەپوتۆز و خاکوخۆڵ لیٚ فڕیٚدە.

مام سەعدوون: کوڕە پیاوی چاك بە، کەتیرە دەڵیٚی جەواهیٚراتە، تەپوتۆزی چی؟

–کاکە ئەمە دەڵیٚی چی؟ چەند جارت پیٚ بڵیٚم عادەتی بازاڕە؟

–بەڵیٚ، دەمیٚنیٚتەوە 152 کیلۆ.

–بیکە بە باتمان.

–دە باتمان و دوو کیلۆ.

–نا، نا، وانییە کەمتر دەکات.

–بۆچی وانییە؟ 152 کیلۆ، هەر باتمانی 15 کیلۆ، دەکاتە 10 باتمان و دوو کیلۆ، ئیتر چی؟ خۆ شتیٚکی ئەوەندە زۆر نییە.

–کاکە غەڵەتی، عادەتی بازاڕ 16ی بە 15یە.

–تیٚناگەم، 16 بە 15 یانی چیی؟

–دەزانم تیٚناگەی. تاوانی خۆمە تۆم ڕاگرتووە.

16 کیلۆ دەژمیٚرن و دەڵیٚن ئەمە 15، دایدەنیٚن بە باتمانیٚك.

هیٚندەم پیٚ سەیر بوو دام لە قاقای پیٚکەنین و گوتم: دەی جا با ئەمەش عادەتی بازاڕ بیٚ هەر 16 دیناری بۆ دەژمیٚرین و دەڵیٚین ئەوە 15 دینار.

مام سەعدوون گوتی: ئەو کیٚشەیەی ناویٚ. ئەو میرزایە چۆنی حیساب دەکات بەو پیٚیە پارەم دەدەیٚ باشە، دەنا دەیبەمە خانیٚکی دیکە.

–کوڕە ئەمە عادەتی بازاڕە. لە هەموو خانیٚك هەر وایە.

–من عادەت و مادەت نازانم. هەر ئەوەیە پیٚم گوتی.

ئەفەندی لە تووڕەییان چاوی دەرپەڕیبوو: باشە دەکاتە چەند؟

–30 دینار و چوار سەد فلس.

–چوار جیٚیە. دەلاڵییەکەی دەکاتە چوار دینار. تۆ 3 دیناری لیٚ دەرکە، بۆ مام سەعدوون بە زایە ناچیٚ.

–27 دینار و چوارسەد فلس.

–دیناریٚکیشی ئەرزییە و قەپانی لیٚ دەرکە.

–26 دینار و 400 فلس.

–400 فلسەکەش حەماڵیی زاکیر.

مام سەعدوون و ئەوان ڕۆیشتن. ئەفەندی گوتی: چەندی مانگە؟

–15ی مانگە.

–بگرە، ئەوە دوو دینار و، بڕۆ بەڕیٚی خۆتەوە. تۆ بە کاری بازاڕ نایەی.

## بیهێنە، ئەمما ناوی مەبە

کۆشکی ئاغایی وەکو کوندەبەبووی گەڕۆڵ بە بەربەڕۆچکی دێی (سەرکەل)ەوە هەڵنیشتبوو. لە هێندێ جێ پاسارەی بانەکان کەوتبوونە خوارەوە، لە هێندێ جێشدا چۆڕابوون، دەتگوت دەمی گزیری پیرە لەبەر کڕووساندنەوەی ئێسقانی پاشخوان و چەقەی زۆری چەند ساڵە لەگەڵ بێگارچییەکان ددانی تاق و واز کەوتووە و، ئەوی ماویشەتەوە خوار و خێچ بووە. لەمێژ بوو پلووسکەکان بەرببوونەوە و چاییان پێ لێنرابوو. شۆڵاوگەی باران کەندڕی خستبووە دیوارەکان و دەمیان لە گوندی سەرکەل داپچڕیبوو، دەتگوت قەستیانە ئەو چەند ماڵە ڕەعیەتەش کە لە دێدا ماون بە گاو گوێر و شیناوەردەوە قووت بدەن. بەردەکان سەریان لە سواغەکان دەرهێنابوو، ددانیان لە ڕیچەوە بردبوو، لەوە دەچوو نیازیان وابێ خۆیان لە بەندی دیوارەکان ڕزگاربکەن.

بەشی دەرەوەی قەڵا، دیواخان و پێشخانە، تەویلە و کادین، هێشتا هەر بەپێوە بوون. دیواریان بەدەورەوە و بانیان بە سەرەوە مابوو. بەڵام نە لە تەویلە حیلەی ئەسپ و ماین دەهات، نە کادین سپیایی کای تێدا دیاربوو. لە بن میچ سیسرە دەیانخوێند و لە خواریشەوە قالۆنچە ڕمبازییان دەکرد. ساڵێك بوو فەرشی دیواخانەکە فرۆشرابوو، بەڕەکانی پێشخانەی لێ ڕاخرابوون. هەموو شتێك لە ماڵی مەجیدخان بەرەو سووك و چرووکی دەڕۆیشت. ئەم بەڕانە نەبێ ڕێز و حورمەتیان پەیدا کردبوو لە پێشخانەوە هاتبوونە دیواخان و جێگای قاڵییان گرتبۆوە. تاقە حەسیرێکیش لبە مزگەوت پەڕەوازە ببوو هاتبووە قوژبنێکی پێشخانەکە.

دەزگای دەرەوەی مەجیدبەگ بە سێ شتەوە دەگەڕا: فەرەجی فەڕاش، هەڵۆی تانجی، ئێسترە بۆز. شەوانە ئێسترەبۆز فەرمانڕەوای شەشدانگی تەویلە بوو، سەربەخۆ دەیزەڕاند. هەڵۆ لەسەر کوتە حەسیرەکەی پێشخانە و فەرەجیش لە مزگەوت دەخەوتن.

تازە تاو لەناو ئاوایی کەتبوو. فەرەج لە مزگەوت هاتەدەرەوە. نۆرەی ماڵی سۆفی ڕەحیم بوو، چوو سەوەتەیەك کاو جامێ ماستی لێ ئەستاندن. کایەکەی کردە بەر ئێسترەبۆز و، ماستەکەی بردە ژوورەوە بۆ بەرچایی ئاغا. هاتەوە لە گوێسوانەی کادینەکە پێنج شەش لقی دار دەرهێنا و کوورەی دیواخانەکەی داخست، هەڵۆی لەسەر حەسیرەکە دەرکرد و لە جێگای دانیشت. تاوێکی پێچوو مەجید بەگ پەیدابوو، بەکاوەخۆ هەنگاوی هەڵدەهێنا. لەگەڵ هەموو هەنگاوێك کەوشەکانی قاچیان دەقۆستەوە. هەردوو دەستی نابووە کەلەکەی، ڕەسمی ئاغایەتیی بەجێ دەهێنا و لە شنەبای ساردیش شاردبوونیەوە. مەجید بەگ هاتە ژوورەوە لە پەنا کوورەکە دانیشت. فەرەج وەك دەست بۆ ژیژك بەرێ سەرینێکی تووکی گەورەی چڵکن کە بەرگەکەی لە دوو سێ جێ دڕابوو، لای پەنجەرەکەوە لە جێگای دوێنێ ئێوارەی ئاغا دانرابوو، بە ئەسپایی هەڵیگرت و هێنای لە پشت ئاغایەوە داینا. مەجید بەگ پاڵی داوە و گوتی: بچۆ نان بێنە. فەرەج تاوێکی پێچوو سینییەکی گەورەی هێنا دوو نان و پیاڵەیەك ماست و سێ ئیستیکان چای لەسەر بوو، لە بەردەم ئاغا دایناو چووەوە پێشخانە.

مەجید بەگ بە دەم وتووێژەوە، چەند پارووی نان و ماست خوارد و دوو ئیستیکانی چا خواردەوە. چاوی بڕیبووە سینییەکە و کەوتبووە دەریای خەیاڵاتەوە. دەستی شارەزای بەرپشتێنەکەی بوو. لە خۆیەوە قوتووە سغارەکەی دەرهێنا، سغارێکی پێچاوە و بە ئاگری



کوورەکە دایگیرساند. پزیسکێك ئاگر پەڕییە پشتی دەستی. وریابۆوە و بانگیکرد: وەرە لای بە.

فەرەج هات سینییەکەی لابرد. مەجید بەگ ناوبەناو مژێکی لە سیغارەکەی دەدا و بە وردی دەیڕوانییە میچی دیواخانەکە. تۆڕ و ڕایەڵەی جاڵجاڵۆکەی نەدەدی، فیکری دوورتر ڕۆیشتبوو، لەبەرخۆیەوە دەیبژارد: یەك.. دوو.. سێ.. تا گەیشتە سی.

فەرەج وای دەزانی ماڵە ڕۆیشتووەکان دەژمێرێ. لە پێشخانەوە هەڵیدایە: نەخێر ئاغا، بیست و پێنج.

مەجید بەگ ئەوەندە نوقمی خەیاڵات بوو گوێی لە فەرەج نەبوو، مژێکی دیکەی لە سیغارەکەی دا، دووکەڵ نەهاتە دەمی. قونچکە سیغارەکەی فت کرد. دارجگەرەکەی چەقاندە بەرپشتێنی و هاتەدەرەوە. بۆڕەو قۆڕەی گاو گوێر وریای کردەوە. تەماشای کرد ئەوا ماڵێکی دیکەش خەریکی کۆچ کردنە. تاوێ لووتی داژەند و، لە پاشان لەبەرخۆیەوە گوتی: بە گۆڕی بابیەوە، با بڕوا. داری خانووەکە بەشی مانگێکی کوورەکە دەکات. مەجید بەگ ڕۆیشتە ماڵەوە، سینییەکە بە سێ ئیستیکان و پیاڵەکی خاڵییەوە لەوێ دانرابوو، خەیاڵاتەکەی دیواخان سەری لێداوە. گوتی: ئەرێ خانم! تۆ پێم ناڵێی ئەم سینییە بۆچی وایە؟

زارا خانم گوتی: سینی چییەتی؟ چۆنە؟

–کچێ! ئەوە دەڵێی چی؟ بڕوانە ئەوەندە گەورەیە گێرەی لەسەر بگێڕە. لە دیواخان تەماشام دەکرد نانەکانیش بە حاڵ لە قوژبنێکیدا دیاربوون. دیواخانەکەش دەڵێی وشترخانە ئەوەندە بەرز و گەورەیە سێ ئاڵوودار تێدایە.

جا بۆ ناڵێی ئەویش لەبەریەك ڕەویوەتەوە.

–بەڵێ، بەڵێ، ئەسڵەن هەموو شتێك لەبەریەك ڕەویوەتەوە. کەوشەکانیشم ئەوا بە حاڵ بە پێمەوە گیر دەبن. بڕوانە کەواکەی بەرم، دەڵێی عەبایە، دوانی وەك منی تێدا جێ دەبێتەوە.

–کوڕە! قسەی چا بکە، ئابڕوومان دەچێ.

–چۆن بڕواناکەی؟ تۆش هەر وای. دەڵێی کیژۆڵەی کراسی دایکت لەبەر کردووە.

زارا خانم هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: ئەو ڕەعیەتە بێوەفا و ناپیاوانە بەجێیان هێشتین. لە دێیەکی چۆڵ و هۆڵدا هەر چاکە شێتیش نابین. سەیدی زەنبیل ئاور لە عەمر و ماڵیان بەردات.

میمکە پیرۆز، ژنی لالۆ ڕەحمان، کە بۆ خواحافیزی هاتبووە لای خانم، گوتی: ئەیرۆ خانم گیان، توخوا بۆ دوعای شەڕ لە هاوماڵەکان دەکەی! ئەوانیش وەك تۆ ڕۆڵەی شیرینیان هەیە.

–میمکە پیرۆز ئەی توخوا ئەوە پیاوەتییە لەگەڵ ئێمەی دەکەن. ئەوە وەفا و ئەمەکە! دێیەکەتان چۆڵ کرد و ئێمەتان بە تاقی تەنیا بەجێ هێشت؟

–خانم گیان، بڵێین چی؟ ئەوەی لای خواوە بێ خۆشە. ئاخر چی بکەین. بەخوا ئەرکتان زۆر قورسە. تا پێمان کرا خزمەتمان کردن. ئێستاش لە پەڕوپۆ کەوتوون. ناشکوری نەبێ دێیەکە نەگبەت گرتوویەتی. دەڵێین بەشکم خوا لە جێیەکی دیکە دەروویەکی بەخێرمان لێ بکاتەوە و نەگبەت بەرمان بدا.

خانم لە قسەکانی میمکە پیرۆز "خوا"، "نەگبەت". "دەرووی خێر".. فیکرێکی بەدڵدا هات و گوتی: میمکە پیرۆز بەدڵییەوە مەگرە، لەگەڵ تۆم نەبوو. ئێوە ڕەعیەتێکی باش بوون، تا توانیتان لەگەڵمان مانەوە، بەخێرچن، خێرتان بێتەڕێ.

–خانم گیان! دەم خۆش. قەت دوعای شەڕ لە خەڵك مەکەن. ئێوە نەجیمزادەن. ودمی باش نییە.

–بەخێرچی، میمکە پیرۆز، بەخێرچی.. کارتان ڕاست بێ!

میمکە پیرۆز ڕۆیشت. زارا خانم قیژاندی بەسەر مەجید بەگدا. عەمرت نەمێنێ. سەرسەپۆلەی بێ دەم و پل و دەستەوستانە. تۆ کەی پیاوی.. منیش نەگبەت گرتمی، چارەم لە چارەی تۆ نووسرا. دیواخان وەك وشترخان وایە و سینی بۆ گەورەیە؟ ئاقڵ لە مێشکتدا نەماوە. بە دیار ئەو پیرەژنە ڕەعیەتەوە ئەم قسانە دەکەی. ئەوانە بە خوێنی سەرمان تینوون. هەر دەڕوا و دەیڵێ. ئاخرییەکەی بۆمان دەکاتە بەیت و باوێك و ئابڕوومان دەچێ.

جاری جارانە، سینی نانی گەنمە سەرداری شانەوشان دایپۆشێ، شەش حەوت قاپ و دەوریی لەسەر بێ؟ دوو نانی وەك باڵە مێشوولە سینی لە کوێ پڕدەکاتەوە؟ ئاقڵت بەوە ناشکێ لە برسانا و لەبەر خەم و خەفەت وەك چیلکە وشك هەڵاتووین، کراس و کەوامان لێ بووەتە عەبا، دیواخان چۆڵ و هۆڵ و ڕووت و قووت؟ وشترخانە، ئەی چییە؟

تازە بۆم دەبێتەوە ئاغا و لە دیواخانە نان دەخوا. چاکە دێیەکە چۆڵە و کەسی تێدا نییە، دەنا دەبووینە پەند و مەخسەرە.

مەجید بەگ وەکو قەلەموونە لووتی بەسەر لچیدا شۆڕ ببۆوە، چاوی بڕیبووە عەرزەکە. بە کزییەکەوە گوتی: بڵێم چی؟ منیش دەزانم دیواخان و میواخان وەختی بەسەرچووە. گوتم بەرەجێژنانە. جارێ با وابێ، بەڵکو ڕەعیەتەکان ڕۆژی جێژن جێژنانەمان بۆ بێنن، جا لە پاشان بەرەو مەڕەکان کۆدەکەینەوە.

–جێژنی چی؟ تازە بە تەمای جێژنانەی؟ ئەوا ئەمڕۆش ماڵێکی دیکەیان ڕۆیشت. ماوەتەوە چوار ماڵ، ناگاتە جێژن ئەوانیش باردەکەن. بە تەمای جێژنانە خۆت لەسەرمانا دەکوژی؟ هەستە بڕۆ بۆ زەنبیل، بەڵکو سەیید هیمەتێکمان بۆ بکا، خوا دەروویەکی بەخێرمان لێبکاتەوە و نەگبەت بەرمان دا.

مەجید بەگ سواری ئێسترەبۆز بوو. فەرەج کەوتەپێشێ و چوونە زەنبیل. نە وەك جاران بارگە و بنەی پێبوو و نە دیاری و سەوقات. کەس خۆی تێنەگەیاند. شەو لێفەیەکیان بۆ هێنا لە خانەقا، چووە

ناو دووتویێی لێفەکەوە. لە خەویدا لای وابوو جاری جارانە، سەردەمی دەسڕۆیشتنییەتی. خەبەری بووەوە، بە دەم خەوەوە بانگی کرد: کێ لەوێیە؟

فەرەج گوتی: بەڵێ ئاغا.

–شتێکم پێدا دە، ساردە.

–هچ نییە، جلی ئێسترەکە نەبێ.

–بێدەنگ بە، سەگباب.

تاوێکی دیکەی پێچوو، سەرما زۆری بۆ هێنا. بانگی کرد: فەرەج شتێکم پێدا دە، زۆرم سەرمایە.

فەرەج گوتی: هەر جلە ئێسترەکە هەیە، هیچی دیکە نییە.

مەجید بەگ وتی: وست بە، کەرە.

چاوی چووە خەو، لە خەویدا زارا خانم لێی بە دەمدا هاتووە، گەزارە دەکێشێ و ئەوی بەسەر زاریدا دێ پێی دەڵێ. داچڵەکا. لەسەرمانا دەلەرزی. گوتی:

–فەرەج، زۆرم سەرمایە، عیلاجم بکە.

فەرەج گوتی: ئاغا، بەم شەوە کێ چاوی لێیە، قەی چی ئەکا؟ با جلی ئێسترەکەت پێدا دەم.

مەجید بەگ گوتی: باشە، بیهێنە، ئەمما ناوی مەبە.

## تاج و تەختی کوێخا هۆمەر

چەند ساڵ پێش شەڕی دووهەمی جیهانی، هەر لە بەیانییەوە ڕۆژێک لە بازاڕی مەهاباد، سەرودا و کڕین و فرۆشتن وێستا. دووکاندارەکان کە هەموو شتێك بە گەزی خۆیان دەپێون، وە هەموو شتێك بە سەنگ و تەرازووی خۆیان دەکێشن، تا گەز و تەرازوویان لەکاردا بێ بەتەنگ هیچەوە نین، دنیا ژێروژوور بێ، هەر ئەوان فرۆشیان ببێ، پەکیان پێناکەوێ. ئەو ڕۆژە نیوگەز وەکو مقاشی هاوین لەولاوە کەوتبوو، تەرازووش مریشکە بەکورکت تێدا بنایەتەوە. کوتووپڕ چپەچپ کەوتە بازاڕ. یەك لە یەکی دەپرسی: چ باسە، کرمانج ئەمڕۆ بۆ دەرمانیش دەست ناکەوێ؟

زۆری پێ نەچوو زانرا: سەرباز دەوری شاری گرتووە، سوخرەیە، ماین، ئەسپ، وشتر، گوێدرێژ، هەرچی بە کاری سواری و باری بێت بە سوخرە دەگیرێ.

ئەمجار خەڵك زیاتر تینووی دەنگوباس بوون. چییە؟ چ قەوماوە؟ کەس نەیدەزانی! کەسیش نەیدەوێرا زۆری لێ بکۆڵێتەوە. کاروباری لەشکری دەوڵەتە و نهێنییە، لێکۆڵینەوەی باسی سەرە.

دوو سێ ڕۆژی پێچوو، وردە وردە سوخرە بڕاوە و وەزع هاتەوە دۆخی خۆی. دەنگوباس بلاوبۆوە: بەشێك لەو لەشکرەی لە مەهابادە، چووە بۆ ناو (گەورکان). پاشان خەبەر گەیشت کە لە گەورکانیش تێپەڕیوە و بەرەو سەردەشت ڕۆیشتووە. ئیتر دەنگوباس وشکاوی هات. هێندێك دەیانگوت: ڕەنگە ئەمانە چووبن هیی سەردەشت بگۆڕن. هێندێکانیش دەیانگوت: ڕەنگە لەو ناوە شەڕ بێت. هاتوچوو بۆ سەردەشت نەبوو، نەیاندەهێشت هیچ کەس هیچ ببیسێ. ئەوە ببووە مەتەڵۆکەیەك کەس نەیتوانی هەڵیبێنێ. تا شێن و شەپۆڕ لە ماڵی (حەیدەر عەلی خان)دا کەوت. حەیدەر عەلی خان ئەفسەری فەرماندەی بەشی شەست تیری ئەو لەشکرە بوو کە چووبووە سەردەشت. دەرکەوت کە سەید عەلی خان کوژراوە.

خەڵك لە ژمارەی سەربازە کوژراوەکان کەوتنەخۆ. یەکێ: دەیگوت: سەد سەرباز کوژراوە. یەکێك دەیگوت: دوو سەد. هیی وا بوو دەیگەیاندە پێنج سەد. هێندێکیش دەیانگوت قەلاچۆیان تێخراوە و چۆلەکەکوژیان نەماوە.

خەڵك ئەوەندەیان حەز بە فەوتانی لەشکری دەوڵەت دەکرد، ئەوەی لە دڵیاندا بوو بە زۆرکردنی ژمارەی سەربازە کوژراوەکان دەریان دەبڕی و، بەم جۆرە کفتوکۆی دڵی خۆیان دەڕشت. بەڵام سەرلەبەریش بتگرتایە قسەکەیان بێ ناوەڕۆك نەبوو، چونکە ئەو بەشە لەشکرەی دەوڵەت کە لە سەردەشت بوو هیچی پێ نەکرا.

دەوڵەت نەیدەویست وەکو جاران –کە لە هەرلایەکی کوردستانی ئێران جووڵانەوەیەك ببوایە تفەنگی بە عەلی ئاغای حاجی ئێلخانی و قەرەنی ئاغای مامەش و چەند سەرۆك عەشیرەتی خۆفرۆشی دیکە کۆدەکردەوە و جووڵانەوەکانی کوردی بە کوردەکان دەخنکاند– ئەمجاریش وابکات. دەوڵەت خۆی بە دەستەڵاتدار دەزانی، ئەوانیشی چەك چن کردبوو، ئیتر نەیدەویست جارێکی دیکە چەکیان بداتەوە دەست. دەیگوت: "ڕەش هەر ڕەشە". ئەمانە با خائینی گەلەکەشیان بن، هەر کوردن و جێگای بڕوانین.

نەشیدەویست لە شارەکانی دیکەوە لەشکر بێنێ. تا خەڵك نەزانن هێشتا کەسی وا ماوە بتوانێ لە زەمانی ڕەزاشادا سەری دڵی هەڵاوێ. لە تارانەوە فەرمان درا مەسەلەکە لە کورتی بڕنەوە و پووش بەسەری کەن.

فەرماندەکانی لەشکری (ورمێ) و (مەهاباد) و (سەردەشت) کەوتنە ڕاو تەگبیر. ئاخرییەکەی بڕیاریاندا لەگەڵ کوێخا هۆمەری سوێسنێ وتووێژ بکەن. "کێ ئەم زەنگۆڵە لە ملی پشیلە بکات؟" دەستیان کرد بە پرسیار لەو بازرگان و دەرەبەگانەی سەر بە دەوڵەت بوون. بە هەموویان "کاحسێن"یان دۆزییەوە.

کاحسێن هەم سەید بوو، هەم بە ڕاوێژی دەمی عەشایری دەزانی. کاتی شەڕی هەوەڵی جیهانی میرای باپیراغای مەنگوڕ بوو. لە پاشان بەنۆرە میرزای عەلی ئاغای حاجی ئێلخانی وقەرەنی ئاغای مامەش بوو. سەرۆك عەشیرەتەکان دەیانناسی و بە پیاوێکی ئاقڵیان دەزانی. چەق و تەقی دنیای زۆر دیبوو. لە شەڕی هەوەڵی جیهانیدا کە لەشکری عوسمانی لە سابلاخ (مەهاباد) بوو، داوایان لە باپیراغا

کرد بە خۆی و لەشکرییەوە بچێ بۆ (خەزا). باپیراغا بە کاحسێنیدا وەڵامێکی زۆر توند و تیژی بۆ ئەفسەری عوسمانی ناردەوە. ئەفسەری عوسمانی کە دەستی نەدەگەیشتە باپیراغا، حوکمی ئیعدامی کاحسێنی دا.

کاحسێن بە تکای قازی عەلیی باوکی قازی محەمەدی شەهید ڕزگاری بوو. کە لەشکری ڕووسی قەیسەری هات و لەشکری عوسمانیی شکاند، ڕۆژێک کاحسێن بۆ کاری باپیراغا دەچووە سابلاخ. لە ڕێگا تووشی دەستەیەك ساڵداتی ڕووسی بوو، ساڵداتەکان کە بۆ کابرایەکی دیکە دەگەڕان، بەهەڵەچوون و کاحسێنیان گرت، وە لەگەڵ دیلی دیکە نێردرا بۆ قەفقاز، تا لە شۆڕشی مەزنی ئوکتۆبەردا بەربوو، هاتەوە.

کاحسێن کە بە سارد و گەرمی ڕۆژگار قاڵ ببوو، بۆ ئەم کارە هەڵبژێردرا، وە لەگەڵ ئەفسەرێك ناردیان بۆ لای کوێخا هۆمەر لە گوندی (قەڵەڕەشە).

کاحسێن گوتی: فەرماندەی سەردەشت لە پێشدا پیاوی ناردبووە لای کوێخا هۆمەر، کە لە لایەن دەوڵەتەوە دوو کەس دەنێردرێن بۆ وتووێژ. کوێخا هۆمەر قبووڵی کردبوو. لەسەر ئەو بەڵێنییە کەوتینەڕێ. کە لە سەردەشت دەرکەوتین و گەیشتینە ناو نزار، دوو کابرای سوێسنیی ڕووتەڵە لە بن دەوەنێك دەرپەڕین، تفەنگەکانیان قایشی پێوە نەبوو، لە جیاتیی قایش بەنیان تێخستبوو. پرسییان چ کارەن، بۆ کوێ دەچن؟

گوتمان: لە لایەن دەوڵەتەوە دەچین بۆ لای کوخا هۆمەر.

گوتیان: ڕاوەستن تا پرس بکەین.

یەکیان ڕۆیشت، دوای نیوسەعات هاتەوە.

گوتی: با بڕۆن.

ڕۆیشتین، گەیشتینە بەندەنێ. دیسان دوو سوێسنی لەبن دارێك دەرپەڕین:

—چ کارەن، بۆ کوێ دەچن؟

—لە لایەن دەوڵەتەوە دەچین بۆ لای کوێخا هۆمەر. ڕاوەستن، تا پرس بکەین.

یەکیان ڕۆیشت و دوای سەعاتێك هاتەوە، گوتی: با بڕۆن.

بە دۆڵی قەلەڕەشەدا بەربووینەوە. لە شیوێك دوو سوێسنیمان لێ دەرپەڕی:

—چ کارەن، بۆ کوێ دەچن؟

—لەلایەن دەوڵەتەوە دەچین بۆ لای کوێخا هۆمەر.

—ڕاوەستن، با پرس بکەین.

یەکیان ڕۆیشت و دوای سەعات و نیوێك هاتەوە،

گوتی: با بڕۆن.

ڕۆیشتن تا گەیشتینە قەراخ ئاوایی قەلەڕەشە. دوو سوێسنی لەوێ ڕاوەستابوون:

—چ کارەن، بۆ کوێ دەچن؟

لە لایەن دەوڵەتەوە دەچین بۆ لای کوێخا هۆمەر.

—ڕاوەستن، با پرس بکەین.

یەکیان ڕۆیشت، دوای دوو سەعات هاتەوە،

گوتی: با بڕۆن.

ڕۆیشتن، گەیشتینە بەر حەوشەیەك کە بە تەیمان گیرابوو، چەپەرێکی گەورەی پێوە بوو.

سوێسنییەك بە تفەنگەوە لەودیوی چەپەرەکە ڕاوێستابوو.

—چ کارەن، لە چی دەگەڕێن؟

—لە لایەن دەوڵەتەوە هاتووین بۆ لای کوێخا هۆمەر.

بانگی کرد: پیرۆت! ئەمانە دەیانەوێ بێنە لای کوێخا هۆمەر.

دوای چارەکە سەعاتێك پیرۆت لە هەیوانی هۆدەیەکەوە بانگی کرد: با بێن.

ڕۆیشتین، گەیشتینە هەیوانەکە. پیرۆت گوتی: ڕاوەستن.

پیرۆت چووە ژوورەوە. دوای ماوەیەك هاتە دەرەوە، گوتی: بچنە ژوورەوە.

چووینە ژوورەوە. چ ببینین؟ سەیر و سەمەرە! هۆدەیەکی قوڕین، دیوارەکانی بە دووکەڵ ڕەش ببوو، میچەکەی قورماوی بوو، تاقە پەنجەرێکی بچووکی تێدابوو بۆ سەر هەیوانەکە، شووشەکەی بە دووکەڵ ڕەش داگەڕابوو. هیچی لێ ڕانەخرابوو. لە ناوەڕاستی هۆدەکەدا کورسییەکی زستانی کە لەسەر تەنوور دایدەنێن و لێفەی پێدا دەدەن و لە دەوری دادەنیشن، دانرابوو. کوێخا هۆمەر لەسەر کورسیەکە دانیشتبوو، لاقێکی نابووە سەر لاقێکی، بەسەر سەریەوە سەوەتەیەك بە بەن بە داری میچەکەوە هەڵاوەسرابوو. کوێخا هۆمەر سەری کردبوو بە بن سەوەتەکەدا. کوێخا هۆمەر نە تەماشای کردین" نەوەڵامی داینەوە. پیرۆت قەلیانێکی تێکرد و دایە دەست کوێخا هۆمەر. کوێخا هۆمەر ناوبەناو مژی لە قەلیانەکە دەدا و چاوی بڕیبووە پەنجەرەکە. ئێمەش وێستابووین. کابرای ئەفسەر سپی هەڵگەڕاببوو.، لە بیچمی وا دەردەکەوت لای وایە بەدەست ئەم دێو و درنجەوە هەزار گیانی پێ بێ گیانێك بە ساخی دەرناکات. بە چاو ئیشارەم لێ کرد: نەترسی. دوای تاوێك کوێخا هۆمەر گوتی: پیرۆت، چای بێنە.

پیرۆت چایەکی هێنا و داینا. کوێخا هۆمەر ناوبەناو مژێکی لە قەلیانەکە دەدا و قومێکی لە چایەکە دەخواردەوە. کە لە قەلیان و چایەکە بۆوە، ڕوویکردە ئێمە و گوتی: ئێوە کێن؟ دەڵێن چی.

گوتم: کوێخا هۆمەر، ئەمە ڕەسم و باوی کوردەواری نییە. لە هەموو ماڵێك ڕێز و حورمەت لە میوان دەگرن. ئێمە میوانی تۆین.

—بەڵێ، کە دەستتان ناڕوات، ئەم قسانە دەکەن. ئێستا قسەتان چییە بیڵێن.



–له پێشدا پیاویان ناردبووه لات قبووڵت کردبوو ئێمه ببێین. ئەوا له لایەن دەوڵەتەوه هاتووین قسەت لەگەڵ بکەین.

–چۆن هاتن؟

–له سەردەشت کەوتینه ڕێ و ئەوا گەیشتووینەته ئێره، لای تۆ.

–نا، نا، به وردی بۆم بگێڕنەوه تووشی کێ هاتن؟ چییان لێ پرسین؟

به وردی هەمووم بۆ گێڕایەوه، چەند جار ڕایانگرتین، چەند برسی و تاونی بووین.

گوتی: لێره، لەم هۆدەیەدا چۆن؟

گوتم: وەڵامی سڵاوت نەداینەوه، ماندوو نەبوونیت نەکردین. لەو ساوه تا ئێستا به پێوه ڕاتگرتووین.

–قسەی چیم لەگەڵ دەکەن. ئەمه وەڵامەکەتانه. کردەوەی پیاوەکانی دەوڵەتەکەتان له سەردەشت لەگەڵ ئێمه ئاوایه. به شایەکەتان بڵێن کردەوەی پیاوەکانی باش دەکا و وەکو ئینسانان دەبزوونەوه، ئەوا باشه. ئەگەر هەر لەسەر ئەم پێودانانەش دەڕۆن، ئەو تاج و تەختی هەیه، منیش ئەمه [ئیشارەی بۆ سەوەتەکه کرد] تاج و، ئەمەش [ئیشارەی بۆ کورسییەکه کرد] تەختم. دەسا دەست له دەست و قەوەت له خوا. کوێخا هۆمەر دەرفەتی نەداین قسه بکەین، گوتی: پیرۆت بییانبه.

پیرۆت بردینییه هۆدەیەکی گەورەی ڕووناك و خاوێن، قاڵیی لێ ڕاخرابوو، پاڵ و پشتی لێ دانرابوو، سەماوەر قوڵتەقوڵتی بوو. دانیشتین، چایان بۆ تێکردین. دوای تاوێك کوێخا هۆمەر هات و لای خوارەوه دانیشت. به ڕووخۆشییەوه بەخێرهاتنێکی گەرم و گوڕی کردین. نان و خوانێکی باشیان هێنا و نانمان خوارد.

گوتم: دەی کوێخا هۆمەر، ئێستا با قسان بکەین.

–قسەی چی بکەین؟ "قسه هەزاره، یەکی بەکاره". من وەڵامی ئێوەم دایەوه. تۆ پیاوێکی ئاقڵی. بڕواناکەم تنێنەگەیشتبی. ماڵاوایيمان لێکرد. کوێخا هۆمەر زۆر به حورمەتەوه بەڕێی کردین.

هاتمەوه، سەرلەشکرم تێگەیاند تاوانی ژاندارمەیه سوێسنییەکانی ئەوەنده هەراسان کردووه ناچار بوون بەگژ دەوڵەتدا بچن. دەوڵەت قەدەغەی کرد ژاندارم به خاکی سۆسنیدا بچێ. بۆ کاروباری ئەوێ دایرەیەکیان دانا به ناوی (دایرەی ئینتیزاماتی عەشایری)، کابرایەکیان کرده سەرۆکی ئەو دایریه به ناوی (سەرهەنگ پزیشکییان). سەربازەکانی پزیشکییانیش پاش یەك دوو ساڵ ورده ورده چوونەوه سەر پێودانەکەی ژاندارم، تا ڕێژێمی ڕەزاشا ڕووخا. ڕۆژێك له ڕۆژەکانی هاوینی ساڵی 1941 پزیشکیان و سەربازەکانی، وەکو سڵقی ڕووت، به تویێی کراس و دەرپێ هاتنەوه مەهاباد و لەوێوه ڕۆیشتنەوه بۆ پێتەختی شاهەنشاهی.

## ئاغا وەجاخی ڕۆشنە

ڕەشید ئاغا لە تەمەنی لاوێتیدا بوو. چەند ساڵێك بوو ببووە ئاغا. ئەویش وەك "گای حاکم[تر]" لە تەڕی دەیخوارد و لە ویشکی دەخەوت. لەوەتی پێگەیشتبوو، شەو خەریکی قومار و، ڕۆژ خەریکی ڕاوو شکار بوو. تاقە هونەرێکی کە بووی، ئەوە بوو لە زمانی تاژیی دەزانی.

ڕەشید ئاغا: هەو.. هەو.. هەو.. ڕستی هاوریشم و قەلادەی زیوت لە ئەستۆ دەکەم، دەست و پەنجەت لە خەنە دەگرم، جلی تورمەت بۆ دەکەم!

تاوس، وەکو ژاندارمەیەك کە تازە چەند کوردی گرتبێ و ئافەرینی لێ کرابێ و ئەفسەرەکەی بانگی کات، یا وەك ژنە وەرزێرێکی کە بەناو دڕك و داڵدا بە دوای تاقە مانگا ونبووەکەیدا ڕابکات، بە خۆشبەزی و خێرایی بازی دەبرد بۆ لای ڕەشید ئاغا، وە خشپەی پێی نەدەبیسرا، بە قەلادەی زێوین و جلی تورمەوە بە دەوروبەری ئاغادا دەهات و دەچوو، کلکەسووتەی دەکرد، خۆی دەکێشاوە و دەیقوروسکاند، پای: ئامادەی ڕاو و تێبەربوونم.

ئاغا و تانجی، پشتاوپشت، لەگەڵ یەکتر هاتبوونە خوارەوە. هەرچەند لە دوو ڕەگەزی جیاواز بوون، بەڵام سەبارەت بە پێشینەی مێژوویی بێ تەرجومان لە یەکتر تێدەگەیشتن.

ئێوارەی ڕۆژێکی دەمەوزستان بوو. لە هەیوانی دیواخانی "نۆبار[تڕ]" ڕەشید ئاغا و تاوس بەدیار نۆکەرەکانەوە، بە زمانی حاڵ ئەو قسانەیان دەکرد.

نۆکەرەکانی ڕەشید ئاغا کە زوربەیان لەگەڵ نۆبار و دیواخانە و ئەسپ و تاژی لە ئاغای ڕەحمەتی بە میرات مابوونەوە، لە هەراویی ناودەست و باریکیی دەست و پاشوو و خۆشبەزیی تاوس واقیان وڕمابوو، هیوادار بوون خۆیان و ئاغایان بێ گۆشت نەکات. یەك لە دوای یەك پیرۆزبایی تاوسیان لە ڕەشید ئاغا دەکرد. لە پاشان کوێخا عەولاّ هەڵیدایە و گوتی: بە گۆڕێکی ئاغای ڕەحمەتیی تێچووە، ئەو تاژیە دیزیەتییە. ئەگینا ئەم هەڵۆیە و دوو تەغار گەنمیان نەگوتووە.

ڕەشید ئاغا: دەچەغەبە. دەویت باب، ئاقڵت بۆ لەکارکردم! دیارە ئەگەر حەمەوەیس لەبرسا قۆڕەی زگی نەهاتایە، بۆ دوو تەغار گەنم لێرەوە نەدەچووە "تیلەکۆ[سە]"، بە شەوی ئەنگوستەچاو، سینگی خۆی بە گوولـلەوە نێت و تاوس بۆ من بدزێ. دوو ساڵی تەواوە ناوبانگی تاوسم بیستووە. لە عاسمان بۆی دەگەڕام، لەسەر زەوی دەستم کەوت، ئەگەر زۆرت بەخیلی بە حەمەوەیس دێ دوو تەغار گەنمی دەستکەوتووە، نەچووە بچێ، ڕستت دەکەم و تێت بەردەدەم، کە کەروێشکێکت کوشت دوو تەغار گەنم بە تۆ دەدەم.

کوێخا عەولاّ: دە باشە ئاغا. تۆ لەسەر کەروێشکی خۆت نیی؟ من تەماڵێکت بۆ دەدۆزمەوە، کەیفت لێیە لە لاندا بە زیندوویی دەیگرم، حەزدەکەی تاوسی تێبەردە.

ڕەشید ئاغا: دە بڕۆ تەماڵ بدۆزەرەوە.

کوێخا عەولاّ: ئاغا ئەوەندەم لێ بوەستە گەردالێك بەفر بباری. بزانە دوو تەغار گەنمەکە حەلاڵ دەکەم یان نا؟

لەوکاتەدا، تاوس ڕەشید ئاغای تێگەیاند کە ئارەزووی ڕاوی هەیە. بە بەردەمی ئاغادا 3–4 بازی برد. بەحاڵ نووکی پەنجەی لە زەوی دەخشا. ڕەشید ئاغا [بە تاوس]: دەك لەبەر قەڵەمبازت مرم. [ئەوجار بە کوێخا عەولاّ]: بەسەری مارف ئاغا، سبەینێ تا چێشتانێ تەماڵێك نەدۆزییەوە گەسکت لەسەر بارەوە دەنێم[شە]. کە دۆزیشتەوە جگە لە دوو تەغار گەنم، ئەو ڕانك و چۆغەی بەریشم هیی تۆیە. دە بڕۆ بزانم چ دەکەی؟

کوێخا عولاّ: ئاغا! سوێندەکەت بە گوڵ بێ. لە بەفری نەباریو، تەماڵت لە کوێ بۆ بدۆزمەوە؟ ئەوەندەم سەبر لێ بگرە. بەفر عەرز سپی بکات جا ئەو حەلە چاوم لێ بکە.

ڕەشید ئاغا: ئەو قسانەی پێ ناوێ. باسی تەماڵت کرد، دەبێ بیدۆزیتەوە. دەنا دەتکەمە تەماڵ و سەگت تێ بەردەدەم.

بایز [یە کێ لە نۆکەرەکان، کە بەڕیز لە بن دیواری هەیوانەکە بەدیار ئاغاوە وێستابوون] لەبەرخۆیەوە: عەولاّ خۆی بە دەمڕاست دەزانێ. دە بڕۆ بەم ڕەشانگە تەماڵ بدۆزەوە.

جافر [یەکێکی دیکە لە نۆکەرەکان]: ئەوەندە گەوجە پێی وایە کەروێشکیش ڕەعیەتە بچێ لە ماڵەوە بە شەق بیهێنێتە بێگار. ئێمەش دەتوانین ڕەعیەت بە شەق ئەمدیوو ئەودیو کەین. دە بڕۆ تەماڵ بدۆزەرەوە. بە زمانی خۆت پێوە بووی!

مام سەلیم [بە حاڵ کەڵبەی لە دەمدا مابوو، وەختی خۆی گەورە نۆکەری مارف ئاغای باوکی ڕەشید ئاغا بوو] بە پڵتەپڵت لەبەرخۆیەوە دەستی پێکرد: دەك کوێر بم، ئاغا ئاوا دەبێ. دەمەویست ئێستا ئاغای ڕەحمەتی بوایە ئەم چەلەحانێیەی لەگەڵ بکردایە. چما کاری لە پێستی سەری نەدەئاخنی.

ڕەشید ئاغا، کە بە بەرسەفی نۆکەرەکاندا پیاسەی دەکرد، گوێی لەو قسەیە بوو، چووە پێستی باوکییەوە و گوتی: مام سەلیم! سبەینێ تا نیوەڕۆم لێ ڕاوێستە، جا قسەی ئاغای خۆت تاقی کەرەوە، بزانە چۆن دەیکەمە تەماڵ.

---

[تر] قسەی پێشینانە بە کەسانی ئاوا دەڵێن "وەك گای حاکم وایە لە تەڕی دەخواو، لە وشکی دەنوێ".

[تڕ] نۆبار: گوندێکە لە مەڵبەندی بۆکان.

[سە] تیلەکۆ: ناوچەیەکە لە مەڵبەندی سەقز.

[شە] یانی: بە ماڵەوە دەرت دەکەم.

کوێخا عەولاّ، هەرچەند باب نۆکەر نەبوو، وەکو مام سەلیم چاوی بە پاشخوانی ئاغای ڕەحمەتی نەپشکووتبوو، بەلاّم دەتگوت لەژێر چەکوشـی شـەیتان دەرپـەڕیوە. لـە فروفێڵـی ئاغـا و نۆکەریـدا وەسـتابوو، دەیزانـی ئـاقڵی ئاغا تـاکوێ بڕدەکات. تـەگبیری خـۆی کردبوو، ئەمما دەیویست ڕەشید ئاغا پتر شێلگیر کا. تا دوو تـەغار گەنمەکەی دەستکەوێ. ڕووی کردە میرزا سمایلی میرزای ئاغا کە لەولاوە وێستابوو، کتێبێکی چڵکنی بە دەستەوە بوو: مام میرزا بۆم بڕوانە ئەو کتێبە، جا ڕبەیەکت لە گەنمەکە دەدەمێ.

میرزا سمایل: دەبڕۆ مردووت مرێ. ئێستاکە لە قەندیلیش بەفر نەکەوتووە، قامووسیش تەماڵ ناگری. بۆت بڕوانمە کتێبی چی؟

کوێخا عەولاّ: بەسەری ئەو ئاغایە ڕبە گەنمێکت لە کیس چوو!

ڕەشـید ئاغـا: هـا.. هـا.. لـە سـبەینێی نـەهاتوو، لەتـە مـاڵی نەدۆزراوە و، لە گەنمی وەرنەگیراو، داخ دەباتە دڵی میرزا!

نۆکەرەکان: بەڵێ، ئاغا جوانی دەفەرموێ.

ئاها.. ها.. ها..

کوێخا عەولاّ (دەیەویست بۆ پێکەنینی ئاغا زیاتر سەربکاتە سەر میرزا، باشە، مەڕوانە کتێبە چڵکنت. بەسەری ئەو ئاغایە چاوت بە گەنم ناکەوێ.

میرزا: کوڕە، باوکم، برام! دەوەن بە ئاشی چم پێدەکەی؟ تۆ خۆت تەماعی ماسیی ناو دەریا کەوتووەتە سەرت، واز لە من بێنە.

ڕەشـید ئاغـا: مـن عـەولاّ دەناسـم. بـە ڕبـە گـەنمێك باوکیشـی دەفرۆشێ.

مـیرزا (کـە داخـی عـولاّی لەدڵـدا بـوو): شـوکور بـاوکی نـەماوە، ئـەگینا بـێ گـەنمیش دەیهێنایـە سـەما. کوێخـا عـولاّ تێگەیشـت مەبەسـتی مـیرزا ئەوەیـە بـاوکی عـەولاّ ڕەعیـەت بـوو. ئەگـەر بمایـە ئەویشی بە دەردی ڕەعیەتەکانی دیکە دەبرد. گوتی: من نمەك بە حەرام نیم. ئاغام چۆنی پێ خۆش بێ وا دەکەم.

مـیرزا، کـە زانیـی قسـە دەگاتـە ناسـکی، گـوتی:: ئاغـا حـەزدەکا تەماڵی بۆ بدۆزێتەوە.

کوێخا عەولاّ: باشە، بەلاّم بەو شە ڕتە دەم لە گۆشتەکەی نەدەی.

مـام سـەلیم: هـەتیوە، عـەولاّ، تـۆ شـێتی؟ لـە بـەفری نـەباریو، لـە تەماڵی نەبوو، لە ڕاوی نەکراو، لە تاژیی تێبەرنەدراو، لە کەروێشکی نەکوژراو، لە چێشتی لێنەنراو، میرزا دەم لە گۆشتی چی نادات؟

میرزا: بەخوا بڵێم چی؟ سەرم لەم قسانە دەرناچێ!

کوێخـا عـەولاّ: ڕاسـت دەکـا. هـەر سـەری لـەوە دەردەچـێ بـۆ ڕەعیەتـەکان بپارێتـەوە و تکایـان بـۆ بکـا. ئەوەنـدەی قاقـەز و ماقـەز خوێندۆتەوە و هاتوچۆی شاری کردووە قسەی ئێمەی پێ هیچە.

مـیرزا: تـۆ بـڕۆ تـەماڵ بدۆزەرەوە و واز لـە مـن و قاقـەز و ماقـەزم بێنە. هەر شتە وەختی خۆی هەیە. ئێستا جارێ ئەوا وەختـی تـەماڵ و ڕاوە.

ڕەشید ئاغا (بە دەم ڕێگای ژوورەوە): عەولاّ!

تـاوس بـەرە دەسـت و پاشـووی لـە خەنـە گـرە بـۆ تەماڵەکـەی سبەینێ.

کوێخا عەولاّ: بەڵێ، ئاغا.

ڕەشد ئاغا (بەیانی دوای نان و چا): عەولاّ!

کوێخـا عـەولاّ (کـە لـە پێشـخانە لەگـەڵ نۆکـەرەکان خـەریکی پاشخوان خواردن بوو، پارووەکەی بەخڕی قووت دا): بەڵێ.. بەڵێ.. ئاغا.

ڕەشید ئاغا: دەست و پاشووی تاوست لە خەنە گرت؟

عەولاّ: بەڵێ، ئاغا.

ڕەشید ئاغا: قسەی خۆم لەبیرنەچۆتەوە تەماڵت دۆزییەوە.

عەولاّ: بەڵێ، ئاغا.

ڕەشید ئاغا: ولاّغان بێنن، با بچین بۆ ڕاو.

تـاوس لەبـەر ئەسـپی ڕەشـید ئاغـاوە سـەمای دەکـرد. لـە بنـاری "تەرەغـە[1]" ڕاو دابەسـترا. کـە گەیشـتنە شـێوەلێك، عـەولاّ، لـەپڕ، هەڵیکێشا تەماڵ:

–خولاّمی سەری ئاغای خۆم، تەما.. ڵە!

ڕەشید ئاغا تاژیی تێبەردا، بەلاّم کەروێشك هەڵنەستا.

عەولاّ: ئاغا، بەلان کەوتووە[2]، با بچم هەڵی ئەستێنم. ڕکێفی لێدا و چووە پێشەوە.

دابـەزی و گورجێـك پـەتی ملـی کەروێشـکی دارنـی و فڕێیـدا دەرەوە.

ڕەشـید ئاغـا (تاوسـی دووبـارە تێبـەردا): هـا بیگـرە تـاوس هـا.! دەری نەکەی ها!.. لـە سـەری منت کـەوێ.. تـاوس یـەك دوو سـەری پێداهات و کەروێشکی هەڵگرت.

عـەولاّ بـەغار چـوو کەروێشـکی لـە دەم تـاژی سـەندەوە و بـە پاشکۆیەوە هەڵیواسی.

کـە گەڕانـەوە عـەولاّ چـاوی پێکـەوت برایمـە شـەل لـە سـەرمانا دەلەرزێ کەچی لە بەر دەرکی مزگەوت لەگەڵ میرزا وێستاوە قسەی بۆ دەکات.

کوێخا عەولاّ (بە پەلە): برایم ئەوە هێشتا نەڕۆیشتووی؟

برایم: بۆ کوێ؟ تۆ هیچت بە من نەگوتووە.

کوێخا عەولاّ: پێم نەگوتی، ئەوا گوتم. ڕاکە بچۆ بۆکان تەنەکەیەك نەوت بێنە بۆ ماڵی ئاغا. زوو وەرەوە، بۆ ئێواری فریای خە!

شـەو لە دیواخان بە دەم خواردنی گۆشتی کەروێشکەوە، باس باسی ڕاو و تاریف تاریفی تاوس بوو.

[1] تەرەغە: کەژێکی گەورەیە لە ناوچەی بۆکان.

[2] یانی لە لاندا خۆی مات داوە.

ڕەشید ئاغا: مام سەلیم! چۆنم تەماڵ بە عەولا پەیداکرد؟ خۆ ئێستا ئاغایەتی دەزانم؟

مام سەلیم: ئەوەندەی گڵ بەسەر ئاغای ڕەحمەتییەوەیە، سەد ئەوەندە عومری تۆ بێ. شوکر ئاغا وەجاخی ڕۆشنە.

میرزا (بزەی دەهاتێ): بەڵێ، ئاغا وەجاخی ڕوونە!

ڕەشید ئاغا: مام سەلیم! بەیانی دوو تەغار گەنم بدە بە عەولا، ڕانك و چۆغەكانیشی بۆ دەنێرم..

شەو دیواخان چۆڵ بوو، عەولا دەڕۆیشتە ماڵەوە، لای دا دەركی ماڵی برایمە شەل و بانگی كردە دەرەوە، گوتی: برایم لە دەمت دەربێ كەروێشكی ماڵیت لێ ون بووە، لەژێر بێگاردا دەتپڕووكێنم. خۆ دوێنێ هیچت بە میرزا نەگوتووە؟

برایم: جا با پێشم گوتبێ، چیی تێدایە، ئەویش هەر لە خۆتانە!

عەولا: نا، نا. ئەوە كابرایەكی شاری و دەمشڕە. ئەگەر لای ئاغا باسی كرد، تۆ بڵێ درۆ دەكات شتی وا نەبووە، جا نۆرە بێگارت لەسەر هەڵدەگرم.

## خەملی پەموو

هاوینی ساڵی 1956 بوو، خانەقا چۆڵ و هۆڵ بوو، زەوی خوا دەزانێ بۆ جاری چەندەم لە ڕۆژ نێزێك دەبۆوە و تیشك و تینی زیاتری لە خۆر وەردەگرت. وەرزێرەكان وەكو هەموو هاوینێكی دیكە بە ئیش و كاری كشتوكاڵەوە سەریان قاڵ بوو، نەیاندەپرژا سەری ماڵی شێخ بدەن. ئەگەر دەرفەتیشیان ببوایە، لەبەرئەوە كە نوخشە دەرنەهاتبوو، لە ڕوویان نەدەهات بە دەستی خاڵی و بەتاڵ بێنە زیارەت. پەردەی كشوماتی بەسەر خانەقا و ماڵی شێخا كشابوو. لە شەو و ڕۆژدا تەنیا پێنج جار دەنگی بانگی سۆفی قادری هەورامی گۆمی بێدەنگیی نەختێ دەشڵەقاند. لە جیاتیی "خەتم و تەهلیلە"ی سۆفی و زكر و دەفی دەروێش، مێشوولەكان كە لە برسانا ئاڵۆزابوون، تێكدەهاڵان و ویزەوزیان بوو.

شێخ پێش نیوەڕۆ و ئێوارە تا نێزیك بانگدان یا لە حەوشەی خانەقا پیاسەی دەكرد، یا لەسەر كورسییەكەی كە لە هەیوانی خانەقا بە تایبەتی بۆ ئەو دانرابوو دادەنیشت و دەنكی تەزبێحەكەی دەگێڕاو، دیاربوو بیری لە داهاتی پایزی پار دەكردەوە كە چەندە بوو، وە ئەمساڵ چەندە دەبێت.

مەلا جەلال، كە ئەگەر نوێژ كاڵا بوایە دەكرا بڵێین كرێكاری دینی بوو، مانگی بە پێنج دینار بۆ پێشنوێژی بەكرێ گیرابوو. وەكو كرێكاری دەستەمۆ كە چاوی لە دەمی خاوەن كار بێت و وریای وەخت و كاتی كارەكە بێ، گوێی لەوە نەبوو كەس هەیە لە پشتیەوە نوێژ بكا یان نا، لەگەڵ دەنگی بانگەكە دەسبەجێ دەخزا میحرابەكە. سۆفی قادریش كە نوێژ بەشێكی گرینگ بوو لە دەسمایە، یا باشتر بڵێین (دەم مایە)ی ژیانی، لە پشتیەوە دەوستا. میرزا عەلیش كە كرێوە پێچ بوو دەبووە سێهەمیان. بەڵام شێخ یا وەڕەز بوو، یا بە پێویستی نەدەزانی، یا بەشكم لە ماڵەوە نوێژی دەكرد، لەو وەختەدا نەدەهاتە خانەقا.

مەلا جەلال و سۆفی قادر كە قامەتیان بۆ یەكتر دەستاندەوە، لە هەوای دەنگ و خاویی دەمیان دەردەكەوت هەر ئەوەندە بوو ئەركی خۆیان بەجێ دەگەیاند، ئەگینا هیچ لە شانیان خۆش نەبوو. میرزا عەلیش وەكو ڕەشایی لەشكر وابوو، لە نوێژكەرێكی سادە بەولاوە ڕۆڵێكی یاری نەدەكرد.

ئەو خانەقا وڕاق و گەورەیە بە سێ كەسەوە، لە كاتی جەماعەتدا وەكو حەمامێكی قەدیمی وابوو كە حەمامچی و ئاوگێڕ و یەكێكیش بەخێر خۆیانی تێدا بشۆن، وە ئەو ڕۆژانە دیاری و سەوقاتێكی بۆ شێخ و خەتم و تەهلیلەیەكی بۆ خوا تێدا نەبوو.

پێش نیوەڕۆیەك سۆفی قادر وەكو هەموو ڕۆژێ حەوشەكە و هەیوانەكەی گەسك دابوو، ئاوپرژێنی كردبوو. كورسییەكەی شێخی خاوێن كردبۆوە. ڕاوێستابوو شانی دابوو بە لاشیپانی دەركی ماڵی شێخەوە.

شێخ هاتە دەرەوە:

–سۆفی قادر چ باسە؟

سۆفی قادر (بە شێوەیەكی نیوە هەورامی): سەلامەتی و سەر و شێخی. ناشوكری نەبۆ خانەقا چۆڵەن. شێخ هات لەسەر كورسییەكە دانیشت و چاوی بڕییە دەرگای حەوشەكە. كوتووپڕ مەلا جەلال بە شان و عەباوە خۆی كرد بە ژووردا، وا دیاربوو دوێنێ ئێواریێ مانگی دیبوو.

شێخ چاوەڕوانی هاتنی خەڵك بوو، بەڵام نەك هیی وەكو مەلا جەلال كە جگە لەوە خێری بە ناوچاوەوە نەبوو، ڕەنگ بوو داوای مانگانەش بكات. شێخ كە ئەحواڵی پرسی و خۆشهاتنی مەلا جەلالی كرد، لە بیچمی وا دەركەوت لە دڵی خۆیدا دەڵێ: كابرا تۆ پێشنوێژی خانەقای، دەبێ لە واریداتی ڕۆژانەی خانەقا پارەت بدرێتێ. خانەقاش ئەم ڕۆژانە چۆڵ و هۆڵە. ئیتر چیت دەوێ، نابێ نەختێ ئاقڵت ببێ؟

لەم كاتەدا سۆفی نامیق كە چاكی كەوا شۆڕەكەی كردبوو بەلادا و بەنەخوێنەكەی بەسەر دەرپێ سپییە چڵكنەكەیەوە تاقمانەجووتی دەكرد، ئەوەندە بە پەلە خۆی كرد بە ژووردا، لە بیری چوو ئاتەكی كەواكەی داداتەوە. شێخ كە چاوی بە سۆفی نامیق كەوت، تەمومژی ناوچەوانی نەختێ ڕەوی، بانگی كرد:

–سۆفی نامیق بە خێرێی، خێرە شوكر؟

سۆفی نامیق: بەخوا قوروان مەگەر هیمەت پیران فریام کەفێ! خێری چی؟

شێخ هەقی بوو هاتنی سۆفی نامیقی پێ خۆش بێ. مریدێکی بەسۆز و موخلیس بوو، خزمەتی خانەقای زۆر دەکرد، هیچ کاتێ بە دەستی خاڵی نەدەهاتە زیارەت. "هیچ نەبێ دینارێکی هێناوە مەلا جەلالی پێ بێدەنگ کەم.. خۆ ئەگەر هیچیشی نەهێنابێ، دیسان هەر قەیناکا. هاوینە، نوخشە دەرنەهاتوە (دار ئەگەر ساڵی بەری نەهێنا، ناشێ بیبڕی)".

سۆفی نامیق سەرکەوت، سڵاوی کرد و دەستی شێخی ماچ کرد.

–سۆفی نامیق، بەخێرهاتی. خۆشی شوکر؟

–قوروان خوا خۆشت کا. لە سایەی خواوە و هیمەت و بەرەکەتی شێخەوە؟

–ماڵ و منداڵت چۆنن؟

–قوروان، دەستەکانت ماچ ئەکەن.. خزمەتکارتن.

–شیناوەردەکەت چۆنە، نوخشە دەرنەهاتووە؟

–ئای قوروان نوخشەی چی؟ خۆزیا هەر نەبوایە. ئەمساڵ پەمگەکەمان هەراش بوو، بە خاو و خێزانەوە تێی ورووکاین. چەند مانگ کوێرەوەریمان لە تەکیا دی، ئەوا ئیسە گشتی بووگە وە هیچ. مەگەر خۆت هیمەتێکم بۆ بفەرمووی، پەنام هاوردگە بەر خانەقا، تا چارم نەکەی ناڕۆمەوە.

شێخ (بە شێوەی دەمی سۆفی نامیق): سۆفی نامیق، بێژە خوا کەریمە. چی قەوماگە؟

–قوروان، وەکیل زۆراوبەگ هاتگە، دەفتەری هاوردگە، خەمڵەکەی ئەوەندە قورسە گشت پەمگەکەی بەمێ ئینجا ڕزگارم تێ. ئەوا خۆم خستگە خانەقا. بەخوا ئەشێ هیمەتێکم بۆ بکەی.

–شتی وا چۆن ئەبێ؟ ئاخر خەمڵیش ڕێوشوێن و قاعیدەی خۆی هەیە.

–قوروان شلە و قولەی بەگ کوا گوێ ئەدەنە ڕێوشوێن و قایدە؟

لەوکاتەدا سۆفی قادر بانگی نیوەڕۆی دا.

شێخ: خاسە، سۆفی نامیق خاسە، ئیسە دەنێرمە لای زۆراو بەگ. مەلا جەلال! تۆش مەڕۆرەوە. جەماعەتەکە بکەن. لەگەڵ سۆفی نامیق لەو حوجرە دانیشە، لێرە قاوەڵتی بکە.

دوای قاوەڵتی شێخ هاتە دەرەوە: سۆفی نامیق! سۆفی ڕەشیدم ناردە خزمەت زۆراو بەگ. ئێستا دێتەوە. خوا کەریمە.

سۆفی نامیق: ئای خوا بمکا وەسەیەقەت. ئای بم وەقوروانەکەت.



تاوێکی پێچوو سۆفی ڕەشید هاتەوە.

شێخ: ئادەی سۆفی ڕەشید، زۆراو بەگ گوتی چی؟

سۆفی ڕەشید: قوروان، چووم، فەرمایشتەکەی جەنابتم بە زۆراو بەگ گوت، زۆر سەلامی عەرز دەکردی.

–عەلەیکەسەلام. خوا کاری ڕاست کا. دەی ئیشەکەی سۆفی نامیق بوو بە چی؟

–عەرزت دەکەم (چووە پێشەوە، شتێکی بە گوێچکەی شێخدا سرکاند).

تومەس زۆراو بەگ گوتبووی شێخ ئەوەندە ڕوونەدا بەو مسکێنانە. ئاخر خۆشی خاوەن موڵکە. ئەمانە ڕوویان بکرێتەوە هیچ بە خۆشی نادەن.

شێخ ڕاوێژی دەمی گۆڕا. گوتی: ئەمانە پیاوی دنیان، هەر لەسەر تەماعی خۆیانن، بیریان بەلای قەبر و قیامەتەوە نییە، تکای ئێمە ناگرن.

بچۆ بزانە بەشکم لەتەك وەکیلەکەیا ڕێك کەوی.

سۆفی نامیق: قوروان ڕێککەوتنی چی؟ کاورا ئێژی بەرازە. گشت پەمگەکەی گەرەکە.

شێخ: سا بێژین چی؟ زەمانە خراپ بووە. زوڵمەت دنیای داگرتووە. خوا ڕەحم بە ئیمانەکەمان بکا.

سۆفی نامیق: بیم وەقوروانەکەت. خاس ئەفەرمووی. ئاخرزەمانە. ئەمە پێنج مانگی ڕەبەقە بە خۆم و بە منداڵەکانمەوە ڕەنج ئەدەین. ئیسە گشت پەمگەکەی گەرەکە. ئەی خوا هەڵی نەگری.

شێخ: بێژین چی سۆفی نامیق، قەزا و قەدەری خوایە.

سۆفی نامیق: یا شێخ ئەمە ئەفەرمووی چی؟ ئیسە من گشت پەمگەکەی بەمێ، ئەمە چییە خەمڵی کردگە؟

شێخ: عیلاج نییە سۆفی نامیق. زەمانەکە خراپ بووە. خوا خراپتر نەدا.

سۆفی نامیق: یا شێخ کە واسە، بێژە "تۆ فەرموو، ئێمە میاو".

مەلا جەلال ویستی سۆفی نامیق تێبگەێنێ لە ڕووی شێخدا قسەی وا نەکا،

گوتی: سۆفی نامیق، ئەمە مانای چی؟ سۆفی نامیق لەبەر پەرۆش و پەژارەی خۆی تێنەگەیشت مەلا جەلال مەبەستی چییە؟

گوتی: مامۆستا، زوو زوو گەنج بووم. ئەوسا گەرمیان و کێوسانمان ئەکرد، هاوینان ئەڕۆیشتینە سەرشو سەقز، کاورایێ سەقزی بوو ناوی لالۆ هەواس بوو، ئاشنامان بوو، مامەڵەمان لەتەکیا ئەکرد. ڕۆژێ هاتە وارگەکەمان ڕۆن و خوریی لێمان کڕی. سۆزی ڕۆن و خوریەکەم بۆ بردە سەقز و میوان بووم. شەو خێزانەکەی سینی بۆ هاوردین، گۆشتاوی لێنابوو، نانمان لێوڵی، کتکە بۆر پەیابوو. دەستی کرد بە میاومیاو. خاوەن ماڵەکە پاروویەکی بۆ هاویشت، گورج قۆستیەوە و، دیسان: میاو! پاروویەکی تری هاویشت، کتکە بۆر ئەمیشی قۆستەوە و دیسان میاو! ئەوەندەی پاروی بۆ هاویشت، وازی لە میاومیاو نەهێنا و نەیهێشت نانەکەمان بخۆین. لالۆ هەواس سینییەکەی هەڵگرت و نایە بەردەمی کتکە بۆر و گوتی:

–کەواسە، تۆ فەرموو، ئێمە: میاو! سۆفی نامیق دەستی شێخی ماچ کرد و ڕۆیشت. بە دەم ڕێگەوە دەیگوت.

–هەزار قەزا و قەدەر بێ، پەمگی خۆمی نادەمێ..

مەلا جەلال لای وابوو سۆفی نامیق شتێکی بۆ شێخ هێناوە، بە دەرفەتی زانی و گوتی:

–قوربان! شەکر و چامان نەماوە. مانگانەکەمان پێ کەرەم نافەرمووی؟

شێخ خۆی لە قسەی مەلا جەلالیش گێل کرد و گوتی:

–زۆراوبەگ هەقیەتی. بڕوانە، ئەم خەڵکە دەڵێی شەیتان دەرسی داداون، قسەیان چەند ڕەق و ناخۆش بووە. ئاخرزەمانە، خوا ڕەحم بە ئیمانەکەمان بکات.

## سەرفیترە

حاجی عەلی دەوڵەمەندێکی قورس بوو، بازاڕی ئەوەندە گەرم بوو، نەیدەپرژا سەری خۆی بخورێنێ، کاری بەوە باش بوو کە وەکو بەزاز و چەقاڵ و وردەفرۆش نەبوو، ئەگینا هەر فریانەدەکەوت. ئێساش کە بە تاو لینگە بار شتی دەفرۆشت بە تەنیا پێڕانەدەگەیشت. میرزا ساڵحی خزمی خۆی مانگی بە حەوت دینار و نیو گرتبوو کە دەفتەریشی بۆ بگرێ، هاتوچووی بانکی بۆ بکا، پارەی لای بەقاڵ و بەزازەکانیشی بۆ کۆکاتەوە.

حاجی هەرچەند سەری زۆر قاڵ بوو، بەڵام خوا هەڵناگرێ لەگەڵ ئەوەش سەری بچوایە نوێژی نەدەچوو. ڕۆژووی ڕەمەزانیش ئەوا هیچ. پیاوێکی وریا و عاقڵ بوو، حیسابی دنیا و قیامەتی خۆی باش دەزانی. زۆر چاك لێکی دابۆوە: ڕەمەزان هەم زیارەتە و هەم تیجارەت. خواشی لێ ڕازی دەبێ و ژەمی سی نیوەڕۆش دەگەڕێتەوە. خوا نەکا دوور لە گیانی حاجی، خۆ قسە لەوە نییە پیاو هەر دەبێ ڕووت و نەدار بێ تا دەس پێوە بگرێ. پیاوەکە بازرگان بوو، ئەهلی بازاڕ بوو. بازاڕیش جێگای دەفتەر و حیسابە. سەرمایە هەرچەندە زۆریش بێ، کە لێکی دەیتەوە هەر فلس فلسە کەوتۆتە سەریەك. هەموو فلسێك لە دەفتەردا جێگای خۆی هەیە. بۆ ماڵی حاجی بەو مەخاریج و دەرچوونە زۆرەوە، سی نیوەڕۆژە بە لانی کەمەوە دەیکردە پازدە دینار. ئەمە پارەیەکی کەم نەبوو، کرێی دوو مانگی میرزا ساڵحی لەکۆڵ دەکەوت، یا دەیتوانی پێنج شەش جار بۆ سەودا و مامڵە پێی بچێتە بەغدا. بە کورتی ڕۆژووی ڕەمەزان لە هەموو بارێکەوە بە قازانج تەواو دەبوو.

حاجی مانگی ڕەمەزانی بە ڕێکوپێکی گرتبوو. "تەراویح"ی شەوەکانیش سەرباری. لە مەلای بیستبوو هەرکەس شوکرانەبژێر بێ، خوا بۆی زیاد دەکات. جا بۆیە هەموو شەوێ بە دەم تەراویحەکەوە ئەوەندەی زمانی هێزی تێدابوو شوکری خوای دەکرد، خواش لێی قبووڵ کردبوو، ڕۆژبەڕۆژ بەسەریدا ڕشتبوو.

ئێوارەی ڕۆژی 28ی ڕەمەزان حاجی لە مزگەوت نوێژی شێوانی بە جەماعەت کرد و بە دەم ڕێگاوە وردە دوعاکانی خوێند. کە گەیشتە ماڵەوە، دەمی لە ئاخرین دوعا بەتاڵ بوو، بیسمیللایەکی کرد و دەستی کرد بە بەربانگ کردنەوە,. نۆشی گیانی بێ بەروبووی ڕەنجی شانی خۆیەتی وەکو (سوننەتە) لە شیرینەوە پاقلاوەی بەنیوەجواوی قووتدا و ڕیزی لێگرت سێ چوار شیلەی پاقلاوە بە گەروویەوە لکاو هەناسەی سوار بوو. بە پەرداخێك ماستاو شۆردییەوە و کۆکەیەکیشی بەدوادا کرد. ڕێگا بۆ خواردنی

دیکه به تەواوی کرایەوە، پەلاماری دەوریی قبوولّیی دا، قبوولّییەکه به یارمەتیی بامیه و گۆشت، باشتر خۆی کۆدەکردەوە و، به ڕەحەتی بەناو پەرژینی ڕیش و سمێڵدا خۆی دەکرد به دەمی حاجیدا و ئاوای ئەودیو دەبوو.

ناوبەناو پەرداخێك ماستاوی دەخواردەوە، (دوور لە حاجی و بەربانگەکە) شفتەیەکیشی دەکردە مەزەی. وەکو وەرزێرێکی لێزان بژارێکی باشی سینییەکەی کرد. دەستێکی بە ڕیشیدا هێنا. ئەلحەمدولیلا، خوایه شوکری تۆ. ڕوویکردە خێزانی:

–ئا خێراکه چایەکم بۆ تێکه، با فریای جەماعەت تەراویحەکه بکەوم.

حاجی ژن– هێشتا سەرپۆشی نوێژی شێوانی بەسەرەوە بوو– پیاڵەیەك چای بۆ حاجی هێنا:

–حاجی! ئەرێ سەرفیترەت قەبلاندووە؟

–یا ڕەبی خوا جەزای بەخێرت بداتەوە ئافرەت! چا بوو وەبیرت خستمەوە. هاوار بەماڵم! شەیتانی مەلعوون بە هەموو فێڵێك خەریکه ڕەنج بەخەسارمان کا. وەختابوو نوێژ و ڕۆژووەکەمان بە خۆڕایی بچێ. دەڵێی چی با سەرفیترەکه بدەین بە میرزا.

حاجی ژن: میرزا ساڵح پیاوی خۆتە. جگە لەوە مەعاشیشی هەیە. لە کوێ سەرفیترەی پێ دەشێ؟

حاجی: قوڕبەسەرە ژنێك و سێ منداڵی هەیە، بۆچی پێی ناشێ. چەند شەو لەمەپێش مەلا لە مزگەوت دەیگوت خێر و حەسەنەت بۆ خزم باشه. میرزا ساڵح خزمی خۆشمانە.

حاجی ژن: دەیجا یەك دوو دیناری جێژنانە بدەرێ، هەم خێرە و هەم پیاوەتی. سەفیترەکەش بدە بە مستەحەقێك.

حاجی: تۆ بەم دەسبڵاوییە لە جێگای من بوایەی، نە من دەبووم بە حاجی عەلی، نە تۆش بە حاجی ژن. من هەمیشە میرزا ساڵحم لەبیر بووە. چاکەشم لەگەڵ کردووە. دەڵێم ئەمەشی لە زیادی بدەینێ.

حاجی ژن: باشە، وابکە، من مانیعی خێری تۆ نابم.

حاجی: ڕوویکردە کوڕە گەورەکەی –ئەوڕەحمان ئا ڕاکە، میرزا ساڵح بانگ کە..

میرزا ساڵح هات، بە دەنگێکی نیوەنووساوی خەفەتاوییەوە سڵاوێکی کرد و لای خوارەوە دانیشت.

حاجی کە لەبەر جەماعەتەکەی بە پەلە بوو، لە لایەك ڕوویکردە میرزا ساڵح و گوتی دەمەوێ سەرفیترەکەی ئەمساڵ بدەم بە تۆ، لە لایەکی دیکەشەوە بانگی کردە حاجی ژن:

–فاتێ، ئا خێراکە، نێزیکەی دوو هۆقە گەنم بێنە.

حاجی ژن: گەنممان نییە. هەر برنج لەماڵەوە هەیە، برنج دەبێ؟

حاجی: فەرقی چییە؟ ئەویش زەوادە. خێراکە. دوو قۆتە برنج بێنە!

میرزا ساڵح: ناعیلاج نەبوومایە وەرم نەدەگرت. پیاو کە ناچار بوو خێر و سەدەقەش قبوولّ دەکا!

حاجی: دوور لە تۆ، میرزا، تۆ خوێندەواری، شتی وا مەڵێ. عیلاجی چی؟ ساغ و سەلیمی، مانگی حەوت دینار و نیو مەعاشتە. شوکری خوا بکە. برینجیان هێنا. حاجی میرزا ساڵحی بانگ کردە پێشەوە:

–ئەوا ئەو برینجەم دا بە تۆ لە سەرفیترەی ئەمساڵدا کە خوا لەسەر منی فەرزکردووە. میرزا ساڵح گوتی: ئەوا قبووڵم کردو دامەوە بە خۆت بە قەرز. برنجەکە حەوت جار لە سەرفیترەی حاجی و حاجی ژن و سێ کوڕەکە و دوو کچەکەیان لە بەینی حاجی و میرزادا دەستاودەستی کرد.

حاجی هەستا بڕوا بۆ جەماعەت، بەسەر پێوە گوتی:

سەرفیترە بە زیادەوەی دانێی باشترە. بۆ میرزا ساڵحیش بە زایە ناچێ. دایدەنێین هەر سەرەی بە ڕوبعێك، دەکاتە دوو دینار چارەکێ کەم. حاجی چوو بۆ جەماعەت. میرزا ساڵح خەریکبوو بڕوا. حاجی ژن بە زۆر گێڕایەوە و چایەکی بۆ تێکرد. حاجی ژن ئەحواڵی منداڵەکانی میرزا ساڵحی دەپرسی. میرزا ساڵح شاش و واش وەڵامی حاجی ژنی دەداوە. زیاتر بیری لە پارەی سەرفیترەکە دەکردەوە: چۆنی خەرج کات بەشی کاسەجێژنەش بکا و جێژنانەیەکیش بۆ ژنەکەی و منداڵەکانی بکڕێ. چایەکەی خواردەوە، ماڵاوایی کرد و ڕۆیشت.

بەیانی میرزا ساڵح وەکو هەموو خەڵکی بازاڕ دەڵێن (محەلەکەی) کردەوە. گەسکی داو دەفتەر و شتی خۆی ئامادەکرد و دانیشت. تاوێکی پێچوو، حاجی پەیدابوو.

حاحجی: میرزا، تا زووە و سەرمان قاڵ نەبووە، دەست دەرە قەڵەمەکەت با حیسابی خۆمان بکەین.

میرزا: حیسابی چی؟

–چۆن حیسابی چی؟ تۆ دوو دینار چارەکێ کەمت لای من هەیە.

–باشە، ئیتر ئەمە حیسابی دەوێ؟

–تۆ دەڵێی ئەمڕۆ هاتوویتە بازاڕز چۆن حیسابی ناوێ؟ هەموو شتێك حیسابی دەوێ. برامان برایی، کیسەمان جیایی.

میرزا: باشە، دەی فەرموو. ئەمە قەڵەم و کاغەز.

حاجی: بنووسە دوو دینار چارەکێ کەم.

میرزا: ئەوا نووسیم.

حاجی: دەی من چین لای تۆ هەیە؟

میرزا: وەڵڵا نازانم. لە بیرم نییە تۆ هیچت بەلای منەوە بێ.

حاجی: تۆ لە بیرت نییە، من لە بیرمە. زستانێ قۆندەرەکانت دڕابوو. دووکانەکەت پیس دەکرد، جووتێ قۆندەرەم دایەی. قەیناکا، با لەبەر تۆ بە دینارێکی دانێین. بنووسە دینارێك.

میرزا: بۆچی به چەندت کڕیبوو، وا به کۆنیش به دینارێکی لەسەر من حیساب دەکەی؟

حاجی: کاکی خۆم تۆ ئەهلی بازاڕی. له بازاڕ قسه لەوه نییه به چەنده کڕاوه، قسه له نرخی ڕۆژه. کۆنی چی و شتی چی! تاقه زستانێك له پێم کردبوو. هێشتا تازه و نوێ بوو.

میرزا: ده باشه، ئەوا نووسیم دینارێك.

حاجی: ئەو ڕۆژه حاجی فەتحوڵڵای پێنجوێنی سندووقه چاکەی لێکڕین، چارەکێ چای نموونەت ڕشت. ئەویش سێسەد فلس.

میرزا: چارەکه چایەکەم کۆکردەوه و کردمه سندووقێکی.

حاجی: کۆکردنەوەی چی؟ نەختێکت کۆکردەوه. ئەوەکەی دیکەی تێکەڵ خاك و خۆڵ بوو، گەسکت لێدا. قەیناکا بنووسه دووسەد فلس.

میرزا: دەی باشه، ئەم دینارێك و دووسەد فلس.

حاجی: تەختەی دوو سندووقه قۆندەرەت بردەوه کورسی پێ دروست کەی. ئەویش یەکی نیو دینار. بنووسه دینارێك.

میرزا: تۆ دەڵێی بەنرخی ڕۆژ. ئێستا تەختەی سندووقه قۆندەره چەند دەکات؟

حاجی: ئەوسا زستان بوو زیاتریشی دەکرد.باشه بەنرخی ئەمڕۆکەی دادەنێین. بنووسه هەشت سەد فلس. ئەمه بووه دوو دیناری تەواو.

میرزا: بەڵی تەواوه.

حاجی: تۆ دینارێك و حەوت سەد و پەنجا فلس پارەی سەرفیترەت لای من هەیه، ئەوه له دوو دینارەکه دەرکه. تۆ ڕووبعێکت دەکەوێته سەر. ئەویش جێژنانەی ئەم جێژنەت بێ. ئیتر بێ حیساب.

میرزا (به زەردەخەنەیەکەوه): جا بۆچی بەو ڕووبعه دیناره سەرفیترەی ساڵێکی دیکەم لێ سەلەم ناکەی؟

حاجی: حیسابی ساڵێکی دیکه وەختی خۆی دەکەین. ئێستا چۆن بێ جێژنانه و به دەستی بەتاڵ دێڵم له مەحەل دەردەکەوی؟

## کەشکۆڵی جادوویی

وەیسە و ناسکۆڵ تاقانەی دایك و باوکی خۆیان بوون و، به نازداری پەروەردە کرابوون. یارە و، پیرۆتی باوکیان، برایەتییان خۆش بوو. چەندیهای چەند ساڵ بوو دڵی یەکتریان نەیەشاندبوو، لەسەر ماڵ مابوونەوه و به برابەشی ڕایان دەبوارد. ڕان و پاتاڵیان بوو. له زەوی و زاری فەرەیدوون بەگدا دەیانلەوەڕاند و بژێوی خۆیان پەیدا دەکرد. هەرچەند دەوڵەمەند نەبوون، بەڵام سەبارەت بەوه که هێدی و هێمن و بێوەی بوون، خەڵکی ئاوایی خۆشیان دەویستن.

وەیسە و ناسکۆڵ که جووته منداڵی ماڵ بوون، هۆگری یەکتر بوون و له یەك جیانەدەبوونەوه. به یەکەوه چوونه مەزرا بۆ لای باوکیان و به یەکەوه دەهاتنەوه ماڵ بۆ لای دایکیان. به یەکەوه لەگەڵ بەرخۆلەکان یارییان دەکرد.

ساڵ و مانگ به دوای یەکدا تێدەپەڕین و وەیسە و ناسکۆڵیش بەخۆدا دەهاتن و گەوره بوون. تا گەورەتر دەبوون خۆشەویستییان پتەوتر و هاواڵەتییان گەرمتر دەبوو.

ڕۆژێ له ڕۆژان یارە و پیرۆت به یەکەوه دانیشتبوون باسی حاڵ و باڵی خۆیان دەکرد. یارەی باوکی وەیسە به پیرۆتی گوت: ئێمه چەند ساڵه برایەتی خۆمان ڕاگرتووه و به تەبایی و سەرودڵ خۆشی ڕامان بواردووه. ئێستاش با کارێکی وا بکەین منداڵەکانیشمان وەکو خۆمان بن و له یەك جیانەبنەوه. خۆت دەزانی له منداڵییەوه به یەکەوه گەوره بوون و زۆر هۆگری یەکترن.

پیرۆت گوتی: یارە، من هەرگیز نابمه دڕکی مەم و زین و ئۆباڵی وەیسە و ناسکۆڵ ناهێنمه ئەستۆی خۆم. براله، منیش دەزانم پاروو له دەم بکەوێته خوارێ بۆ کۆش باشه. ئێمه که براین، دیاره کچی منیش بۆ کوڕی تۆ چاکه. به بێ ئەوەی تۆ بڵێی من خۆم ئەمەم هەر له دڵدا بوو.

شەوێك مەلای ئاوایی و دوو سێ کەس له دەر و دراوسێی خۆیان بانگ کرد و ناسکۆڵیان له وەیسە مارەبڕی. مەلا به چاکەی یارەو پیرۆتا هاته خوارێ و پیرۆزبایی ئەو کاره چاکەی کرد. یاره به هێواشێك دەستی بۆ لای مەلا درێژ کرد و دوو دیناری مارەبڕانه دا به مامۆستا. مەلا سەرلەنوێ دەستی کردەوه به پیرۆزبایی و دوعای خێر و پاشان هەڵستان و ڕۆیشتن.

وەیسە و ناسکۆڵ ئیتر له دوو منداڵی ماڵ و دوو هاواڵی خۆشەویستەوه بوونه دەزگیرانی یەکتر و شەرمیان دەکرد و وەك جاران به یەکەوه نەدەگەڕان. بەڵام تا دەهات عەشق و ئەوین له دڵیاندا زیاتر تین و تاوی دەساند.

پایز که خوری و ڕۆن و شەك و کاوڕیان فرۆشت، کەوتنه سەروکاری زەماوەندی ناسکۆڵ و وەیسە. جگه له خەڵکی ئاوایی له کەسوکاری خۆشیان گێڕاوه و سێ ڕۆژ شاییان کرد و به تەقەی دەهۆڵ و زوڕنا داوەتیان گێڕا، کچ و کوڕ و ژن و پیاوی ئاوایی به چەپی و ڕۆینەو سوێسکەیی و شێخانی هەڵدەپەڕین. یاره دەستپێشکەریی خۆی کرد نەیهێشت گزیر بێته سەری ده دیناری سوورانه بۆ فەرەیدوون بەگ برد و دوو دیناریشی شیرنی دا به کوێخا و کاوڕێکیشی پێشکەشی ئاغاژن کرد.

دوو سێ ساڵێك بەسەر زەماوەندی وەیسە و ناسکۆڵدا ڕابوورد. ساڵێك دەرد کەوته ناو ڕانەکەیان و بەرودوای کوشت. چەند سەرێکیشی که له چنگ دەرد ڕزگاری بوو، ناچار فرۆشتیان و دایان به نان و ئیتر به یەکجاری پەکیان کەوت. دەبوو به ڕەنجبەری و

سەپانیی خەڵك بژێوی خۆیان پەیداکەن، وەك جاران دەستیان نەدەڕۆیشت بێگارانە بدەن، ناچار بوون خۆیان بچنە بێگاری ئاغا.

جارێك گزیر هات و دەنگی دان بۆ بێگار. پیرۆت گوتی: من دەچم. یارە نەیهێشت و گوتی: تۆ لە من پیر تری و برا گەورەی، تا من ماوم ناهێڵم لەگەڵ منداڵ و مەزنا بچی بۆ بێگار. وەیسەش ڕەنجبەری خەڵکە، من خۆم دەچم. یارە نان و شەکر و چاو قۆری و پیاڵەی خستە تۆشەبەرەیەکەوە و کڵاشەکانی کردە پێی و دەستی دا داس و کەوتە دوای گزیر. کاتێ گەیشتە نازو بێگارچییەکان و دیتی هەموو هەرزەکار و کوڕوکاڵن و کەسی لە تەمەنی ئەویان تێدا نییە، زۆر بەزەییی بە خۆیاندا هات و لە دڵی خۆیدا وتووێرەی ئەوەی دەکرد: کە ئەگەر نەهاتی سواری شانیان نەبوایە و هەژار نەکەوتنایە، یان بێگارانەیان ئەدا، یا دەیتوانی وەیسە بنێرێت. هەرچۆنێك بوو کەوتنە بەندەن و ڕوویان کردە کەماجاڕی فەرەیدوون بەگ.

کەماجەڕەکە بە هەورازێکی زۆر سەخت و کووڕ و تەلانێکی ڕژد و بەردەلانەوە بوو. لای خوارووشیان هەڵدێر و زەرد و ماه بوو. بەریان لە کەماکەندن گرت. یارە کەوتبووە لای ڕەوەزە بەردێکەوە و جگە لە ماندوویی و شەکەتی وتووێرەش زۆری بۆ دەهێنا و دڵتەنگی دەکرد. کوڕوکاڵ دەنگی یەکتریان دەدا وەك گرەوەکاری دەیانویست لە یەکتر پێشکەون. یارەی هەژار پیرۆ و بێهێز بوو، لەگەڵیان دەرنەئەچوو. لە لایەکیشەوە لەوە دەترسا کە سەرکارەکەیان قسەیەکی سووکی پێ بڵێ، ناچار ئەویش کەوتبووە پەلە و تەکانی دەدا. چاویشی کز و پڕووش بوو، باش ڕێی بەدی نەکرد. لە نەکاو لە ڕەوەزە بەردەکە قاچی خلیسکا و هەڵدێرا. کاتێك چوونە سەری بێهۆش کەوتبوو. ئێوارە بە دارەتەرم بدریانەوە ماڵەوە. یارەی بەدبەخت پشتی شکابوو.

چەند ڕۆژێك بە ئێش و ئازارەوە ژیاو مرد. خەڵکی ئاوایی و سەرەخۆشی کەری دێهاتی دەوروبەر، سەریان تێکردن. "شین و شایی دەستەوایە". ئەمڕۆ لەمانە، سبەینێش لەوان. ئەبێ پیاو بە تەنگ خزم و هاوماڵەوە بێت.

چەك و پووشێکی بووشیان لە پرسەدا ڕۆیشت. ئەمجار پیرۆتیش هەرچەند وەیسە تەقەلای دەدا نەهێڵێ کاربکا، کەڵکی نەدەگرت و بەو پیرییەوە تەکانی لە خۆی دەدوا ئیشی دەکرد، تا ئەویش لە خەم و خەفەتی براکەی و بێ خۆراکی و کەم حەسانەوەیی، ئاخری نەخۆش کەوت و چەند ڕۆژێك لەسەر جێگا بوو، ئەوەندەی (خێر و سەدەقە)یان بۆ بەخشییەوە، نووشتە و دوعایان بۆ کرد سوودی نەدا و لە دنیا دەرچوو..

وەیسە بە تاقی تەنیا مایەوە. دەبوو ئەرکی ئاغاش بگرێتە ئەستۆی و ناسکۆڵ و دایکی و خەسووشی بەخێو کا. ئەم قوربەسەرە هەر کردەی ئەو بوو و بردەی شەیتان. تا نانی پەیدا دەکرد، شەکر و چا نەبوو. تا چەوری و پەرەچێشتی دەس ئەخست، جلوبەرگ نەبوو. سەری لێشێوا. خۆشی نەیدەزانی چ بکا.. ئەمانەش گشتی لەوێ بوەستێ. هەر تاوناتاوێکیش دەنگیان دەدا بۆ بێگار و هەرەوەز. وەیسە بۆ ئەوەی لە بێگار تەرخان بێ، قەدپاڵێکی خوایی لە فەرەیدوون بەگ مەختە گرت کە بنێشتی لێ بکات.

ڕۆژانە بەو لێڕەوا رو نزارە چڕوپڕەدا دەگەڕا و دارەبەنی دەدۆزییەوە، لەلەی دەکردن و کۆچەڵەی بە بەرەوە دەنان بۆ بنێشت. دارستانەکە هێجگار پڕ بوو. هەمیشە مەترسیی ورچ و پڵینگ و دڕندەی تری پێ دەکرا. یەکێکی وەك وەیسە بێ بژێو و داماو نەبوایە کەمتر دەیوێرا ڕوی تێکا. دارەبەنەکان ئەستێور بوون و بنێشتێکی زۆریان دەردەدا. وەیسە کە دەیدی کۆچەڵەکان زوو پڕدەبن، هەروا زۆر دڵی خۆش ببوو. هیوایەکی باشی بە بەربووی کارەکەی پەیدا کردبوو.

ڕۆژێك ئیشوکاری خۆی خێرا تەواو کرد. بە ئارەزوو بە لێڕەوارەکەدا دەگەڕا، بە نیازی ئەوە بەڵکو کانی ئاوێك بدۆزێتەوە لە کوندەئاو گێڕان ڕزگاری بێ. بە کەژەکەدا فرە هەڵگەڕا و تەواو لە ڕێباز و ئاوەدانی دوورکەوتبوەوە. نزار لەوێ زۆر پڕ و داری تەنبوو ئەستوور و کۆنەساڵی فرە بوو. لە شیوەڵێکدا پنگەل و زەل و قەرەم دیاریدا. بەرداو بەردو بنداره و بندار بۆی چوو تا گەیشتە پێشەوە. تەماشای کرد ئاوێکی کەمە لە سەرەوە دێتە خوارێ. زانی کە دوور یا نزیك کوێرە کانییەك لەو ناوەدا هەیە. بەرەو ژوور هەڵکشا تا گەیشتە بن داربەڕوویەکی زۆر ئەستوور و کۆنەساڵ کە بە لك و پۆپی خۆی سێبەری لە مەودایەکی هەراو کردبوو. ڕابواردنی ساڵانی زۆر شوێنان کردبووە دڵی پیرەدار و کلۆرێکی گەورەی تێکەوتبوو. لە بن داربەڕووەکە کانییەکی بچووکی لێبوو، بەڵام تا بڵێی ئاوەکەی ڕوون و سارد بوو. لێیدانیشت و نەختێ بەری کانییەکەی خاوێن کردەوە و دەست و دەموچاوی شوشت و دوو سێ مستی ئاو خواردەوە و لە حاستی خۆی پاڵیدا بە بەردێکەوە، تۆزێ بحەسێتەوە. کە سەری هەڵبڕی تەماشای کرد ئەوا سپیاڵێك و هێندێ کەلوپەل لە بەرامبەریەوە لەناو کلۆری دارەکەدا دیارە. گوتی: ڕەنگە ئەوانەش هینی چارەڕەشێکی وەك من بن، وا چاکە چاوەڕوانی بکەم تا دێتەوە. هەر باشە لەم نزارە بەسامەدا هاواڵێکم بۆ پەیدا بووە. ماوەیەك چاوەڕوانی کرد لە لابەلای دارەکانەوە کابرایەکی ڕیش سپیی ناوچاوان پاك دیاریدا، وردە وردە هاتە پێشەوە. وەیسە لەبەری هەستاو سڵاوی لێکرد. ئەویش زۆر بە ڕووخۆشییەوە وەڵامی دایەوە و چاك و خۆشی لەگەڵ کرد. وەیسە پرسیی: مامە گیان! ناوت چییە؟ مامەی پیرە گوتی: ئینسان.

وەیسە ئەم ناوەی بەلاوە سەمەرە بوو. ئیتر نەیویست لێی بپرسێ کێیە و چ کارەیە و بۆچ لەوێیە. بە دەرفەتی زانی و لە دڵی

خۆیدا گوتی هەرچییەك بێیا پیاوچاکە یان بە لانی کەمەوە دنیادیتووە و بەرژەوەندی زۆرە. وا باشە چارەڕەشیی خۆمی بۆ بگێڕمەوە و تەگبیرێکی پێ بکەم.



که باسی شپرزەیی خۆی بۆ کرد، لالۆی پیره بەزەیی پێدا هات و بزەیەکی هاتێ و گوتی: هەروا نابێ، بەڵام درەنگ و زوویی کەتووە. بەهەر جۆر من دوو کەشکۆڵم هەیە بەشیان دەکەین، یەکیان بۆ من ئەوی تریشیان بۆ تۆ. وەیسە زۆری سوپاس کرد و لە دڵی خۆیدا

گوتی ئەمیش هەر باشە کەڵکی شتێك دەگرێ. کە لالۆی پیرە کەشکۆڵەکەی لە کەلوپەلەکەی دەرهێنا و دایە دەستی، تەماشای کرد شتێکی زۆر جوانە و باش نەخشاوە و کەندەکارییەکی نایابی لێکراوە. دەرخۆنەیەکی کپی بەسەرەوەیە ئەگەر شتی تێکرێ تەپوتۆزی لێ نانیشێ. ئەمجار بە خەیاڵ شتی بۆ دەدۆزییەوە تێیکا. ئاخری گوتی بۆ شەکر و چا باشە.

کەشکۆڵی وەرگرت و گەلێك سوپاس و ماڵئاوایی لالۆی پیرەی کرد و گەڕایەوە. کە لێی وردبۆوە وەك شتێکی لێ نووسرابێ وابوو، بەڵام نەیدەزانی بیخوێنێتەوە. بەینێك ڕۆیشت، برسیی بوو، گوتی خۆزگە ئەو کەشکۆڵە ئێستە نان و پێخۆرێکی تێدا بوایە. بە دەم ڕێوە یاریی بە کەشکۆڵەکە دەکرد و سەری لابرد بزانێ چۆنە، کە تەماشای کرد نان و پەنیرێکی باشی تێدایە. تاوێك سەرسام ماو گوتی: تۆ بڵێی ئەمە وەك هەمانەبۆر نەبێ یا کەشکۆڵێکی جادوویی بێ هەرچی پیاو ئارەزوو بکا تێیدا بێ؟ نان و پەنیرەکەی خوارد و گوتی: خۆزگە پڕبوایە لە ئاوی سارد. کە دەرخۆنەکەی لابرد پڕبوو لە ئاوی سارد. تێریشی ئاو خواردەوە. ئەمجار وتی خۆزگە سێ چوار پیاڵە چاشی تێدا بوایە. دیسان کە دەرخۆنەکەی لابرد چاشی تێدابوو.

وەیسە لە خۆشییان هەر ئەوەندە بوو باڵی نەدەگرتەوە. وتی: ئیتر دەحەسێمەوە. ئیتر ناسکۆڵ و دایکم و خەسووم برسیایەتی ناکێشن. ئیتر گرانی و هەرزانی نازانم. ئیتر لە نانی گاڵ و پووە[1] خواردن ڕزگارمان دەبێ. بەرەوماڵ کەوتەڕێ. تا زووتر خێزانەکەی تێرکاو تامەزرۆییان بشکێنێ. لە خۆشییان و پەلەپەلییان ئاگای لە دەوەن و پنچك و بەرد و دار و دڕك و داڵ نەبوو هەروا سەر دەپەڕی. هێندێ جار گۆرانیی دەگوت. هێندێ جاریش لە کەشکۆڵەکە وردئەبۆوە و قاقا پێدەکەنێ. هەر دوو هەنگاوی دەکردە هەنگاوێك و خێرا دەهات تا لە دێ نێزیك بۆوە.

قەڵای فەرەیدوون بەگ لە ژوور ئاواییەوە بە جێگایەکی بەرزەوە بوو. پەنجەرەکانی دیوەخانەکەی دیانڕوانییە هەموو ئاوایی و ماڵبەماڵی لێوە دیاربوو. فەرەیدوون بەگ هەمیشە لە سەرووی دیوەخانەکە لە بەر پەنجەرەیەك دادەنیشت و سەرنجی خەڵکی ئاوایی و کار و کردەوەیانی دەدا.

وەیسە گەیشتە قەراخ ئاوایی و فەرەیدوون بەگ چاوی پێکەوت. لە خێرا ڕۆیشتنی وەیسە و بە زوو هاتنەوەی هەستی بێدار بوو. هەنگاو بە هەنگاو بەر سەرنجی دا. بە نێزێکتر بۆوە تەماشی کرد لە خۆشییان دەموچاوی پێدەکەنێ و شتێکیشی توند گرتۆتە بن باخەڵی. فەرەیدوون بەگ گوتی: ببێ و نەبێ ئەم خۆشییەی وەیسە سەبارەت بەو شتەیە لە بن باخەڵیدایە. کە لە دیوەخان نێزیك بۆوە، فەرەیدوون بەگ بانگی کرد: ئا وەیسە وەرە ئێرە. وەیسە لە ترسان نەیوێرا وەڵامی نەداتەوە. ناچار چووە دیوەخانە. فەرەیدوون بەگ

وتی: ئەوە چییە بە بن باخەڵتەوە؟ وەیسە گوتی: هیچ نییە، کەشکۆڵێکی دەروێشییە. فەرەیدوون بەگ کەشکۆڵی لێ وەرگرت و تەماشای کرد نەخش و نیگارێکی سەیری لێکرابوو. کە سەرنجی ئەولاکەیدا بە خەتێکی جوان لێی نووسرابوو "کشتوکاڵ". تێگەیشت کە چەندە هێژاو بە نرخە. گوتی: ئەمە بۆ من چاکە. تۆ کابرایەکی وەرزێر و بۆرە پیاوێکی بێسەروپێی، شایانی تۆ نییە. ئەوەندەی وەیسە پاڕاوە و لاڵاوەە سوودی نەبوو، بە پاڵەپەستۆ کردیانە دەرەوە. فەرەیدوون بەگ ئیتر خەو و خواردنی لێهەڵگیرا، هەمیشە خەریکی کەشکۆڵی تاین بوو، ئەوەندەی خەلە و چەڵتووك و تووتن و پەمۆ و نیسك و نۆك و دانەوێڵەی تر لێ پەیداکردبوو ماڵەکەی وەك هەڕاجە بازاڕ هەمیشە پڕ بوو لە بازرگان و چەرچی. دارایی و سامانێکی زۆر و زەوەندی پێکەوە ناو قەڵاکەی لەبەر کارەکەر و خزمەتکاری زۆر و زرەزرەی ڕادیۆ و بریسکە بریسکی کارەبا و ورەوڕی ترۆمبێل و چزوهووڕی چێشتخانە و زرینگەزرینگی بوتڵ و پێك هەر دەتگوت کابارەی شارە گەورەکانە.

وەیسەی چارەڕەش لە تاوی کەشکۆڵەکەی ئاگای لە بنێشت کردن بڕا و بندارە و بندار بە دوای لالۆی پیرەدا ئەگەڕا.

سەرکانییەکەی کردبووە وارگەی بەیانی و ئێواریێ، بەڵاك بۆ نەگبەتی بە هیچ جۆرێك ئاسەوارێکی لە لالۆی پیرە بەدی نەکرد. ماوەیەکی زۆری بەم چاوەڕوانییەوە ڕابوارد، هیچ سوودی نەبوو. ئەمجار بیرێکی لە حاڵی خۆی کردەوە و گوتی: من تازە خەریکی چین، پاش ئەوەی نەمفامی و کەشکۆڵەکەم لە کیس خۆم دا، لە بنێشت کردنەکە بۆ وازبێنم. ئەدی دوو ڕۆژی تر خێزانەکەم بەچی بەخێو کەم، پارەی مەختەکەی بەگ چۆن بدەم؟

وەیسە کە لەسەر کانییەکە ئەم بیرانەی دەکردەوە، تۆزێك هۆشی هاتەوە بەرو دەموچاوی شۆرد و نەختێ ئاوی خواردەوە و بە داخێکەوە سەرنجێکی جێگای لالۆی پیرەی دا چۆڵ و هۆڵ بوو. هەستاو بە هەناسەساردی گەڕایەوە سەر ئێش و کارەکەی، بنێشتی کۆکردەوە و کردیە مەشقاڵە و بردییە شار فرۆشتی. کە پارەکەی وەرگرت و لێکی دایەوە، هەر ئەوەندە بوو لە جیاتی مەحتە بیدا بە فەرەیدوون بەگ، لە تاوان ئەژنۆی شکاو گوتی: ئەو زستانە خێزانەکەم لە برسان دەمرن. پارەکەی نا باخەڵ و بە شپرزەیی لە شار دەرکەوت. لە قەراخ شار خانویەکی گەورەی تازە دروست دەکرا. وەیسە لە دیاری وێستا و سەیری کرێکار و وەستا و ئیشەکەیانی دەکرد و لە دڵی خۆیدا دەیگوت ئەگەر بمگرن بە کرێکار ماوەیەك ئیش دەکەم و شتێك بۆ خێزانەکەم کۆدەکەمەوە. وەیسە لەم بیرەدا بوو کە کابرای وەستا چاوی پێکەوت و بەناو بانگی کرد: وەیسە وەرە بۆ ئێرە. وەیسە سەری سووڕما و چووە پێشەوە. وەستا گوتی: وەیسە، ئەوە نامناسییەوە؟ وەیسە گوتی: نە بەخوا، جا من تۆم لە کوێ دیوە تا بتناسمەوە؟ وەستا گوتی: من ئەو کابرایەم کەشکۆڵەکەم دایەی. وەیسە ڕایکردە پێشەوە و دەستی کردە ملی و گوتی: تۆ ئەو وەختە لە نزار بووی و ئێستا لە شاری و بەننایەتی دەکەی. ئەمە لە کوێ بە بیری مندا دەهات؟ وەستا گوتی: ئاخر وەیسە، بەرخ هەمیشە لەژێر سەوەتەدا نابێ، ئینسان بەرەوپێش دەچێ. ئێستا حاڵت چۆنە؟

وەیسە بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕاەوە و زۆری داد و بێداد کرد لەدەست فەرەیدوون بەگ. وەستا کە جوان ببۆوە و وەك کوڕێکی قیت و قۆز دەهات و دەچوو، گوتی: وەیسە، خەمت نەبێ. کەشکۆڵەکەی کەشم بۆ هەڵگرتووی. لێرە بوەستە تا دێمەوە.

لالۆی ئینسان تاوێکی پێچوو هاتەوە کەشکۆڵەکەی دا دەست وەیسە. وەیسە وەریگرت و زۆری ماڵاویی لێ کرد و بە دڵخۆشییەوە کەوتەڕێ. ماوەیەك ڕۆیشت، لە ڕێگا ویستی تاقیکاتەوە. هەرچەند نیازی لێ گرت و تەقەلای دا دەرخۆنەکەی بۆ نەکرایەوە. ئیتر خۆی پێوە خەریك نەکرد و لە خۆشییان کارەساتی پێشووی لەبیرچۆوە، بە پەلە ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە.

گەیشتەوە ئاوایی. سەرلەنوێ فەرەیدوون بەگ چاوی پێکەوت و بانگی کرد. کە چووە دیوەخان گورج ئەم کەشکۆڵەشی لێساند. هێشتا وەیسە لەوێ وێستابوو کە فەرەیدوون بەگ وەك تەلیسمێکی بە ناوی ئەوەوە بێت دەستی دا دەرخۆنەی کەشکۆڵەکە و بۆی لابرا. بەڵام دەسبەجێ دوو مستی قورس و قایم لە کەشکۆڵ هاتنەدەرێ و ڕاست و چەپیان لە سەری فەرەیدوون بەگ گرت و لە لاجانگیان دەسرەواند. هەروا پشوویەکی پێنەچوو هێندەیان بەسەریا کێشا نزیك بوو مێشکی بە کونەلووتیدا بێتە خوارەوە. فەرەیدوون بەگ خۆی پێڕانەگیرا و لە تاوانا هاواری کردە وەیسە: کوڕە وەیسە فریام کەوە، وەیسە تۆ کوڕ و برامی، من کردم تۆ نەیکەی. جارێکە و ئەمجار، ئەمان وەیسە! دەخیل وەیسە!

وەیسە ئاهێکی هاتەوەبەر. بە کەشکۆڵی تاین پشتئەسوور بوو، گوتی: ئاغام بفەرموو کەشکۆڵەکەی ترم بۆ بێننەوە جا ڕزگارت ئەکەم.

فەرەیدوون بەگ بانگی کرد: کێ لەوێیە؟ ئا ڕاکەن کەشکۆڵەکەی بۆ بێننەوە، خێراکەن، گیانم دەرچوو، کەللەی سەرم ورد و خاش بوو. کوڕە وەیسە، من ماڵی دنیام بۆچییە؟ گیانیشم هی تۆیە! خزمەتکارێك هاتە ژوورێ و کەشکۆڵەکەی پێشووی هێنا و دایەوە دەست وەیسە. کە وەیسە کەشکۆڵەکەی وەرگرت، مستەکان لە جێگای خۆیان وێستان و لە تێسرەواندنی سەر و گوێلاکی فەرەیدوون بەگ بوونەوە. فەرەیدوون بەگ بستێ زمانی دەرکێشابوو، چاوی بە مۆڵەق وێستابوو، زرینگە زرینگ لە سەریەوە ئەهات. سەرنجێکی کەشکۆڵەکەی دا بزانێ چ جادوویەکی تێدایە وا ئەم کارەساتەی پێکرد، کە تۆزێ لێی خێس بۆوە، لێینووسرابوو: "زەوی بۆ وەرزێر و، مەرگ بۆ دەرەبەگ". ئیتر لە تاوانا وەك مار

پێوەی دا کەشکۆڵی بۆ وەیسە فڕێدا و ڕایکرد، ئەو ڕۆینەی ڕۆیشت نەگەڕایەوە. ئیتر جارێکی دیکە کشتوکاڵ لە وەرزێر و بۆرەپیاو داگیر نەکرا و هەرکەس ڕەنجی شانی خۆی هیی خۆی بوو. ئەگەر کەسێك بیویستایە زۆرداری بکا و دەسڕەنجی خەڵك داگیر کا مستەکان لای چەناگەی ئەوێستان و دەستیان دەکردەوە بە تێسرەواندنی.

وەیسەش بە تێروتەسەلی ڕایبواردو لە نانی گاڵ و پووە ڕزگاری بوو.

1–بەڕوو دەهاڕن و لەگەڵ ئاردی جۆ تێکەڵی دەکەن و دەیکەنە نان و پێی دەڵێن (نانی پووە). خەڵکی هەورامان لەبەر نەداری و پەرێشانی پتریان ئەوە دەخۆن.

## شەهیدی زوڵمە، کفن و شۆردنی ناوێ

ساڵێك لە ساڵان دێوی قات و قڕی و گرانی باڵی ڕەشی بەسەر ناوچەی (ژاوەرۆ)دا کێشا، ڕەهێڵەی پەرێشانی و پەشێوی و شپرزەیی دایکرد. وەرزێر لە کشتوکاڵی بەهاری و لە ڕپستە و ئاوەنیای پایزە، مافنگی و ڕەنجەڕۆ مایەوە، هەژار و نەدار و کز و کەنەفت کەوت و ژیانی تاڵ و ئاڵۆز بوو. سەرەڕای ئەمانەش ئەوەندەیان بردبووە گەل و هەرەوەز وەك قسەقوتان ئەڵێن "لە چوارپەلا گوێچکەی ساغ بوو". زگی برسی و پشتی بریندار و شان و شەپیلکی تێکشکابوو. کۆڵکێشانی زۆر و زەوەند هێز و توانای پێ نەهێشتبوو. برسیایەتی و بێبژێوی ڕست و دەرەتانی لێ بڕیبوو.

وەرزێر ئەوەندەی سەرنجی دا و بیری کردەوە و سەری هێنا و برد، نەیتوانی ڕێگای ڕزگاری و چاری چارەڕەشی خۆی بەدی بکا. لە لایەکەوە بێگار مەودای نەئەدا بەرژەوەندێك لە حاڵی خۆی بکات و، لە لایەکی تریشەوە ناشارەزایی و نەزانی ڕۆژی ڕووناکی لێکردبووە شەوەزەنگ.

بێبارانی و وشکەساڵ و خەلە گران بوو. بێکاری بوو. ئیش لەحاند ڕەنجبەر و ئیشکەران چووبووە پشتی شێران. ئەوەی لەو ناوەدا فرە و فراوان و کەم نرخ و هەرزان بوو، تەنیا تەرم و جەندەکی نەژاران و فڕین و پەڕەوازە و ئاوەکی بوونی گیانی وەرزێران بوو. ئاژاوە و پەشێوی بوو لەناو لەشاندا. گیانی سەربەهەش توانای مانەوەی ناو خەندەکایان نەمابوو، ناچار هەڵوەدا ئەبوون و ڕایان ئەکرد بە ئاسمانا.

هەباسی وەرزێر پێش گیان لێتۆران چشی کرد لە خاو و خێزان و سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیشت. بە دارەدارە و لارەلارەوە ڕێگای گرتەبەر، بەڵکو لە جێگایەك چارەسەری خۆی بکا. بە چنگەکڕکە و پەلەکوتە و لنگەلەرزە بە چەند کەوژ و کێو و چیاو و هەورازا هەڵگەڕا و لە چەند شیو و دۆڵ و نشێوەوە داگەڕا و، لە چەند چەم و ڕووبار پەڕییەوە تا ئاخری بەهەر مەینەتێك بوو خۆی گەیاندە شارێك لە شارە نزیکەکانی گەرمێن.

کە لە شار نزیکبۆوە شنەی هیوایەك دای لە دڵی زاماری. بە خەیاڵی خۆی لای وابوو ئیتر ئاوەدانییە و جێگای ئینسانەتی و پیاوەتی و شارستانییەتە. زگی تێر و لەشی تیمار ئەکات و کە تۆزێ بووژایەوە دەس ئەداتە کاروبارێك، خۆشی ئەژیێنێ و، پارەش بۆ خاوخێزانی ئەنێرێ و لە چنگ برسییایەتی و مردن دەریانئەهێنێ. جا بە شێنەیی ئەوانیش دێنێ و لێی دائەنیشێ. هەریەکە خەریکی ئیشوکارێك ئەبن و لە شارستانی پڕخێر و بێر و لە وڵاتی تێر و تەسەلدا ئاسوودە و دڵنیا ئەحەسێنەوە و جارێکی تر بە بیریش ناگەڕێتەوە.

وەرزێری ساویلکە و دڵپاك هەروا زوو ژینی خۆی و خێزانی لەو شارەدا سووك و ئاسان بە خەیاڵ پێکهێنا و بزەی هومێد و هیوا ئەیگرت و لەبەرخۆیەوە ئەیگوت: نەمئەزانی کوردستان ئاوایە، جێگای بەپیت و بەرەکەتی وەك ئێرەی تێدایە. نامەخوا ئەم خەڵك و مەردمە چەن تێر و پڕن، چەن پۆشتە و پەرداخ و بەهێز و گوڕن، چەن کۆك و بۆشناخن، چەن ڕەنگ و ڕوو سوور و خەریك و دەسبەکارن. ئەگەر کوردستان وا ئاوەدانە. ئەی بۆ لای ئێمە ئەوەندە کوڕ و کرێن و خاپوور و وێرانە؟ ئەبوو کە قات و قڕی و نەهاتی ڕوویکردە لایەك، لایەکی تر درێغیی لێ نەکات و یارمەتی بدات! دیسان هەر باشە دێین لێرە ئەبین تا لە سیاساڵ و نەهاتی ڕزگار ئەبین. خوا دەرەوویەکی باشی لێ کردمەوە. بە هۆی مەینەت و دەردەوە گەیاندمیە ئێرە. پیرۆ و پێشینان گوتوویانە: خوا کە بە لێزانی دەرگایەك داخات، بە میهرەبانی کەلێنێکی تر ئەکاتەوە. ئیتر شان و قۆڵم لە بێگار ئاسوودە ئەبێت و، مردووی گۆڕ و گۆڕستانیشم لە خوسەند و جمێن و جنێو ئەحەسێنەوە.

وەرزێر گەشایەوە و زۆری پێ خۆش بوو کە ڕزگاری بووە و، جەندرمە و خان و بەگ و بێگاری لە کۆڵ کەوتووە. بە دڵێکی پڕ لە ئاوات و هیواوە ڕوویکردە ناو شار و هێندێ گەڕا بە جادە و بازاڕا. شەرمی کرد داوای هیچ لە هیچ کەس بکات و لە ڕووی نەهات لە کووچە و کۆڵانان هەوڵی دوو سێ نان بدات.

بە زگی برسی و لەشی ماندوو و شەکەتەوە ڕۆیشت و ڕوویکردە مزگەوت، بەڵکو لەوێ دڵ نەمرێ، دینداری، خاوەن ئیمانێ، بە چەن فلسێ یا بە یەك دوو نانێ دەسگرۆیی بکات، تا شەو بحەسێتەوە و بەیانی خۆی گورج کا بۆ ئیشوکارێك. تەنیا ڕۆژێکی دژوارە، کە یەك دوو ژەم تێر بوو ئیتر وردە وردە ئیش ئەکات و پارەی دەس ئەکەوێت و ئەبووژێتەوە و دێتەوە دۆخی جاران (چ بکا؟ بڵێ چی؟ کار بۆ ڕەنجبەران حەسانەوەیە. پیشەی کرێکار ڕەنج و چەوسانەوەیە. کار کاڵایەکە بە بەژن و باڵای کرێکار و وەرزێران بڕاوە. ئەو ڕۆژەی بێکار نەبن خۆشی و جەژنیانە).

چوو لە هەیوانی مزگەت دانیشت و بە چاوەنوارپی ڕێکەوت کزکەی کرد. زۆری نەخایاند کابرایەکی چڵکنەی چاو مڕمۆر لە دەرگای مزگەوتەکە هاتە دەرەوە، لەم نەگبەت و چارەڕەشە هاتە بەرەوە. چڵکن بە تێخوڕینەوە گوتی: کابرا خەڵکی کوێی؟

وەرزێر بە خاو و خلیچیك و بێهێزییەوە وەڵامی دایەوە: ژا.. وە.. رۆ.

چڵکن گوتی: خێراکە هەسە بڕۆ.

وەرزێر گوتی: هیچ ئەرکێکم لەسەر تۆ نییە، بۆچی دەرم ئەکەی؟ ئێرە مزگەوتە، خانەی خوایە، جێگەی ئاوارە و هەژار و داماوانە. لە خوا ناترسی وا تێم ئەخوڕی و ئەگوڕێنیٚ بەسەرما و لەم خانەی خوایە وا بە سووکییەوە دەرم ئەنێی؟ تۆش هەروەکو من مافت پێوەیەتی، ئیتر بۆچی وازم لیٚ نایەنی تۆزیٚ بحەسێمەوە؟

چڵکن گوتی: با مجێوریش بم، پێم ناخۆش نییە و لێم لە چاو نایە کابرایەکی چارەڕەشی وەکو تۆ لێرە بێت. بەڵام لەبەر خوا ئەمەت پیٚ ئەڵێم، کەچی دیارە ناشارەزای و نازانی. قوڕبەسەر، بتبینن ئەڵێن بێگانەی و ئەتگرن. جا ئیتر ئارەزووی خۆتە.

وەرزێر گوتی: بۆچی من و تۆ هەردووکمان کورد نین؟ هەردووکان وەك یەك هاوڕەگەز و خوێن نین؟ ئێرەش هەر کوردستان نییە؟ من و ئەم خەڵکەی لە ئەم شارەدان گشتمان کورد نین و لە کوردستان نین؟ ئیتر بۆچی ئەمگرن؟ ئەم من و تۆیی و دووبەرەکییە چییە و، ئەم جیاوازی و قینەبەرییە شوورەیی نییە؟ خۆ من نەهاتووم بەشی کەس بخۆم و ببمە بار بەسەر کەسەوە. ئەمەویٚ لێرە بحاوێمەوە و بە ڕەنجی شان و کرێی دەستی خۆم بژیم. ئیتر سووچ و تاوانم چییە، لەسەرچی ئەمگرن؟

چڵکن گوتی: تێئەگەم و ئەمانەم وەك ڕۆژ بەلاوە ڕۆشن و ڕوونە. بەڵا م کیٚ ئەم چەند و چوونەت لیٚ ئەبیستیٚ؟ بێسوودە، ڕاکە، ئەتگرن و ماوەیەك ئەتخەنە زیندان و لە پاشان بەرێت ئەکەنەوە بۆ وڵاتی خۆتان.وەرزێر کە ئەمەی بیست جەرگ و هەناوی داکەوت و حەوش و حەساری مزگەوتی لیٚ بوو بە کونە مشك. جنێو و لێدان و برسییەتی و بێگاری بیرکەوتەوە و زامی جێگە کوڵیٚ و داری زۆرداری کولایەوە. ئاخێکی هەڵکێشا و چاوێکی بە ئاسمانا خشاند، چ ڕوانین و چاوپیاخشاندنێك! بە قەدرایی سەد کتێب پڕ بوو لە گلەیی و بناشت. بە دوو سیٚ تەکان هەستاو لەشی لە قاچی بارکرد. لاقی لەرزی و ئەتگوت ئەڵیٚ: ئیتر بەسە، هێزم تێدا نەماوە، سواوم، داروبەردو ئاسن و پۆڵا نیم، گۆشت و ئێسقانم، پەکم کەوتووە، ڕاستییەکەی ئەوەیە ئیتر بە من دەرناچیٚ!

وەرزێر گوێی نەدایە، بە کۆمەگی گاڵۆکەکەی وەك پەت کێشی کرد و بەدارەدارە خۆی پیٚ گەیاندە قەراخ شار. ئیتر لەویٚ مەینەت کۆتایی هات. لاق لەرزی. لەش کەوتە زەوی. گیانی شەکەت و وەڕزیش بۆ ئاسمان ڕی.

***

مجێور کە قسەی پتەو و بیچمی مەینەتباری کابرای وەرزێری کاریان کردبووە دڵی و ئازاریان ئەدا، هەستی هاومەینەتیی بێداربوو و گوتی: ئێمەی هەژار بەزەییمان بە یەکترا نەیەتەوە، کیٚ بەزەیی پێماندا دێتەوە؟ هەستا دوای کەوت کە بیهێنێتەوە بەڵکو خێرۆمەندان لە مزگەوت خێری پیٚ بکەن تا تۆزیٚ ئەبووژێتەوە، جا ئەوسا ملی کاریٚ بگریٚ یان بڕواتەوە. بازاڕ و جادە و کۆڵانی بەدوادا گەڕا و کەلێن و قوژبنی شاری پشکنی. تووشی نەهات. تا ئاخری لە قەراخ شار دۆزییەوە، بەڵام چی؟ لاشەیەکی بێگیان و زامار! زانیی تاوانێکی گەورەی کردووە و سووچی ئەوە ئەم چارەڕەشە مردووە. تەریق بووەوە و پاڕایەوە لە تەرمی زامار و، دوعا و فاتیحای خوێند بۆ گیانی پەڕەوازەی هەژار، بەڵکو لێی ببووریٚ و لەو تاوانەی کردوویەتی بیبەخشیٚ. لەبەرخۆیەوە ئەیگوت: من بە گیانی ناخێرم دڵسۆزیم کرد، بەو قسانە ویستم خێرخوایی بکەم، خۆ بۆیەکم نەبوو بەم ڕۆژە بگات.

بە شەرمەزاری دای بە کۆڵی خۆیدا و پەیتا پەیتا لەژێر لچەوە ئەیگوت: بریا، سەد بریا من بوومایە لە جیاتی تۆ! هەڵیگرت و هێنای لە حەوزی مزگەوت ڕایکێشا و بۆ کفن کەوتە ناو بازاڕ. ڕۆیشت تا گەیشتە دووکانی مام حاجی بازرگان و گوتی: کابرایەکی هەژار و ئاوارە و بێکەس و کار لە برسا مردووە و هاتووم بۆ کفن. تۆ کفنی بۆ بکە و شۆردن و گۆڕیشی لەسەر من. حاجی پیشی خواردەوە و مژێکی لە جگەرەکەی دا. وەك مار پێوەی دا، پڕ بە پێست ئاوسا. لە پاشان کۆکەیەکی کرد و هاتە قسە و گوتی: بەم بێبازاڕییە خێر و بەرەکەتت هێناوە! بە من چی ڕەشوڕووتێك مردووە؟ دیسان هێندێکی کە پیشی خواردەوە و گوتی: باشە، پەلە مەکە، با بازاڕمان ببیٚ ئەوسا وەرەوە کفنی بۆ ئەکەم. مجێور بە وورەیی و بەسەر ڕاوەشاندن گەڕایەوە., لەژێر لێوەوە بە دەم ڕێگەوە بە جنێوەوە ئەیگوت بەڵیٚ، مام حاجی! تەرمەکە خویٚ بکەم بۆگەن نەکات تا بازاڕت ئەبێت، ئەوسا بێمەوە خزمەتت! تف لە خۆت و پارەشت. بۆچی مردووش کاڵا و کووتاڵە پەساو ئیحتیکار بکریٚ!.. بردی بە جل و بەرگەکەی بەریەوە ناشتی و گوتی: شەهیدی زوڵمە. کفن و شۆردنی ناویٚ.

## نووشتەکەی ئامینەخان

(قاجر) و (کانی پانکە) دوو دێن لە ناوچەی بۆکان. هاوکەوشەنن، سنوور و سەراوەردیان پێکەوەیە و جووتیان لە یەك ئەگەڕێتەوە.

شێخ ئەحمەدی کانی پانکە (خوای لیٚ خۆش بیٚ) بە سەرێنیی خۆی ماڵی لە کانی پانکە بوو. خەریکی خۆشکردنەوەی شێت و هار بوو. بۆ هەموو ئێش و ئۆف و دەرد و ئازاریٚ نووشتەی ئەکرد. بە

هات و هاواری هەموو کەسەوە بوو. هەرگیز ماندوویی و شەکەتیی نەئەزانی چییە. نازانم و ناتوانم و پێم ناکرێی بە دەما نەئەهات. خوای لیّ ڕازی بێت، بۆ کاروباری خەڵك زۆر جەڵد و خێرا و چوست و چالاك بوو. لە دوعا و نزا. لە نووشە و جادوو، لە تێڕوانین و فاڵگرتنەوە، لە پڕوپیتە و داودەرمان درێغیی لەموسوڵمانان نەئەکرد.

دیارە موسوسڵمانانیش بیریان لەمە کردبووەوە کە ئەم پیاوە شەو و ڕۆژ خەریکی نوێژ و تاعەتی خوا و ئیش و فرمانی ئەوانە، کاروکاسبی پیّ ناکرێ. وەك ئەو لە ڕێی خوادا بە هەموو هاوار و بانگێکی ئەوانەوە هەیە و ئەگاتە فریایان، ئەمانیش ئەبێ شەرم بیانگرێت و بە دەستی بەتاڵ نەچنە خزمەتی. دوعا و نزای بیّ خزمەت، نوشتەی بێ سەرقەڵەمانە، دەرمان و تیماری بێ ئولیفەت کار ناکات. ئەمانیش خێرێکیان دەسگیر نابێت و ئەویش نفووسی ئەشکێ! ڕۆژ و شەو وەك قەتاری ڕەش و سپی بە دوای یەکا تێئەپەڕین. ئەم دەمی بە سڵاو سەندنەوە و چاك و خۆشی و دوعاخوێندنەوە خەریك و، دەستیشی لە نووشتە نووسین و گژوگیا کوتانا بوو. خەڵکیش دەم بە سڵاوو پاڕانەوە و دەست بە دیاری و پشت بە کۆڵەوە لە هاتوچۆدا بوون.

هەردوولا پێکهاتبوون و سەرودڵ خۆش بوون. ئەم بژیوییێکی باشی دەست ئەکەوت و گوزەرانێکی چاکی ئەکرد و دارایی و سامانێکی جوانی پێکەوە نابوو، لەسەر هیچ پەکی نەئەکەوت. ئەوانیش کاروباریان هەڵئەسووڕا و عەمر وماڵیان بەزیاد ئەبوو، دەرد و بەڵایان لە کۆڵ ئەکەوت.

بەڵێ وابوو! هەست و ئاگا پادشای لە شەو فەرمانی لە ناوچەی پاشایەتی خۆیدا ڕەوایە و لەسەر سەر و چاوانە! ئەوان لایان وابوو وایە. جا تۆ هەر بڵێ: وا بوو.. وا چوو.. بەچی ئەچێت؟! هەروەکو خۆی ئەیفەرموو: "دنیا فانییە و بۆ کەس تا سەر نامێنێت. ئەوەی بمێنێتەوە، هەر چاکەیە!"
پاش ئەو هەموو چاکە و خزمەتەی بە خەڵکی کرد لە دنیا دەرچوو، بەرەو قیامەت کۆچی کرد. بەڵام ئەم وەك هێندێ پیاوچاکانی تر نەبوو. جگە لە چاکەکانی تەنیا سامانێکی باشی بۆ منداڵەکانی جێهێشت و ئیتر بۆی نەکرا دێ و خانووبەرە و شتی وا بکڕێت.

منداڵەکانی لە کاتی خۆشی و تێر و تەسەلیدا چاویان پشکووتبوو، خۆشخۆر و خۆشدڕ و نازپەروەردە بوون. ئاگایان لە سەرەتای ژیانی باوکیان نەبوو، نەیانئەزانی ئەم ماڵ و دەوڵەتە لە کوێ پەیدابووە و، ئەم بەند و جۆگەیە بناوانی لە کوێ هەڵگیراوە" ژیانی خۆش، دارایی زۆر، هاتوچووی خەڵکیش نەئەپسایەوە. ئیتر چی؟ باشە، ئەمان خافڵبوون و بەرجەوەندی دنیایان نەکردبوو، ئەی باوکیان بۆ فێری پیشەکەی خۆی نەکردن و بەزەیی بە موسوڵمانان نەهاتبووەوە؟



منیش وەك تۆ لە تاریکاییدام. تۆ بڵێی وەکو لە ناویانا باوە لە ترسی ئەومە بووبێت کە ئەوان هەوەڵی دەمیان بوو، هەرزەکار بوون، ئەترسا پێیان ڕاگیر نەکرێت و تیا بشێوێن، یان نەیئەویست ڕازی نهێنی پیشە و هونەری خۆی بڵێت کە ڕازی نهێنی هونەر و پیشە تەنانەت ئێستاش خۆشەویستە، یان بە دارایی و ساماناکەی لێیان دڵنیا بووە؟ بەڵام قسەی خۆمان بێت و لەناومان دەرنەچێ، چییان

پێ بڵێ و چییان فێر کات؟ خۆی چی فێر بووبوو تا لەوانی بشارێتەوە! کار و دەسەڵات بە خوایە، ئەو بڵێ چی و چ بکات؟ بەشی ئەمانی تیا نەبوو!

منداڵەکانی ڕەنجیان تیا نەدابوو، پشتیان پێیەوە نەیەشابوو. دوای باوکیان شەش و بێش لێیان داو تەخشان و پەخشانیان کرد. خوا نەیبڕێ، ئەوەندە زۆر بوو بەم جۆرەش بەشی چەند ساڵێکی کرد. کوڕەکان کە هەریەکەی لە ژنێك بوون، بەرودوا جیابوونەوە و، هەریەکەیان ماڵ و حاڵێکی بۆ خۆی پێکەوە ناو وەك جووجکی کەچەڵە پەڕەوازە بوون، لەبەر دەستەنگی و نەمانی دارایی و سامانی میراتی ڕوویانکردە ماڵە خاڵوانی خۆیان و مریدنی باوکیان و، ئامینەخان و برا بچکۆلەکەی و دایکەکەیان جێهێشت. ئەوەی لەو ناوەدا دەسەوسان و داماو بوو، هەر ئامینەخانی چارەڕەش بوو.

دیسان تا دایکی مابوو هەر باشترێك بوو، چونکە دایکی هەرچەند پیر و پەڕپووت و کەنەفت و پەك کەوتە بوو، جێگەی بیروباوەڕی خەڵك بوو، بە پیرۆزیان ئەزانی و بە چاوێکی موفەڕك تەماشایان دەکرد. بە تایبەتی لەناو ژناندا دەم و نفووسی بە پیت و بەرەکەت بوو. بەڵام "نەهاتی چاکە، قۆرتی خراپە". دوای جیابوونەوە و تەفروتوونا بوونی براکانی، زۆری نەخایاند دایکیشی ئەمەگی بەجێهێنا و دوای باوکی کەوت بۆ شاری خامۆشان. ئامینەخان خۆی مایەوە و برا چکۆلەکەی.

ئیتر ئامینەخان بوو بە گەورەی ماڵ و جێنشینی باوکی و جێداری دایکی و بناوانی برا چکۆلەکەی. ئەبوو ئیشوکاری ماڵ بکات و بۆ چاك و خۆشی و دوعا و نزا و داو و دەرمان بە دەم خەڵکیشەوە بێت. کاری بەوە چاك بوو لە وەختی خۆیدا تاقە کچەی بوکی بوو، (کچیش خۆش شیرین کەرە)، باوکی خۆشی ئەویست و بەردەستیی خۆی پێ ئەکرد. سەبارەت بەمە هێندێ ڕێ و شوێنی ئیش شارەزا بوو، بڕێ دەرمان و گیاوگژیشی کە لە وەختیخۆیا بۆ باوکی جێبەجێ ئەکرد ئەناسی و فێری بەکارهێنانیان بووبوو. لە دێی خۆیان و ئاواییەکانی دەوروپشتیانەوە کوڕ و کچ بۆ دوعای چەور و شیرینی و پێکبڕان، ژن و پیاو بۆ منداڵبوون و دەمبەست و داوودەرمان ڕوویان تێئەکرد و سەریان قاڵ کردبوو.

ئامینەخان، وەك جوان نەبوو، ئەوەندەش دزێو و ناشیرین نەبوو کەس نەیخوازێ. لە تافی جوانی و نوخشەی پێگەیشتندا کەڵەگەت و پان و پۆڕ و، بەژن و باڵایەکی ڕێکوپێك و لەخت و لار و داروبارێکی باشی بوو، بەڵام دیارە بۆرە پیاو و کوڕە وەرزێر هاوشانی ئەو نەبوون و داواکارێکی تریشی نەبوو. لەبەرئەمە مابوەوە. بە سەرێنیی دایکی مەیدانی تێکەڵیی کوڕ و کاڵ و مەودای باسوخواسی لەگەڵ گەورە کچ و جوانەژناندا نەبوو. ناچار بە هیوای ڕۆژی بەختەوەری ددانی بە جەرگی خۆیا گرتبوو، کەین و بەینی دڵداریی نەئەزانی و ئاگای لێ نەبوو.

ئێستا، کە ڕاستەوخۆ بەرەو ڕووی هەموو جۆرە سکاڵاییێکی دڵداری و هەموو چەشنە ڕاز و نیازێکی کچێنی و کوڕێنی بووە و، لەژێر سەرپەرشتیی دایکیشیا نەماوە، هەرچەند هاتوچووی مانگ و ساڵانی زۆر بە سەریا شوێنیان کردووەتە دیمەنی و گۆناکانیان سیس و مەمگەکانیان بڵ کردووە و چەناگەیان داچۆڕاندووە و تاڵی سپییان خستووەتە سەری و ددانیان کەل کردووە، بەڵام وەك ترێی شەراب کە تا خۆی بخواتەوە توندتر ئەبێت، ئەمیش زیاتر دەروونی بڵێسەی سەندبوو و دڵی گڕی گرتبوو. ئیتر ناچار بوو لەگەڵ کوڕ و کاڵا لە کاتی دەرمان پێدان و نووشتەکردنا چاوبڕکێنە بکا و، دوو جەفەنگ و دوو زەردەخەنەی دڵتەڕانەش ئاڵوگۆڕ کات و، جاروباریش لەگەڵ ئەوانەی زۆر دڵگیر بن لە چاوداگرتنێکیش درێغی نەکات. لەگەڵ کچۆڵەکان و ژنە دڵتەڕەکانیش لە باسی دڵداری و کردنەوەی گرێی دڵی خۆی و هاوێرکردنی جوان و ناشیرینی لاوان و هەرزەکار و کوڕوکاڵی ئاوایی لەزەتێك بەرێ.

ئامینەخان بازاڕی گەرم بوو. هەرکەسە بە خەیاڵێك و هەریەکەی بۆ کارێك ئەچوونە لای و هەمیشە ماڵەکەی جمەی ئەهات.

براکانی لەوە تووڕە بوون کە خەڵکەکە سەریان کردۆتە ئامینەخان و دیاریی بۆ ئەبەن و خێروبێریان هەموو بۆ ئەوە و ئەمانیش کەس ڕوویان تێناکات.

ئەمان با نەخوێندەواریش بن، بە سەر و مێزەرێکی زل و ڕیشێکی پانەوە زرتەی چاویان بێت و، ئافرەتێکیش لە جێگەی باوکیان دانیشێت و بازاڕی وا گەرم بێت.

براکانی لێی کەوتنە تۆپ و تەشەر. ناو و بیتکەیەکی زۆریان دواخست و هزاران بەیت و باویان بۆ ڕێکخست.

ئامینە خانیش بە نۆرەی خۆی دەستەوستان نەوێستا و ئاکاری دزێو و کردەوەی ناپەسەندی ئەوانی بۆ خەڵك دەرخست و لێی کردنە قاو و ئەیگوت: هەرچی بە منی ئەڵێن خۆیان خراپتر ئەکەن. ئەگەر ئەڵێن نەخوێندەوارم نازانم دوعا و نزا بکەم، ئەوانیش وەك من نەخوێندەوارن و هیچ نازانن. ئەگەر ئەڵێن دیاریم بۆ دێت، ئەوانیش هەر بە نانی خەڵك بەڕێ ئەچن. ئەگەر ئەڵێن من بە دەم پیاوان و کوڕوکاڵی نامەحرەمەوە ئەچم، ئەوانیش تەنانەت بەسەرێنیی باوکیشم بە دەم ئافرەت و کچ و کیژی نامەحرەوە ئەچوون. خۆ من لە سایەی خواوە لە ڕێگای هیچیشا نیم و لە ڕێی خوادا خزمەتی خەڵك ئەکەم و، ئەڵێم با وەجاخەکەمان کوێر نەبێتەوە. من بەم ئافرەتییەی خۆمەوە حورمەتی جێگاکەم ڕاگرتووە، کەچی ئەوان بۆ ڕابواردن خۆیان بڵاوەیان لێکرد و هەریەکەی ڕوویکردە لایەك.

خەڵکەکەش نەیانئەتوانی مورشیدزادەکانیان بەدرۆ بخەنەوە، ناچار بوون بڕوا بە هەردوولایان بکەن و، وردە وردە تێگەیشتن ئەمە بناغەی بۆشە و (کێشە لەسەر لیفەی مەلایە) و ئەم گێرەو کێشە و

هەرا و بەزمە هەر بۆ کڕووساندنەوەی ئەوانە! ئیتر لێیان تەکینەوە و وازیان لە هەردوولایان هێنا.

ئامینەخان کە هاتوچووکەری نەما و دیاری و کۆڵەباری لێ بڕا، ناچار بوو خۆی بە مالآن و، لە کاتی نوخشەشا بە خەرمانانەوە بگەڕێ نووشتە بکا و دوعا بخوێنێ و شت دەسخات. بۆ هاتوچووی سەرخەرمانان گوێدرێژێکی پەیدا کرد، لەمسەرەوە سواری ئەبوو، لەوسەریشەوە خەلەی لێ ئەنا.

خەرمانەکانی کانیپانکەی تەواوکردبوو، نانی ساڵی کۆکردبووەوە، ئەمجار بۆ جلوبەرگ و پێداویستی ماڵ ئەیەویست هێندێکی تریش کۆکاتەوە و بیفرۆشێ. ئیتر تا ساڵێکی کە پۆشتە و پەرداخ و تێر و تەسەل ڕابوێرێ.

گوێرێژی کورتان کرد و لێی سوار بوو بەرەو خەرمانەکانی قاجر. کە لە ئاسۆگەی کانیپانکە سەرکەوت، لە پێشدەشتیدا، کە زۆری نەئەما بۆ سەر چەمی (تەتەهوو) خەرمانێکی گەورەی بەدی کرد. بە دڵێکی خۆش و تەمایەکی زۆرەوە ولاغەکەی بەرە و خەرمان لێخوڕی. زۆری نەخایاند گەیشتە پێشەوە. تەماشای کرد ڕەشیدی مام هەباس کە باوکی یەکە دەوڵەمەندی قاجرە بە تەنیا لەوێیە و بە کاوەخۆ شەن ئەکات، بەڵام چەند ماڵۆسکەی گەورەی سوورکردووە.

ئامینەخان سڵاوێکی کرد و هێندێ دوعای لەژێر لێوەوە خوێند و فووی کرد بەسەر خەرمانەکەدا پیتو بەرەکەتی تێکەوێت و بێچاوێنی بێت.

ڕەشید کە کوڕێکی گەنج و هەرزەکار بوو دەستی لە شەن هەڵگرت و هات بە دەم ئامینەخانەوە. زۆری بەخێرهاتن کرد و دۆی ساردی لە مەشکۆلەکە بۆ تێکرد تا تیوانیەتیی بشکێت. لەژێر سێبەری کەپرەکە دانیشتن و ڕەشید دەستی کرد بە چاڵنان و لە بەریشەوە چاك و خۆشییان ئەکرد و هەواڵی کەسوکاری یەکتریان ئەپرسی.

ئامینەخان هەواڵی خەجێی خوشکی ڕەشیدی پرسی. ڕەشید گوتی: دوێنێ خوازبێنی کەری هاتەسەر و دامان بەشوو. ئامینەخان کە باسی شووکردنی بیست برینی دڵی کولاوە و ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی: ئەی ڕەشید گیان، تۆ کەی بەخێر ژن دێنی؟

ڕەشید: چارەنووس بە خوایە. بزانین چۆن ئەبێت.

ئامینەخان: بەڵێ چارەنووس بەخوایە، بەڵام کوڕێکی وەك تۆ جوان و لاوچاك چۆن ئەبێ کەست نەدۆزیبێتەوە و حەز لە کەس نەکەیت؟ کوڕی وەك تۆ جوان بۆ ژن دائەمێنێ؟ خوا نەیبڕێ، جگە لە جوانیی خۆت، لە هیچیشتان کەم نییە!

ڕەشید: بڵێم چی! کێ جوابی من ئەداتەوە؟

ئامینەخان (بە نازێك و چاوێکی نەرمەوە): ئەوە ئەڵێی چی؟ حەیف نییە! ئەو چاوە جوانانەی بەتۆوەیە بە خوا خوشکی خۆشت عاشقت ئەبێت!

ڕەشید: چی بێ لە تۆ نهێنی بێ! حەز لە کچێك ئەکەم، بەڵام ئەوەندەی ئەکەم و ئەکرێنم جوابم ناداتەوە. ئەگەر نووشتەیەکم بۆ بکەی بۆم ساز بێ، چی ئەڵێی ئەتدەمێ.

ئامینەخان: ڕەشید گیان! سەرقەڵەمانە ئەبێ پێشەکی بدرێ، ئەگینا نووشتە کارناکات.

ڕەشید: باشە، چیت ئەوێ ئەتدەمێ، بەڵام ئەترسم نووشتەکە کار نەکات.

ئامینەخان: تۆ جەواڵێ گەنمم بدەیە، نووشتەیەکت بۆ ئەکەم بە مەرج. خوانەخواستە گە کاری نەکرد لە منی بناسە.

ڕەشید هەستا جەواڵەکەی لە گوێرێژەکەی ئامینەخان داگرت و پڕی کرد لە گەنم و درووی و داینا و هاتەوە ژێر کەپرەکە، گوتی: ئەوە گەنم. دەیسا تۆش نووشتەکەم بۆ بنووسە.

ئامینەخان کوتێك کاغەزی چڵکن و قەڵەمێکی لە گیرفانی دەرهێنا و نەختێ خەتی ڕەش و سپیی لێ کێشا و نووشتاندییەوە و تۆزێ منجەمنجی کردوو فووی کرد بە نووشتەکەدا و گوتی: بە سەری باوکم نووشتەیەکم بۆ کردووی تا ئێستا نووشتەی وام بۆ کەس نەکردووە.

ڕەشید نووشتەکەی لێ وەرگرت و گوتی: جا ئەمە چیی لێ بکەم؟

ئامینەخان: بیخەرە کۆشیەوە و ئیتر دەنگ مەکە، خۆی بانگت ئەکات.

ڕەشید: دەترسم دەستم ببڕی و تووشی پەندێکیشم بکەی. بۆ خاتری خوا ئامینەخان چۆن لە خۆمەوە بیخەمە کۆشی ئافرەتەوە؟

ئامینەخان: ڕەشید! وا دیارە تۆ زۆر بێباوەڕی بە چاك و پیران، یان زۆر شەرمنی. ئەم نووشتەیەی بۆ تۆم کردووە بە سەری باوکم بیخەیە کۆشی ئافرەتێکی دینداری وەکو منیشەوە کە لە سایەی خواوە لە ڕێگەی هیچشا نیم، ناچارە دەنگ نەکات.

ڕەشید کە ئەمەی بیست نەیکردە نامەردی، ڕێوڕاست نووشتەکەی خستە کۆشی ئامینەخانەوە.

ئامینەخان گوتی: ئەیەڕۆ ڕەشید! ئەوە چیت کرد؟ چۆن ئەو فێڵەت دۆزییەوە؟

ئیتر ئامینەخان خۆی بە درۆ نەخستەوە و، لە پاشان نووشتەکەی دایەوە دەست ڕەشیدو گوتی: خۆ باوەڕت کرد کارئەکات. دەسا باشی هەڵگرە بۆ هەموو جارێ با بەکارت بێت.

ڕەشید نووشتەکەی نا گیرفانی و گەنمەکەی بۆ بارکرد.، ئامینەخان بە جەواڵە گەنمەوە بەرەو کانیپانکە کەوتەڕێ و ڕەشیدیش هەی پێی لێکرد بۆ چەمی تەتەهوو..

سەرچاوە: پێکەنینی گەدا، حەسەنی قزڵجی، چاپخانەی علاء، بەغدا، چاپی دووەم، 1985.

# هەندێ چیرۆکی خەڵکی لادێکان*

## ئا ئەمەش ئەقڵێکی زۆری دەوێ؟

پیرەژنێك و پیرەمێردێك بووکێکیان هەبوو. بووکەکەیان زۆر تەمەڵ و تەوەزەل بوو. جارێکیان پیرەمێردەکە گوتی:

–ژنەکە! تۆ دەست دەرە گۆزەکە، بکەوە ڕێ بۆ ئاو. منیش گۆزەکەت لەدەست ڕادەکێشم. بزانین بووکەکەمان شەرم دەیگرێ بچێ بۆ ئاو.

ئاوایان کرد. پیرەژنەکە دەستی دا گۆزەکە. پیرەمێردەکە خەریك بوو گۆزەکەی لەدەست بستێنێ و گوتی:

–پیرەژن! بیدە بە من، من دەچم بۆ ئاو. تۆ پیر بویت.

پیرەژنەکە گوتی: نا، نا! ئەمە کاری ژنانە. خۆم دەچم. بووکەکەیان تەماشای کردن.. تەماشای کردن، پێیان پێکەنیێ و گوتی:

–ئەیەڕۆ، ئەیەڕۆ! ئینسانی پیر چۆن سەری لە هیچ دەرناچێ! ئا ئەمەش ئەقڵێکی زۆری دەوێ؟ نازانن ئەمڕۆ یەکێکیان بچێ بۆ ئاو، سبەینێش ئەوی تریان.

## چاوچنۆك

کابرایەك هەبوو، زۆر چاوچنۆك بوو. جارێکیان بەرخێکی برژاوی بە تەواوەتی خوارد. ورگی هەڵاوسا. تەماشای کرد هێندێکی ماوە. گوتی:

–خودایە! بۆچی دوو چاوت دامێ، بەڵام دوو ورگت نەدامێ؟ ئەوەی مابۆوە ئەویشی خوارد.

وا ڕێکەوت چەند ڕۆژ هیچی دەست نەکەوت بیخوات و بە برسییەتی مایەوە. ئەمجار گوتی:

–ئۆ هۆی خودایە! باش بوو تاقە ورگێکت دامێ، ئەگەر دوان بوایە، لەمێژبوو لە برسان مردبووم.

## شوان و شووتی

شوانێك ئەیدی هێندێ کەس نەرمەکەی ناوەوەی شووتی دەخۆن.

گوتی: بۆچی منیش وەك ئەوان نەکەم؟ شووتییەکی کڕی، شکاندی وەکو ئەوان نەرمەکەی ناوەوەی خوارد و دەوروبەرەکەی هێشتەوە.

گوتی: ئێستا خەڵك دەڵێن ئەو شووتییە دەوڵەمەند خواردوویەتی.

شوانە پاش تاوێك بیری کردەوە: بۆچی دەوروبەرەکەشی نەخۆم: خەڵك دەڵێن: دەوڵەمەندەکە نۆکەریشی لەگەڵ بووە، ئەویشی خوارد.

دوای تاوێك گوتی: با توێکڵەکانیشی بخۆم. خەڵك کە دەنکەکانی دەبینن دەڵێن: دەوڵەمەندەکە گوێدرێژیشی پێبووە. توێکڵەکانیشی خوارد.

ئاخرەکەی دەنکەکانیشی خوارد.

گوتی: خەڵك دەزانن دەوڵەمەندەکە مریشکیشی هەبووە.

## کێ کار دەکا و کێ دەخوا

باوکێك بە کوڕەکانی خۆی گوت:

–سبەینێ دایکتان کولیچە دەکا. کێ دەیخوا؟ کوڕە گەورەکەی گوتی:

–من دەیخۆم، باوە من دەیخۆم.

–منیش بەرخەکە سەردەبڕم. کێ دەیخوا؟

هەر ئەو کوڕە گوتی:

–من دەیخۆم، باوە من دەیخۆم.

سبەینێ دەچینە دەشت بۆ جووتکردن. کێ جووتەکە دەکا؟

–هەموو شتێك هەر من.. هەموو شتێك هەر من! دەبا ئێستا نۆرەی یەکێکی تر بێ.

## هەرگیز قسەی باشی نەدەکرد

پیاوێك لە گوندێك دەژیا، هەرگیز قسەی باشی نەدەکرد. خەڵکی گوندەکە ویستیان ئەو عادەتە خراپەی پێ تەرك کەن. بانگیان کرد و پێیان گوت:

–بڕیارمان داوە لەسەر خەرمان هەر یەکەی ڕبەیەك گەنمت بدەینێ بەڵام ئیتر لە ئێستاوە هیچ کاتێ نابێ قسەی خراپ بکەی.

کابرا گوتی: هەی، هەی! ئەی ئەگەر گەنم شین نەبوو؟

خەڵکەکە لەسەر ئەو قسەخراپە گرتیان، دەستیان کرد بە لێدانی.



## ژنێکی بەکار

ژنێك هەبوو، زۆر بەکار و توندوتۆڵ بوو. بە درێژاییساڵ شانەی کرد، ڕستی، بایدا، دەستی کرد بە چنین. ئاخرەکەی لنگە دەستکێشێکی بۆ مێردەکەی چنی. ڕۆژی جێژن مێردەکەی کردییە دەستی و چوو بۆ هەڵپەڕکێ. ژنەکە بانگی کرد:

–هۆ.. هۆ.. پیاوەکە! دەستی چەپت هەڵبڕە. چەند باش بوو دەسکێشە تازەکەت جووتێك بوایە. ئەگەر نەمرمساڵێکی تر لنگەکەی کەشت بۆ دەچنم!

## دزەکە خۆی خۆی ئاشکرا کرد

پیاوێك لە قۆپییەك پاوەنی هەبوو. یەکێك فێر بووبوو دڕبی لێ دەکرد. خاوەن پاوەنەکە تەماشای کرد ڕۆژبەڕۆژ گیایەکەی کەم دەبێتەوە. تێگەیشت کەسێکە بەڵام نەیدەتوانی دزەکە بدۆزێتەوە. بەیانییەك دیتی دراوسێکەی وا لەوێیە. سەری سووڕما. پیاوەکە دڵی لە دراوسێکەی پیس کرد کە ئەو گیاکەی دزیبێ. بەڵام نەیدەزانی بە ڕاستی ئەو دزیویەتی یا کەسێکی دیکە.

بە یەکەوە باسی دزرانی گیایەکەیان دەکرد تا بزانن کێ دەیدزێ. خاوەنی گیایەکە گوتی:

–ئێستا دزەکە دەدۆزمەوە. ئەو کەسەیە کەوا مێش بە کڵاوەکەیەوەیە.

دزەکە بێئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کەوا خۆی ئاشکرا دەکا، دەسبەجێ دەستی برد بۆ کڵاوەکەی کە مێشە دەربکا.

خاوەن گیایەکە گوتی:

–ئەوەتا، ئاوا دزەکە دەدۆزمەوە. یەخەی کابرای دزی گرت.

## با شتێك ببێ خواردنی تێکەم بۆت

پیاوێکی پیر تاقە کوڕێکی هەبوو. پیاوەکە زۆر پیر بووبوو. ئیتر نەیدەتوانی هیچ کارێك بکا.

ڕۆژێك کوڕەکەی گوتی:

–هەر بە خۆڕایی نانی من دەخۆی. دە بڕۆ هۆ لەوێ ڕاکشێ، لە ئاغەڵەکە.

پیرەمێردەکە چوو لە ئاغەڵەکە ڕاکشا. کوڕەکەی هێندێ نانە ڕەقەی هێنا و بۆی فڕێدا ناو ئاخوڕەکە.

پیرەمێردەکە دەستیکرد بە گریان. نەوەی پیرەمێردەکە کە ئەوەی دی، تەشوێیەکی هەڵگرت و چووە حەوشەکە دەستی کرد بە تاشین و قوڵکردنی کۆلکە دارێك. باوکی لێی پرسی:

–ئەوە چ دەکەی؟ منداڵەکە وەڵامی دایەوە:

–ئاخوڕ دروست دەکەم. کە پیربووی با شتێك ببێ خواردنی تێکەم بۆت، وەکو تۆ بۆ باپیرمی تێدەکەی.

باوك لێی وردبووەوە. تاوێك بیری کردەوە. پاشان هەستا چوو پیرەمێردەکەی هێناوە.

تێبینی: ئەم کورتیلە چیرۆکانە کە مامۆستای خوالێخۆشبوو ئامادەی کردووە لە گۆڤاری "شۆڕشی کشتوکاڵی"، ژ 5، 1979دا بلاوبۆتەوە.

نمونەی شانۆنامەی پەك پەردەیی

# بە بۆنەی درانی جایزەی ئاشتی "نۆبل" بە کیسینجیر

# جایزەی کۆمیتەی ئاشتی جانەوەران بۆ کیسینجیر*

ورچ (سەرۆکی کۆمیتەی ئاشتی جانەوەران): —ئەوا کۆبوونەوەی کۆمیتەی ئاشتی جانەوەران دەکەمەوە. دەست دەکەین بە قسەکردن لە بارەی ئەوانەی بۆ وەرگرتنی جایزەکە پێشنیار کراون. ئاغای سکرتێر، کێ پێشنیار کراوە؟

مەیمون (سکرتێری کۆمیتە): ئاغای کیسینجیر، گورگ پێشنیاری کردووە..

سەرۆك: کێ لەم بارەوە دەیەوێ قسە بکا؟

کەروێشك: من دەمەوێ قسە بکەم.

گورگ: هەقی نییە قسە بکا، لە وەتی هەیە خوێنی لە مێشولەیەك نەهێناوە. ئەسڵەن بۆئەوە نابێ ئەندامی کۆمیتەی جانەوەران بێ.

مەیمون: جانەوەران دوو جۆرن، هێندێکیان خوێنڕێژن، هێندێکیشان خوێنڕێژ نین. ئەگەر ڕەخنەی ئاغای گورگ قبوڵ بکەین دەبێ بەشێکی زۆر لە جانەوەران لە مافی دەنگدان بێبەش بکەین. لام وایە کە کەروێشك یەکێکە لە جانەوەران، وە هەقی قسەکردنی هەیە.

سەرۆك: کەروێشك تا ئێستا لە جانەوەران ژمێردراوە و ئەندامی کۆمیتەیە. لەبەرئەوە دەتوانێ قسە بکا.

کەروێشك: ئاغای ورچ سەرۆکی بەڕێزی کۆمیتە، ئاغایانی جانەوەران، ئەندامانی بەڕێزی کۆمیتە!

هەنری کیسینجیر لە ئەڵمانیا لەدایك بووە..

گورگ: ئەمە عەیب و شورەیی نییە. هەر کەسێك لەم دنیایەدا لە جێگایەك لەدایك بووە.

کەروێشك: مەبەستم ئەوە نییە عەیب و شورەیی بێ. دەمەوێ ژیانی ئەو کابرایە بە کورتی بۆ کۆمیتەی بەڕێز باس بکەم، لە خێزانێکی جولەکەیە..

گورگ: بێدەنگ بە! تۆ فاشیستی.. تۆ دژی جولەکەی..

کەروێشك: بڵێم چی! من تاوانم چییە کابرا لە خێزانێکی جولەکەیە. خۆ من ئەمە وەك ڕەخنەگرتن ناڵێم. تۆ کە پێشنیارت کردووە دەبێ بزانی کوڕی کێیە. بۆچی پێت ناخۆشە؟

سەرۆك: (دەبۆڵێنێ) کەس هەقی نییە ڕێکوپێکی کۆبوونەوە تێك بدات. وازی لێ بێنن تا قسەکانی تەواو دەبێ. ئەوسا کێ قسەی هەیە دەتوانێ بیکات.

کەروێشك: ئاغای سەرۆك سوپاست دەکەم، هەنری کیسینجیر لە ئەڵمان لەدایك بووە، خێزانێکی جولەکەیە. بە ناوی استادی زانستگا لە زانستگای (هاروارد)ی ئەمریکا بوو. هەمیشە دەیگوت: "من پیاوێکم عاشقی قدرەت و دەستەڵاتم". هەر لێرەوە دەردەکەوێ ئەم کابرایە چ پیاوێکە. ئەو عاشقی بیروڕای دوو کەس بوو، هەمیشە ئەوانی بە (خولقێنەری مێژووی تازەی ئورووپا) ناودەبرد، وە ئەوانی دەپەرست. ئەو دوو کەسە (میترنیخ و بیسمارك)ن.

خۆتان دەزانن ئەو دووانە هیچ کاتێ لایەنگری ئەوە نەبوون بە مافی بەرامبەر و وەکو یەکەوە وتووێژ بکرێ. هەمیشە ویستوویانە بە زۆرداری و لە هەڵوێستی دەستەڵاتەوە "ئاشتی" داسەپێنن.

ئەوانە هەردووکیان لایەنگری میلیتارسیم بوون، کۆمەڵانی خەڵکیان بە سوك و چروك دادەنا، وە وەکو ئامراز و ئەسپاب بۆ ئامانجی خۆیان کەڵکیان لێ وەردەگرتن، بیسمارك کە کیسینجیر دەیپەرستێ دەیگوت: "پارلمان تیئاتریکە هەرگیز ئارتیستی لاوی بە خۆیەوە نەدیوە".

ئەوی دیکەش کە کیسینجیر دەیپەرستێ، یانی (میترنیخ) هەمیشە ناوی لەگەڵ دیکتاتۆرەکانی زەمانی زووی ئورووپا هاتووە، ڕەوشتی ماکیاڤیلی هەبووە. لە مێژووی ئورووپادا بە جادوگەرێکی گەورە بەناوبانگە، کیسینجیر کتێبی (350) لاپەڕەیی دوکتۆرای خۆی لە بارەی ئەو پیاوە نووسیوە. لەو کتێبەدا دەڵێ: "ئەم پیاوانە لەبەرئەوە بە دیمەن و گەورە و هەڵکەوتوون کە توانیویانە ماوەی دوو سەد ساڵ ئاشتییەکی پتەو لە ئورووپادا دامەزرێنن".

ئەو ئاشتییەی ئەوان لە ئوروپادا دایانمەزراند بە چ نرخێك تەواو بوو. مەگەر ئەو ئاشتییەی کە "میترنیخ" بە دیاری دای بە ئوروپا، بە شکاندنی سەروگوێلاکی وڵاتە بچووکەکانی ئوروپا، وە کوشت و بڕو دیل و ئەسیرکردنی میللەتە بێ دەستەڵاتەکان نەبوو؟ وە ئەو ئاشتییەش کە (بیسمارك) پێشکەشی کرد بە زەبری شمشێر نەبوو؟

ئەڵمانیا هەزارساڵ بوو بە چەشنی فیدراڵ ئیدارە دەکرا، ئەو بە ئاسن و خوێن وە چەشنی زۆرداری پشووی خەڵکی بری و کێشانیە ژێر فەرمانی خۆی. وڵاتانی دیکەشی داگیرکرد و ئیمپەراتۆری ئیمبریالیستی (ڕایشی دووەم)ی دامەزراند. لە ناوەوەی ئەڵمانیادا هێندێ قانونی وای بۆ دیل و ئەسیر کردنی کارگەرەکان دانا، وە ڕەوشتێکی وای دامەزراند کە لە پاشان هیتلەریش زۆر پەسەندی کردن. هیتلەر لە کتێبەکەی خۆیدا (خەباتی من) دەنووسێ: "موتالای قانونی کارگەری بیسمارك لە ڕایشی سێیەمدا، بنچینەی سیاسەتی سەنعتی ئێمە دەبێ".

کیسینجیر نووسەری دوو کتێبی (میترنیخ) و "چەکی ئاتومی" وەکو قودرەتی ترسێنەر بڕوای بە وتووێژی هێدی و هێمن و لەسەرخۆ و دوور و درێژ نییە، لایەنگری وتووێژە لە هەڵوێستی زۆرداری و فڕوفێڵەوە، لایەنگری چاوبەستن و دەم کورتکردن و داسەپاندنی ئاشتییە.

ئاغای سەرۆکی بەڕێز! ئەوەی تا ئێستا گوتم لە بارەی بیروڕای خودی کیسینجیر بوو. بەڵام کیسینجیر لە باری ڕەسمییەوە، بە ناوی نوێنەری دەوڵەتی ئەمریکا وتووێژی لەگەڵ ویتنام کردووە، بە ناوی ئەو دەوڵەتەی کە هەزاران مەدرەسە و نەخۆشخانەی لە ویتنام بومباران کردووە، هەزاران هەزار کەسی ڤێتنامی کوشتووە، وە هەزاران خانوو و مەزاری سووتاندووە.

ئەوەندەی بومبا بە ویتنام داداوە، لە تەواوی ئەو بومبایانە زیاترە کە لە شەڕی دووەمی جیهانیدا تەقێنراون.

ئاغای سەرۆك! من بە ناوی ویژدانی جانەوەران داوا دەکەم جایزەی ئاشتی بە کیسینجیر نەدرێ. ئەو کابرایە نە لە باری شەخسیەوە و، نە لە باری ڕەسمییەوە فڕی بە ئاشتییەوە نییە و شایانی جایزە نییە. تکا دەکەم شەرەفی جایزەی ئاشتی جانەوەران بپارێزن. ئیتر ڕێز و حورمەت.

گورگ: (لوراندی) و داوای نۆرەی کرد.

سەرۆك: ئاغای گورگ! قسەی خۆت بکە!

گورگ: ئاغای سەرۆك! ئێوە بە ڕاستی زۆر مەند و لەسەرخۆن، هەر ئێوە دەتوانن گوێ لەو هەموو قسە پوچەڵانەی کەروێشك بگرن. ئەو قسانەی ئەو کردنی زۆربەیان وەڵامی خۆی بوون. کەروێشك ڕەخنە لە میترنیخ و بیسمارك دەگرێ کە بە کوشتار و خوێنڕشتن و جادووگەری ئاشتییان دامەزراندووە، وەکو دەبینین ئیعتراف بەوە دەکا کە ئاشتییان دامەزراندووە. ئیتر هەقی چییە ئەو ئاشتییە لە چ ڕێگەیەکەوە دامەزراوە. جانەوەرانی پێشینان، گۆڕیان پڕ لە گۆشت



و دوگ بێ، گوتویانە "الغاية تبرر الوسائل". ئەو دەڵێ ئەو هەموو بومبایەیان بە ویتنام داداوە. ئاخر ئەو کارەیان بۆ پاراستنی ئاشتی کردووە. ئەگەر وایان نەکردایە و ئەو هەموو بومبایە لە عەمبارەکاندا بمانایەتەوە هەمیشە ئاشتی لە خەتەردا دەبوو. من لام وایە ئەگەر هەر تەنیا لەبەر ئەم کارەش بێ، دەبێ جایزەی ئاشتی بە کیسینجیر، نوێنەری دەوڵەتی ئاشتیخوازی ئەمریکا بدرێ!

مەیمون: داوای قسەی کرد.

سەرۆك: فەرموو!

مەیمون: من بە ناوی سکرتێری کۆمیتە داوا لە ئاغای سەرۆك دەکەم، وەبیر ئەندامە بەڕێزەکانی کۆمیتە بخاتەوە کە قاعدە و قانونی کۆمیتە لەبەرچاو بگرن. ئەو قسانەی ئاغای گورگ کردنی لەگەڵ ڕێ و شوێنی کۆمیتە ڕێکناکەون. ئەوانە نە دەلیل هێنانەوە بوون، نە ڕەتکردنەوەی دەلیل. دەتوانم بڵێم چەقەڵ فێڵ بوون.

چەقەڵ: (قوراندی) قسەم هەیە.

سەرۆك: بڵێ

چەقەڵ: ڕەخنە لە ئاغای مەیمون دەگرم. سوکایەتی بە من کرد، من فێڵ ناکەم.

ڕێوی: (واقاندی) و داوای قسەی کرد.

سەرۆك: فەرموو، مام ڕێوی، قسە بکە!

ڕێوی: زۆر سوپاستان دەکەم ئاغای سەرۆك و گەورەمان. ڕۆژباش ئەندامانی بەڕێزی کۆمیتەی جانەوەران.

لێرەدا قسە زۆر کراوە ماوەیەکی زۆریش گوێ ڕاگیرا. خۆم بەسەربەرز دەزانم کە ئەندامی کۆمیتەیەکی ئەوەندە دادپەروەر و لەسەرخۆ و مەند و ژیرم. جێگای شانازییە کە دیموکراسی جانەوەران ئەوەندە فراوانە لاواز و دەستەلاتدار دەم پاراوی دووا، قسەکانی ئاغای گورگ زۆر بەنرخ بوون، وەبیرخستنەوەکەی ئاغای مەیمون بەجێ بوو، ئاغای چەقەڵ هەقی بوو ڕەخنە بگرێ، مەیمونیش بە ڕوحێکی دیموکراسییەوە ڕەخنەکەی قبوڵ کرد. بە کورتی دیموکراسی لەوپەڕی بەرزیدا باڵی بەسەر کۆبوونەوەکەمان داکێشاوە. لەسەر بنچینەی ئەم دیموکراسییە تکا ئەکەم لە ئاغای سەرۆك و هەموو ئەندامە بەڕێزەکان کە ئاوڕ لەم مەبەستە بدەنەوە.

ئێرە کۆمیتەی جایزەی ئاشتی جانەوەرانە. ئەوەی تا ئێستا گوترا و بیسترا هەمووی بە دەم کاوێژی ئینسان بۆ ئێمە کارمان بەکاری ئینسان نییە. دەبێ بە شێوەی جانەوەران قسە بکرێ.

پێشنیار دەکەم سەرلەنوێ کۆبوونەوەکە دەست بکاتەوە بە قسەکردن. ئەوەی تا ئێستا گوترا و بیسترا بێبایەخ بێ. هەرکەس نازانێ بە شێوەی جانەوەران بدوێ هەقی قسەی نەبێت و بێدەنگ بێ.

جانەوەرەکان: باشە، ڕامان لێیە.

مەیمون (سکرتێر): قسەکەری ئەسڵی کەروێشك و گورگ بوون.

سەرۆك: کەروێشك! ئەگەر قسەت هەیە بیڵێ، بەڵام دەبێ بە دەم و کاوێژی جانەوەران بێ.

کەروێشك: بەڵێ ئاغای سەرۆك. شێری (تەکساس)[1] ڕۆیشت و چووە لێرەواری ویتنام، کلکی نا سەر نەڕەی پشتی، بە لێرەوارەکەدا دەگەڕا، دەینەڕاند و دەینەڕاند و دەیگرماند. کوتوپڕ تووشی پشیلەیەك هات. زۆری بەلاوە سەیر بوو، زۆری لێ وردبۆوە. پاشان لێی پرسی: تۆ بیچمت لە بیچمی ئێمە دەچێ، خزمی ئێمەنی؟

پشیلە: بەڵێ. تەك خزم، هەر لە تیرەی ئێوەم.

شێری تەکساس: چۆن نەتەوەی ئێمە، لێرە ئاوا وردن؟

پشیلە: نەخێر. من خەڵکی (مارسیلیام)[2] وەکو تۆ زلە بووم، هاتمە ئێرە، لێرە ئاوا بچووکیان کردمەوە.

شێری تەکساس: کێ بچووکی کردییەوە؟

پشیلە: (چاوی گێڕا، کابرایەکی ڤێتنامی دی)، گوتی: ئا ئەوە.

شێری تەکساس: (بە ڤێتنامی گوت) تۆ خزمی منت ئاوا بچووك کردۆتەوە؟

ڤێتنامی: بەڵێ.

شێری تەکساس: بۆچی؟

ڤێتنامی: من لێرە لە ماڵی خۆم دانیشتووم، ئەو لەوپەڕی دنیاوە هات و منی ئازار دەدا. منیش بچووکم کردەوە.

شێری تەکساس: دەمەوێ شەڕت لەگەڵ بکەم و تۆڵەی ئەوت لێ بستێنم.

ڤێتنامی: لە پێشدا تەڵەی بۆ شێری مارسیلیا نابووەوە، وردە وردە شێری تەکساسی برد تا گەیشتە دەوەنێك و بە تەڵەکەوە بوو. چوو سێ چوار تێڵای بڕی و هاتە وێزەی شێرەکە، دەستی کرد بە لێدانی. شێر ماوەیەکی زۆر ددانی بە جەرگی خۆیدا گرت. ئاخرەکەی ناچار ڕوویکردە پشیلەکە.

-تۆ کۆنە ئاشنای ئەو کابرایەی زمانی دەزانی، پێی بڵێ: ئەگەر وەك تۆ بچووك ببمەوە وازم لێ دێنێ؟ ئێستا ئاغای سەرۆك! ئەم شێری تەکساسە کە بچووك بۆتەوە شایانی ئەوەیە جایزەی ئاشتی بدرێتێ؟

سەرۆك: (ڕوی کردە کۆمیتە) دەڵێن چی؟

ڕێوی: ئاغای سەرۆك! بەپێی ئەو دیموکراسییە بەرزە کە شێوە و ڕەوشتی جەنابتانە دەنگ وەرگرن.

سەرۆك: کۆمیتە دەنگ بدات.

سکرتێر: بە زۆربەی دەنگەکان جایزەی ئاشتی نوبڵ دەدرێ بە کیسینجیر!

گورگ: پیرۆز بێ!

ڕێوی: پیرۆز بێ!

کەروێشك: بە پێی ئەو دیموکراسییە، جایزەی ئاشتی نوبڵ، ڕەنگە ئاخرەکەی وەبەر نیکسونیش بکەوێ!

سەرچاوە: لە گۆڤاری "ڕۆژی کوردستان"، بەغدا، ژ 21-22، 1974، ل 57-59دا.

1-تەکساس: یەکێکە لە ناوچەکانی ئەمریکا، ناوەندی کانگیستێرەکان و پیاوکوژەکان، شێری تەکساس کنایەیە لە ئیمپریالیزمی ئەمریکا.

2-مارسیلیا: بەندەرێکە لە فەرانسە، شێری مارسیلیا کنایەیە لە ئیمپریالیزمی فەرانسە، کە لە (دیان بیان فو) کرا بە پشیلە.

نمونەی شیعر

# پەیمانی دوولایی
# جەحای چەرخی بیست*

-1-

رۆژێ کابرایەك بانی سواخ ئەدا
بردیە بان گەڵی ئاو و گڵ و کا
قورەکەی خۆش کرد، دەستی کرد بە سواخ
بانی تەواو کرد، گەیشتە قەراخ
کە ڕوانی ئیشی سەیری کردوە
ڕێی هاتنە خواری لە خۆی بەستوە
ڕێگەی هاتوچوی بانی سواخ داوە
لەو گوێسەبانە بێ ڕێ داماوە
بیری کردەوە، تەگبیر و ڕای کرد
پەی بە هیچ ڕێگەی ڕزگاری نەبرد
گوتی خەڵکینە چارێکم بکەن
لەم داماویە نەجاتم بدەن
ئەوانیش هیچیان عەقڵیان پێ نەشکا
گوتیان: سەبرکە بانگ کەین لە مەلا
مەلا نەصرەدین بەناوبانگ جەحا
هاتە پێش، گوتی: چتان لێ قەوما؟
گوتیان: ئەم کابرا لە بان داماوە
ڕێی هاتنە خواری لە خۆی سواخ داوە
ئەتۆ پیاوێکی ژیر و بە فکری
وەرە بزانە بەڵکو دای بگری
گوتی: بۆ ئەمە زەحمەتم ئەدەن
بە هەموو لاتان ڕێگەی پێ نابەن؟
بۆی هەڵدەنە بان سەری گوریسێ
بە چەشنی پشتێن لە قەد خۆی بەسێ
سەرەکەی تری گشتتان ڕای کێشن
دای ئەگرنە خوار بە کوێری دوژمن!
کابرا گوریسی بەستە ناو قەدی
کێشایانە خوار هێجگار بە توندی
لە قورسی خۆی و بە زەبری کێشان
دایان بە زەویا گشت لەشیان شکان
خەڵکەکە گوتیان: ئەرێ مامۆستا
توخوا چۆن عەقڵت بەم کارە شکا
گوتی: من دنیام زۆر ڕابواردوە
زۆر بەرژەوەندم لە کار کردوە
منداڵ بووم ساڵێ باوکم کەوتە بیر
لێی کۆبوونەوە پیاوماقوڵ و ژیر
گوریسیان داهێشت بەستیە ناو قەدی
هەڵیان کێشا سەر، کاتێ ئەمەم دی
کردمە سەر مەشق، بۆ ڕۆژی قەومان
ئەوا ئەمڕۆکە هاتە فریامان

-2-

ئینگلیسیش حەلفی بەغدای سواخ ئەدا
لە گوێسەبانەی عێراقا داما
زۆری سەرنج دا، سەری هێناو برد
ڕێگەی ڕزگاری خۆی بەدی نەکرد
(هەرکەسێ داوی بۆ خەڵك دانا
خۆی بەو داوەوە ئاخر گیر ئەخوا)
داوی نایەوە بۆ تورك و ئێران
بۆ خەڵکی عێراق لەگەڵ پاکستان
بۆی ببنە سەنگەر لە پێش سوپای سوور
پێیان پێ بکەنێ، سەیریان کا لە دوور
ئەم میللەتانە بەقرچن گشتیان
لە سەرمایەی ئەو نەکەوێ زیان
شۆڕشی عێراق ڕێی لێ بردە بەس
داما، وەك برمێ بە سەریا هەرەس
ئینگلیس: گوتی: ئەی خەڵکی ڕۆژاوا هاوار
بە فریام بگەن جارێکە و ئەمجار
لەم بانە بەرزە خراپ داماوم
کەوتە قاچی خۆم گشت تەلەو داوم
خەڵکی ڕۆژاوا–گوتیان: ئەم کارە، کاری جەحایە
جەحای ئەم چەرخەش مام ئەمریکایە
هانایان بردە جەحای مام چەرخی بیست
ئایزەنهاور– "کاتێ هاواری مام ئینگلیسی بیست"
گوتی: ڕاوێژی ناوێ کاری وا
لەم تەنگانەیەی دەردێنم ئێستا
کەشتی و فڕۆکە و بۆمبا و تۆپخانە
ببەستنە قاچی لەسەر ئەو بانە
جا، لە لوبنان و ئوردون تەکان دەن
تا بڵێی یەك و دوو ڕزگاری ئەکەن
فەرماندەرانی ئەمریکایی– کە خستیانە پێی گوریسی سوپا
دنیا بە جارێ لێی کردنە هەرا

میللەتی سوفیت گاڵتەی پێ ئەهات
ئەیگوت: هیچ شێتێ کاری وا ناکات
پێی پێئەکەنین شەش سەد ملیۆن چین
جگە لە باقی خەڵکی سەرزەمین
قاقای ئازادی خوازانی دنیا
دەنگی دایەوە، گەییە ئەمریکا
خەڵکی ئەمریکا– گوتیان: ئەم ڕێگەت
چۆن بە بیرا هات؟
ئابڕوومان پێی چوو لە هەموو وڵات
ئەو قوڕ بە سەرەش گشت لەشی ورد بوو
ئەوا ئوردونیش لە چنگی دەرچوو
ئایزەنهاور– گوتی: جەحایی خەڵکی
وەك ئێوە
خێر و سوپاسی ئاوای وا پێوە!؟
نازانن جەحاش باوکیان وا دەرکرد
ئەگینا لەناو چاڵاوا ئەمرد؟
کابرای بەنناشیان هەروا هێنا خوار
ئەمانەن سەرمەشق لە ڕووی ڕۆژگار
ئەمانە گشتیان نموونەی کارن
ئازووقەی بیری پیاوی هۆشیارن
کارانی دنیا هەموو، وەك یەکن
گشت بە شێوەیەك بەڕێوە ئەچن
هەردوو مەسافەن، بەرزی چالایی
هەردووکیان تامن شیرینی و تاڵایی
هەردوو، واسطەن سوپا، یاگوریس
هەردوو، داماو بوون بەننا، یا ئینگلیس
ڕێگەی ڕزگاری فەننی ئەمەیە
ئیتر کەی جێگەی پرتەو بۆڵەیە؟
خەڵکی ئەمریکا– تێکرا کەوتنە قاقای
پێکەنین
گوتیان: بەم فەننە هەرگیز ڕازی نین
ئەمەی تۆ ئەیڵێی دوورە لە جەحایی
هەر بروێش ئەکەی وەکو کونە
جەحای چەرخی بیست ئێسکت خواتەوە
بۆ ئەو هونەرەی وا بە لاتەوە
خۆمان– هێزی ئازادی هیچ پێشی ناگرێ
با ئایزەنهاوریش لە داخا بمرێ
هەر میللەتێکی وریا بێتەوە
وەك لافاو ئەڕوا بەرەو پێشەوە



بەری لێ ناگرێ هیچ هێز و سوپا
سوپاو کا، وەك یەك ئەڕفێنێ و ئەبا
شۆڕشی چین و فێتنام و کۆریا
هەموویان دەرسن بۆ مام ئەمریکا
بەڵام سەر شێتە و بە هەڵە ئەچی
بان و چاڵاوی لێ وەکو یەك دێ
گەڕایە دواوە گەلە کەشتی شەش
(زستان تەواو بوو خەڵووز ما ڕوو ڕەش)
یانی ئیستیعمار باوی بەسەر چوو
ڕووی خائنانی میللەتان ڕەش بوو
زەنجیری حەلفی بەغدا هەڵبڕا
تاپۆی ئوردون و لوبنانیش درا
تازە خەریکە جەحای ئەمریکا
پەیمانە شڕەی پینە و پەڕۆکا
بوەوە خوری ڕیسەکەی بەغدا
تازە پەیمانی دوولا، با، ئەدا
لەگەڵ ئێران و تورك و پاکستان
(هاوین ئەخوازێ کرێوەی زستان)
دوو لای لە پێنج لا، پێی قایمترە
ئافەرەم چەندە ژیر و بە فکرە!
تازە ئەیەوێ پەیمان پەڕۆ کا
خۆی لەوە زیاتر سووك و ترۆ کا
پێشی ئازادی بە پەیمان بگرێ!
نازانێ خۆی و پەیمانی ئەمرێ
ئاگرێ بە بەنزین ناکوژێتەوە
مردوو بە قاقەز نابووژێتەوە
غەدر بەنزینی ڕێی ئازادیە
بۆ غەددار، مەرگ و نامرادیە
بە پشتیوانی میللەتی سوفێت
ئیستیعماری ڕەش ڕۆژی دوایی دێت
شۆڕشی عێراق چرای گەلانە
بانگی ئازادی و زۆردار نەمانە
جەژنی ئازادی گشت ڕۆژهەڵاتە
جەژنی ئیستیعمار هەڵات، هەڵاتە
ئەی قارەمانی عێراق هەر بژی
وەك ئەم موعجیزەت بۆ هێنایە دی

*چاپخانەی نجاح– بەغدا، 1959.

# لەبارەی وەرگێڕانی "گێلە پیاو"ەوە*

کتێبی (گێلە پیاو) بە قەڵەمی نووسەری ناسراوی ئەم سەردەمەی تورك: عەزیز نەسین، کاك عەبدوڵڵا حەسەن زادە کردوویەتە کوردی و، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی لە وەزارەتی ڕۆشنبیری و هونەری کۆماری عێراق بڵاوی کردۆتەوە.

کاك عەبدوڵڵا دانەیەکی لەو کتێبە بۆ من ناردبوو، داواشی کردبوو ڕای خۆم لە بارەی کارەکەی بنووسم. بۆ ئەوەی لە قسەی ئەو برادەرە خۆشەویستە دەرنەچم، نەختێ لەم بارەیەوە دەدوێم.

عەزیز نەسین نووسەرێکی (ساتیریك) یا خۆمانە بڵێین: بە تەوس و توانج و ئیتاڵییە. نەشتەری قەڵەمەکەی لە کوان و دمەڵی کۆمەڵ دەدا و کێم زوخاوی دەردەخات. بە تەڕدەستی (ئەوەی لە دیزەدایە بە ئەسکوێ دەری دەهێنێ). بە ڕاشکاوی، چەوت و چەوێڵی و نالەبارییەکانی ڕیژێمی فیئودال- بورژوایی وڵاتی خۆی وەبەر لیس و تێڵای گاڵتە و تیتاڵی دەدا و ئاگری پێکەنینی پێوە دەنێ. وای گڕ تێبەردەدا ئەگەر چاوی کۆنەپەرستی بارانی پەڵەشی بەسەردا ببارێنێ ناتوانێ دایمرکێنێ. لە (گێلە پیاو)یشدا هەر وایکردووە.

عەزیز نەسین بۆ نووسینی (گێلە پیاو) ڕەنگە لە ڕۆمانی (چارە ڕەشەکان- البؤساء)ی ڤیکتۆر هۆگۆ (1802-1885) ئیلهامی وەرگرتبێ. لە چیرۆکی (گێلە پیاو)دا کە دەگەیە لاپەڕەکانی (203-206) کە (گێلە) دەبێتە بەڕێوەبەری قوتابخانە و بەم بۆنەیەوە جێژنی بۆ دەگرن و، لە جێژنەکەدا دەیەوێ پێشینەی خۆی بدرکێنێ و دەڵێ: (هاوڕێییان! ڕێگا بدەن پێ لە گوناهی خۆم بنێم. زیاتر لەوە ناتوانم خۆم ڕاگرم. من تووشی ئازاری ویژدان بووم. وەرن بمگرن!) تەواو، ئەو دیمەنەت بیر دەکەوێتەوە کە پاڵەوانی ڕۆمانەکەی ڤیکتۆر هۆگۆ سەرۆکی شارەوانییە و زۆر خزمەتی شارەکەی کردووە و، لە لایەن ئیمپەراتۆرەوە. لەقەب و نیشانی بۆ دێ، بەم بۆنەیەوە جێژنی بۆ دەگرن و لە جێژنەکەدا ڕاستی خۆی دەڵی و خۆی بە گرتن دەدا.

ئەمە نابێتە کەموکوڕی بۆ کارەکەی عەزیز نەسین، نووسەری گەورەی وا لە دنیادا کەم نین کە ئیلهامیان لە یەکتر وەرگرتووە و، تەنانەت (اقتباس)یشیان لە کاری یەکتر کردووە. بۆ نموونەی (اقتباس) وتەیەکی ماکسیم گۆرکی دەگێڕینەوە کە دەڵێ: (کاتێ هەوەڵ جار "فاوست"م موتالا کرد نزیکەی بیست ساڵانە بووم، دوای ماوەیەك تێگەیشتم کە دوو سەد ساڵ پێش "گۆتێ"ی ئەڵمانی، کەسێکی ئینگلیسی کە ناوی "کریستۆفێر[1] مارلۆ" بووە، بەسەرهاتی "فاوست"ی نووسیوە.. وە تەواوی ئەو کتێبانەی لە بارەی "فاوست" نووسراون لە سەرچاوەی ئەفسانەیەکی سەدەکانی ناوەڕاست هەڵقوڵیون.

ڕەوتی چیرۆکەکە لە لاپەرەکانی (78-79)دا وەکو جێگاکانی دیکەی ڕەوان نییە و نەختێ لێڵە. لەو جێگایەدا (گێلە) سەرۆکی لقی بانکە لە قەزایەك، ئەفسەرێك کە دراوسێی هۆدە و ئاشنایەتی، شەوێك جلکەکانی (گێلە) وەردەگرێ و پێیانەوە دەچێتە سەر بانگەهێشتن و دوو شەو و دوو ڕۆژ نایەتەوە. دواجار فەرمانبەری دایرە دێ بە دوای (گێلە)دا کە بچێ بۆ دایرە، لەبەر بێ جلکی ناتوانێ بچێ. ئاخرەکەی جلکی ئەفسەرەکە دەکاتە بەری و دەچێ..

لێرەدا وەڵامی ئەم پرسیارانە دیار نییە: لە قەزایەکی بچوك ئەو ئەفسەرە چۆن دوو شەو و دوو ڕۆژ سۆراغی نییە؟ چۆن نەچۆتە سەرکار، ئەگەر چووە چۆن بە جلکی ئەهلییەوە چووە؟ گێلە کە سەرۆکی لقی بانکە و پارەشی هەیە چۆن تاقە دەستێکی جلك هەبووە؟ بۆچی پارەی نەداوە بە فەرمانبەرەکە بچێ دەستێ جلکی بۆ بکڕێ؟ یا نەیناردۆتە لای یەکێ لەوانەی لەژێر دەستیدا کاریان دەکرد دەستێ جلکی بۆ بخوازێتەوە؟ نووسەر بەسەر ئەوانەدا تێپەڕیوە و بە پەلە (گێلە)ی بە جلکی ئەفسەرییەوە سواری تەیار کردووە و، بەرەو بەسەرهاتەکانی دوایی خستویەتە ڕێ.

بەهەرجۆر ئەمە وەکو سەرەتایەکی قسە، ئیشارەیەکی بچووك بوو بۆ چیرۆکی (گێلە پیاو) ئەگینا لێکۆڵینەوەی چیرۆکێکی (380) لاپەڕەیی، هەروا بە دەم ڕێوە و بە سوك و هاسانی سەرناگرێ.

ئێستا دێینە سەر ئەسڵی مەبەست کە وەرگێڕانەکەی کاك عەبدوڵلایە. وەرگێڕانێك بە باش دەژمێردرێ کە لە پێش هەموو شتێکدا وشەکان دروست بن، وتەکان پڕ پێست لە قاڵبی زمانی کوردیدا داڕژابن، مانای وتەکانی تێکستە ئەسڵییەکە بە ڕۆشنی گەیەندرابێ، ڕەوتی مەبەستەکە لە وەرگەڕاوە کوردییەکەشدا ڕەوان و بێ گرێ و گۆڵ بێ. بە کورتی ئەوەندە ڕێکوپێك بێ، ئەگەر لە سەدا سەدیش نەبێ، بە لانی کەمەوە تا ڕادەیەکی زۆر خوێنەر وایدانێ کە ڕاستەوخۆ بە کوردی نووسراوە. هەستی ئەمە کە لە زمانێکی ترەوە بە ناڕەوانی کراوە بە کوردی، هەر تاوە نا تاوێك وەکو چقڵ بە چاویدا نەچێ و هەراسان و جاڕزی نەکات.

وەرگێڕانەکەی کاك عەبدوڵلا لەم بارەیەوە تەواوە. وشەکان دروستن و، وەکوو گای مۆزکرد و پاش و پێش و ئەملاو ئەولایان پێنەکراوە و لە جێی خۆیاندان. وتەکان ڕێکوپێکن. ڕاوێژی دەم و قەڵەم ڕەوانە و، مەبەست و مانا ئاڵۆز و کوت و بچڕ نەبووە. خوێنەر دەتوانێ تا ڕادەیەکی زۆر و بگرە نزیکەی سەدی نەوەد و پتریش لە تێکستە کوردییەکە دڵنیا بێت و بیری خۆی بە ڕەوتی چیرۆکەکەوە خەریك بکات. ناڵێم لە سەدا سەد. چونکە جاروبار و کەم کورتێك پێچەوانەی ئەمە دەبینرێ. هەروەها کە دەشڵێم (تێکستە کوردییەکە) مەبەستم بە چەشنی گشتییە، تا دیالێکتیش بگرێتەوە. پاشان دەگەڕێینەوە سەر ئەم دوو مەبەستە.

عەزیز نەسین وەکو گوتمان نووسەرێکی (ساتیریك)ە، چزووی قەڵەمی لە کار و کردەوە و نەریت و ئاکاری چینی سەرەوەی کۆمەڵ دەچەقێنێ و، بۆ چینەکانی خوارەوە و هەرەمەی خەڵك دەنووسێ. لەبەرئەمە بە زمانی ئەمان، یانی سادە و ڕەوان دەنووسێ و زاراوە و کینایە و مەجاز و ئیشارە و تەوس و توانج و قسەی نەستەق و پەندی پێشینانی ئەمان زۆر لەکار دەکا و دەهێنێ. سەبارەت بەمە وەرگێڕانی نووسراوەکانی ئەو کارێکی سووك و هاسان نییە. کەسێك دەتوانێ وەریانگێڕێ کە لە زمانی هەرەمەی گەلی کورد زۆر شارەزا بێ و بەرامبەرەکانی ئەو تەوس و توانج و تەنانەت جنێوانە.. لە کوردیدا بدۆزێتەوە و لە جێگای خۆیاندا دایان نێ. دەنا ئەگەر وشە بە وشە بیانکاتە کوردی شتێکی زۆر بێتام و بێزراو و پووچەڵیان لێ پەیدا دەبێ. کاك عەبدوڵلا ئەم کارەی زۆر جوان لە دەست هاتووە، وەك ئەمانەی خوارەوە:

-(دوو کچی قەیرەی هەبوون)، لا 76

-(سەرلەنوێ نێوکم بڕا و ناوم نرا "کامل")، لا 138 (ناوك)یش دەگوترێ.

-(ئەو جینگەنەیی جارانم نەمابوو)، لا 140.

-(هاورێشمی خاسە ڕەنگ..)، لا141.

-دێیەکی زۆر چەپەك و پەنا..)، لا 214.

-(لە شوێنێکی پەسیو پاروەنانێك پەیداکەم)، لا 217.

-(ئارام و ئۆقرەم لێ هەڵگیرابوو)، لا 225.

-(کوڕینە! لە تەنگانەدا هەمیشە پشووتان سەرخۆبێ)، لا225.

-(هەر لەگەڵ چاوم بە ڕوکاری سەرۆك کەوت ناسیمەوە)، لا 226، (ڕوکار) بە مانای ڕوخسار، زۆر جوانە.

-(دووبارە دەتگرنەوە و دات دەکەنەوە)، لا 244.

-(چما تا ئێستا نەتدیوە..)، لا 250.

-(تەححا.! ئەدی چۆن..)، لا 253.

-(ئاغا! لە خۆڕینی باش نییە)، لا 282.

-(بە جارێك زەندەقی بردم)، لا 296.

(زەندەق) لە (زەند) و (زەندە) وەرگیراوە کە دوو وشەی زۆر کۆنن. ئەوی هەوەڵیان بە مانای گیان و ڕۆحیش هاتووە، دووەمیان بە مانای گەورە و مەزن. پاشان بۆتە (زەندەك) و کافیش گۆڕاوە بە قاف و بۆتە (زەندەق). بە مەجاز بە مانای (جورئەت و جەسارەت)ە.

-(بورهان شەیپوری قوڕبەسەر دەم لە پوش بوو)، لا 297.

-لەوەی ئەو ئینسانە دڵپاك و نیاز پاکانەم فریو دابوو بە خۆمدا دەشکامەوە، لا 204.

-(گیرفانیان بڕیبووە و بە فلسم دەکوت فەتاح بەگ)، لا 195، پتر (فەتاح پاشا) دەگوترێ.

-(هێشتا لە قوڵکەیەك ڕزگار نەببووم خەریك بوو بمخاتە چاڵێکەوە). لا 196.

_(پێش.. ئەوەی ئۆرهانی ئەسڵی بێ فیز ماڵکی بدەمێ)، لا 192.

-(بەڵام تازە لە چی دەترسام، پاش ڕووتکردنێ تەشتی تەڵا لەسەر سەرت دانێ)، لا 211، پتر دەڵێن: (تەشتی تەڵا بە سەرەوەنێ).

-(ئەوان نەیاندەزانی من بەچی دەخوڕم و پشتم بە چ ئەستوورە کە قسەم وانێرن)، لا 211.

-(باش پێوە ببووم، ئەملاو تات و ئەولام تات)، لا 282.

(تات) بە مانای بەردی پان و درێژە، وەك: (تاتە نوێژ)، (تاتە شۆر) یەکەمیان بەردی نوێژ لە سەرکردنە، دووەمیان بەردی مرد و لەسەر شۆردن. لە گۆرانیدا هاتووە: "لەسەر تاتەشۆر هەر تۆم لەبیرە".

(ئەملام تات و ئەولام تات وەی دایە جیقم دەرهات) مەتەڵوکەیە بۆ (ئاش).

-ژنەکە دەستی کرد بە بۆڵەبۆڵ: ئەتۆش سەگت بە دیاری بۆ هێناوین)، لا 130.

ئەمانە هێندێ نموونە بون لەو وشە ڕەسەن و، کینایە و مەجاز و قسە نەستەقە جوانانەی کە لە ناو هەڕەمەی خەڵکدا باون و کاك عەبدوڵڵا لە وەرگێڕانەکەی خۆیدا هێناونی.

لە پێشدا گوتمان: (خوێنەر دەتوانێ سەدی نەوەد و پتریش لە تێکستە کوردییەکە دڵنیابێ). ئەو سەدی چەندەی دیکەمان بۆ ئەوە هێشتەوە کە کاکی وەرگێڕ جاروبار لە وەرگێڕانەکەیدا وەدوای تێکستە فارسییەکە کەوتووە، وەك:

–(پیوو) لاپەڕە (180) کە وشەیەکی تورکییە و وا دیارە وەرگێڕی فارسی هەروەك خۆی هێناویەتی. لە کوردیدا دەڵێن: (هەی هەی)، (حەییەی حەی). ژننا (ئەللەل)یش دەڵێن. خۆشی لە پەڕەی (141)دا (هەیهو)ی هێناوە کە زۆر جوانە.

–(بە چ ڕوویەکەوە دەمتوانی بچمەوە لایان) لاپەڕە (180). وا بزانی وا جوانتر بوو بگوترێ: (چۆنم لەڕو دەهات)، (چۆن لە ڕوم هەڵدەهات)، (چۆن بەخۆدا دەپەرموو).

–(گوزەرانی پێدەکەم لاپەڕە (182). کوردییە ڕەسەنەکەی ئاوایە: (پێی بەڕێ دەچووم). (گوزەران)یش بەڕێچوونە.

–بەڵام ئەو دەسۆبەردار نەدەبوو) لاپەڕە (184). لە کوردیدا دەگوترێ: (بەڵام ئەو دەستی هەڵنەدەگرت)، (.. وازی نەدەهێنا)، (لە کۆڵ نەدەبۆوە).

–(چ دەبێ بکەم) لاپەڕە (185). باشتر بوو بگوترایە: (دەبێ چ بکەم).

(پاش حەوت– هەشت ساڵ ڕابردوەکەم لە بیر خەڵك دەچێتەوە) لاپەڕە (141). ڕەنگە (پێشینەکەم) جوانتربێ. خۆشی لە لاپەڕە (247)دا ئەمەی بەکارهێناوە.

–(ئەوەندە دەست و پێی خۆم ونکردبوو) لاپەڕە (215). وشە بە وشە وەریگێڕاوە. کورد ئەمە ناڵێ. خۆشی هەر لەو لاپەڕەیەدا، لە جێگایەکی دیکە کوردییە ڕەسەنەکەی هێناوە: (ئەمن ئەوەندە تێکچوبووم). یا دەگوترێ: (ئەوەندە سەرم لێ شێوابوو)، (ئەوەندە پەشۆکابووم)، (ئەوەندە پەشێو بووم).

–(هەرچۆنێك بوو هاتنی من لەگەڵ جێژن و شادمانی خەڵك بەرەو ڕوبوو) لاپەڕە (332).

وەرگێڕانەکە وشە بە وشەیە. دەبوو بگوترێ: (کە من گەیشتمێ خەڵك لە خۆشیانا کردیانە جێژن و شایی)، (هاتنی من بووە جێژن و شایی بۆ خەڵکەکە).

–(ئاغای گوڵی کرد و لە قاقای پێکەنینیدا) لاپەڕە (241). کاك عەبدوڵڵا وە دوای تێکستە فارسییەکە کەوتووە، وەرگێڕی فارسیش وا دیارە دوای تورکییەکە کەوتووە. لە تورکیدا دەڵێن: (ئاگا گولدی) یانی ئاغا پێکەنی. بەڵام لە فارسیدا ناگوترێ: (ئاقا گل کرد). بەڵام دەگوترێ (آقا محبتش گل کرد) یانی مەحەبەتی بشکوت. دەبوو بگوترێ: (ئاغا وەك گوڵ گەشاوە و لە قاقای پێکەنینیدا).

–"ئێمە هەمیشە کەسێکمان دەوێ خەڵکی سەرگەرم بکا" لاپەڕە (242). دەبوو بگوترێ: (خەڵکەکە سەرقاڵ کا)، (خەڵکەکە بخافڵێنێ)، (خەڵکەکە خەریك کا).

–(نەیدەتوانی خۆی بپارێزێ و پەتەی کەوتە سەرئاو) لاپەڕە (242). وەرگێڕانەکە وشە بە وشەیە. دەبوو بگوترێ: (نەیدەتوانی وریایی خۆی بکا، یا نەیدەتوانی ئاگای لە خۆی بێ و باقری دەرکەوت)، (.. لێی ئاشکرابوو).

–منیش بە تەنی لەو کێو و وەجان هاتبووم) لاپەڕە (253) (گەیشتبووە گیانم)، (لە گیانی خۆم وەڕەز ببووم).

–(بۆ خۆشم نەمدەزانی سەرەنجامی ئەم کارە بە کوێ دەگا) لاپەڕە (254) – (خۆشم نەمدەزانی ئاخرەکەی ئەم کارە دەگاتە کوێ)، (خۆشم نەمدەزانی لەم کارەدا چم بەسەردێ).

–(دەرگای وا لە ناکاو کردەوە کە سواخی ئەملاو ئەولای هەڵوەری) لاپەڕە (258)– (دەرگای وا توند و لە ناکاو کردەوە کە سواخی لاشیپانەکانی بەربۆوە– یا کەوتە خوارەوە).

–(پەیکەری زل و زەبەلاحی جەنابی نەقیب وەژورکەوت) لاپەڕە (259). پەیکەر وشەیەکی فارسییە بە مانای (صورت و جثە)ی عەرەبییە. نالیش لە کوردیدا بەو مانایەی بەکارهێناوە: (هەی کەرێکم بۆ چ پەیکەر تەیکەری هەوراز و لێژ). ئێستا لە کوردیدا بە مانای (تمثال–جسم) بەکاردێ. لە جێگای وادا (قەڵافەت) باشترە، وەك شێخ ڕەزا لە باسی کەڵەشێرەکەیدا دەڵێ: (بە قەڵافەت وەکو مەولان بەگەکەی..).

–(من زۆرم ئەو شیرنیکارییانە دیبوو) لاپەڕە (260). شیرنیکاری وشە و زاراوەیەکی فارسییە بەمانای مەخسەرە و گەپ و گاڵتەیە. لە کوردیدا بار نییە. لە جیاتیان دەبوو بگوترێ: (.. زۆرم ئەو کونگە لانەبەسەر هاتبوو)، (پەندی وام زۆر پێدرابوو) یان هەڕەمەیی بڵێین: (قوڕ و چڵپاوی وام گەلێ بە قونان هەڵپەڕیبوو).

–(لە بەندیخانە لەنێو لاتەکاندا باوە) لاپەڕە (260). لات وشەیەکە هەڕەمەی خەڵکی فارس دەیڵێن و، بە مانای (شقاوە)ی عەرەبییە. لە کوردیدا بە کەسێکی هەژار و بێبژێو دەڵێن وەك: (ئەوەندە لاتە سەگ کلکی لێدا دەکەوێ). لە جێگای (لات)ی فارسی، لە کوردیدا دەگوترێ: سەرسەری، چەقاوەسوو، لاپرەسەن، لالەوەڕ، لاسار. لە شاربازێڕ (چەورە)ش دەگوترێ.

–(بۆئەوەی خۆی بنوێنێ ئەم جۆرە دەستە گوڵانە بە ئاودا دەدا) لاپەڕە (260). دەبوو بگوترێ: (بۆئەوەی خۆی ڕابنێ، یان، بۆ خۆڕانان ئەم فڕوفیشاڵانە دەکات) یا (ئەم گۆنگەڵانە دەگێڕێ).

لە کوردیدا لە جیاتی (دەستە گوڵ) کە فارسییە و بە ئیملای کوردی نووسراوە – چەپکە گوڵ و دەسکە گوڵ دەگوترێ. ئەوە نییە لە کۆتایی حیکایەتدا، حیکایەت بێژ دەڵێ: (دەسکێ، یان، چەپکێ گوڵ و نێرگز مەرگی ئێوە نەبینم هەرگیز). (دستە گل بە آب دادن)

کینایەیەکی فارسییە، وا دیارە ئیشارەبێ بۆ حیکایەتێکی کۆن کە لەبیرچۆتەوە و تەنیا کینایەکە ماوەتەوە. حیکایەتەکە گوایا ئاوایە: (عەباسە، خوشکی هارونە ڕەشید "800ز" وەکو مێژوونووسەکان دەڵێن و لە شیعری شاعیرەکاندا هاتووە، نێوانی لەگەڵ جەعفەری بەرمەکی هەبووە. جۆگەیەك ئاو بە ماڵی عەباسەدا ڕۆیشتووە و چووە بۆ ماڵی جەعفەر. عەباسە نامەی بۆ جەعفەر دەنووسی و دەینا ناو چەپکێ گوڵ و، لە حەوشەی خۆیانەوە چەپکە گوڵەکەی بە ئاودا دەدا. جەعفەریش لە حەوشەی خۆیان لەسەر جۆگەکە دەوێستا و چەپکە گوڵەکەی دەگرتەوە. چلوچۆکەر پێیان زانی و بۆ هارونە ڕەشیدیان گێڕاوە. دەڵێن ئەمە بووە هۆی فەوتانی بنەماڵەی بەرمەکی).

ئەمە (تراژیدیان). ئەرەستۆ دەڵێ: تراژیدیا ئەوەیە کە کار پێچەوانەی خۆی لێ پەیدا ببێ. یان بە عەرەبی: (تحول الفعل الی ضده). عەباسە ئەو کارەی سەبارەت بە عیشق و خۆشەویستی کردووە، کەچی بۆتە هۆی فەوتانی بنەماڵەی بەرمەکی. لە فارسیدا ئەو کینایەیە بۆ کارێکی دۆستانە و خۆشەویستانەی وا بەکاردەهێنرێ، کە ببێتە هۆی مەینەت و چەرمەسەری. جا بەم پێیە وەرگێڕی فارسی لە جێی خۆیدا بەکاری نەهێناوە. کاك عەبدوڵلاش کە وەدوای ئەو کەوتووە تووشی هەڵەکەی ئەو بووە. پێویستە ئەوەش بڵێین کاتێ ئەم قسەیە دروستە کە لە تێکستە فارسییەکەدا ئاوا بووبێ.

-(دەمم کرایەوە و گوتم "زەکی") لاپەڕە (260). (زەکی) لە فارسیدا وشەیەکی سوکە. لە کوردیدا لە جیاتی ئەوە دەڵێن: (تڕحەو). نەختێ بە ئەدەبی تر و بە مەجاز دەڵێن: (تەڕت نەپێکا!).

-(بە تایبەتی ڕیشی ڕەش و بە پشتی من..) لاپەڕە (266)- (ڕیشەڕەش و پڕەکەی من).

-(لێفە و دۆشەکەکەم لە بەندیخانە بڵاوبکەمەوە) لاپەڕە (277)- (بەم زوانە پێخەفەکانم لە بەندیخانە ڕاخەمەوە).

-(دەبێ.. بە قازانجی بورهان دەستبەکار بم) لاپەڕە (278)- (بە قازانجی، یا بە سودی بورهان بکەومەخۆ- بکەومەکار- هەوڵبدەم- خەریك بم).

-منیش ڕاست دوچاری ئەو حاڵە ببووم) لاپەڕە (279)- منیش هەر ئاوام لێقەومابوو- وام بەسەر هاتبوو).

-(نوێنەری ئاغا..) لاپەڕە (279)- (پیاوی ئاغا- کوێخا ئاغا- گزیری ئاغا).

-(ئەمە چ گوکارییەکە؟) لاپەڕە (362)- (ئەم کارە گوواویە چییە؟).

-(تەباخەکە بە جارێك دەست و لاقی خۆی ونکرد و زمانی ڕەق بوو) لاپەڕە (362)- چێشتکەرەکە بە جارێك پەشۆکا)، (سەری لێشێوا و زمانی بەسترا، دەمی ڕەق بوو).

-(لە پێشدا ئەگەر بە تاوانی کڵاو لەسەرنان دەگیرام هیوایەکی بەربوونم بوو) لاپەڕە (209)- لە پێشدا کە لەسەر ساختەچییەتی، کەڵەکبازی، دەستبڕی و گوێبڕی دەگیرام..

-(دیسان ڕۆژنامەکان هەنگامەیەکیان بەرپا دەکرد) لاپەڕە (209)- دیسان ڕۆژنامەکان قولە و هەرایان دەناوە- بەیت و باویان ڕێکدەخست، لە هەرایان دەدا.

-(شاڵوارێکی مەخمەری کۆنم لەبەردا بوو..) لاپەڕە (114)- لەپێدا بوو. بۆ جلکی لای خوارەوەی لەش وەکو دەرپێ و پانتۆڵ و ڕامگ، لەپێدابوون دەگوترێ. بۆ جلکی لای سەرەوە، یا بۆ دەستێك جل، لەبەردابوون دەڵێن، وەك کەوایەکی ڕەشم لەبەردابوو، یا ڕانك و چۆغەی سوورم لەبەردا بوو.

-(بێدەنگ بە کڵاوچی دز!) لاپەڕە (101)- بێدەنگ بە ساختەچی دز!، دەغەڵی دز! کڵاوچی لە کوردیدا نالوێ.

-(زۆر باشە بڕۆ دەست بەکاربە) لاپەڕە (95) -بچۆرە سەرکار، بچۆ کاربکە، بڕۆ خەریکی کاربە.

-دوکەڵ لە کەللە سەرم هاتەدەر..) لاپەڕە (78)، لە کوردیدا ئەمە ناگوترێ- ئەقڵ لە کەللەمدا نەما، واقم وڕما، لەدین دەرچووم.

-(ئەوەندە دەستەپاچە ببووم..) لاپەڕە (129) -ئەوەندە تێك چووم، ئەوەندە پەشۆکام، بە جۆرێکی وا سەرم لێشێوا.

-(بەتانی خۆم لێ بڵاوکردەوە) لاپەڕە (210)- بەتانی خۆم لێ ڕاخستەوە.

-(ئەسپەکان بەغار بەرە و کوێستان دەڕۆیشتن) لاپەڕە (225)- ئەسپەکان بەرەو چیا، بەرەو کەژ، بەرەو کۆسار (هەورامی) کەوتنە غار. وشەی (کوهستان) لە فارسیدا یانی جێگای شاخاوی. چونکە لە دوو کەرتی (کوە) بە مانای چیا و (ستان) بە مانای جێگا تێکخراوە. بەڵام (کوێستان) یا وەك لە ناوچەی سنە و شارەزوور دەڵێن (کێوسان) لە کوردیدا بە مانای جێگای ساردە، وەك دەڵێن: (گەرمێن و کوێستان دەکا). یا وەك لە گۆرانیدا هاتووە: (کوێستانان خاڵ خاڵ بەفری ناچیتۆ- یارم تۆریاگە ئاشتی نابێتۆ).

-(هاوڕێکەت ئازاد بوو) لاپەڕە (215)- (هاوڕێ) بۆتە زاراوەیەکی سیاسی. وا باشتر بوو بگوترێ: هاو هۆدەکەت، هاودەنگەکەت، برادەرەکەت.

ئەمانەش هێندێ لەو وشە و کینایە و مەجازانەی کە وشە بە وشە لە تێکستە فارسییەکەوە کراونەتە کوردی و، لە زەمانی ئەدەبی کوردیدا جوان نین. وە لەبەر چوار مەبەست بە تایبەتی پەنجەم خستە سەر ئەمانە: یەکەم جوانی وەرگێڕانەکە دەشێوێنن. دووەم لە گەرمێن تێیان ناگەن. سێیەم لە جیاتی ئەوانە وشە و زاراوە و کنیایەی ڕەسەنی کوردی هەن و ئەگەر ئەمانە و هی وەك ئەمانە لە نووسیندا ببنە باو، هینەکانی خۆمان لە بیردەچنەوە و زیانێکی قورسمان لێ دەکەوێ. چوارەم بەشکم وردبوونەوە و لێکۆڵینەوەی

وشەكان لەناو قەڵەم بە دەستەكانماندا ببێتە باو، وشەی جوان و ڕەسەن لە هی چەوت و چەوێڵ و نادروست هەڵاوێردرێ. چونكە بەردی بناغەی شتی ئەدەبی، هێنانی وشەی دروست و ڕەسەن و جوانە. هەر شتێك بە وشەی نادروست، یان چەوت و چەوێڵ بنووسرێ، با بە ئاوی زێڕ و تەڵاش بێ بە شتێكی ئەدەبی ناژمێردرێ. یان بە لانی كەمەوە بە شتێكی ئەدەبی دزێو و ناڕەسەن وەردەگیرێ.

لەمەپێش گوتمان (تێكستە كوردییەكە بە چەشنی گشتی كە دییالێكتیش بگرێتەوە). مەبەست ئەوەیە وەرگێڕانەكە هێندێ شێوەی دییالێكت و ناوچەیی پێوە دیارە. یەكێ لەوانە (ی)ی زیادەیە، بۆ نموونە: (ئارەقێكی ساردم بە لەشیدا هات) لاپەڕە 126، (ئێستا ئەو كەرەی لەو قوڕەی وەپەڕێنە) لاپەڕە 209)، (ڕێگا لەوەی باشتر نابێ) لاپەڕە 291، (هێندێك كار لە پێش چاوی پیاوی زۆر هاسانن) لاپەڕە 90.

(ی)ی (لەشی)، (ئەو كەرەی)، (لەو قوڕەی)، (لەوەی)، (پیاوی) و هی تری وەك ئەمانە لە ڕۆژگاری كۆندا دەبێ ئەركێكیان بەجێگەیاندبێ و كەڵكێكیان هەبووبێ. بەڵام تێپەڕبوونی ڕۆژگار و (تطور)ی زمان لە كەڵكی خستوون و ئێستا لە زمانی ئەدەبیدا بوونەتە زیادی. پێویستە ئەوەش وەبیر بخەیتەوە كە ئەمە لە ئەمڕۆكەدا، كە زمانی ئەدەبیمان هێشتا شوێنەواری دیالێكت و (لەهجە)كانی زۆر پێوە ماوە بە هەڵە ناژمێردرێ و، تەنیا دەتوانین تۆزێ بە ناڕەوان و نافەسیحی دانێین.

لە وەرگێڕانی تەواو باشدا، ئەگەر لە تێكستە ئەسڵییەكەدا تووشی زاراوە یان ئیشارە بۆ بەسەرهات و حیكایەت و شتێكی وا هاتین كە لە زمانی كودیدا نییەو نەناسراوە، دەبێ ئەو زاراوە و ئیشارەیە بهێنین و لە داوێنی لاپەڕەكەدا ڕوونی كەینەوە. وەك: (هیچ لۆتییەك سەلوجی ڕەت ناكاتەوە) كە كاك عەبدوڵلا لە لاپەڕەی (282)دا هێناویەتی.

لۆتی لە كوردیدا بەو كەسانە دەڵێن كە تا پێش شەڕی دووەمی جیهانیش بە دێهاتەوە دەگەڕان و، بە دەهۆڵ و زوڕناوە ورچ و مەیموونیان هەڵدەپەڕاند. بە مەجاز بە ئینسانی بێعاریش دەڵێن. لە زمانی هەڕەمەی فارسیدا بە مانای (ابو جاسم)ی عەرەبی بەكاردەهێنرێ. لەو وتەیەی سەرەوەدا لە جیاتی (رند– ڕێییەكە ژێری هەیە) بەكارهاتووە كە لە ئەدەبی فارسیدا بە مانای بێباك و (لا ابالی و لاقید)ە. یانی ئەو كەسەی بە ڕواڵەت بۆ لۆمە دەشێ، بەڵام لە دڵ و دەروونی خۆیدا پاك و بێخەوشە. لە سۆفیگەریدا بە مانای وەشوێن كەوتنی (حق و حقیقە) و گوێنەدان بە ڕواڵەت و (تقلید)ە. (حافظ) ئەم وشەیە زۆر بەكاردەهێنێ. وەك: (مرا روز ازل كاری بەجز رندی نفر مودند) یانی ڕۆژی ئەزەل لە ڕیندی بەو لاوە كارێكیان بە من نەسپارد. لە كوردیدا (ڕەند) بە مانای جوان و جوامێرە. دەڵێن (كیژێكی ڕەندە) یانی جوان و شۆخە، (پیاوێكی ڕەندە) یانی جوامێرە. بە مانای زەوی بەیاریش هاتووە. (صبوحی) پیاڵەیەك شەرابە، ئەوانەی شەو سەرخۆش بوون بەیانی خواردوویانەتەوە. ئەمە لە شیعری حافزدا زۆر هاتووە. وەك (گرفوت شد سحور چە نقصان صبوح –از منی كنند روزە گشا طالبان یار) یانی با پارشێویش لە كیس چوبێ قەی ناكا، سەبوحی ماوە. ئەوانەی داواكاری یارن ڕۆژ و بە شەراب دەشكێنن. لێرەدا ئیشارە بۆ مانای شەراب و ڕۆژ و یار لە باری سۆفیگەرییەوە دەكا و دەڵێ: ئەوانەی دەیانەوێ بگەنە دیداری (مراد) با تاعەتی نیوەشەویشیان لە كیس چووبێ قەی ناكا، بەیانیان لە (پیرو دەزگیر) كە داواكاران ڕێنوێنی دەكا، پیت و بەرەكەت وەردەگرن و بە هۆی ئەوەوە دەگەنە (مراد).

هەروەها هێندێ وشەی كەم ناسراویش وەك: (تانە) لاپەڕە (184)، (وچخان) لاپەڕە (228)، (پەژیوان) لاپەڕە (356)، (گرۆ) (244) و هی تر.. دەبوو لە داوێنی لاپەڕەكاندا مانایان بنووسرێ.

دەڵێم لە داوێنی لاپەڕەكاندا بنووسرایە. چونكە من لەگەڵ ئەوە نیم كە لە كۆتایی كتێباندا وشەنامە دەنووسن. ئەم كارە سەر لە خوێنەر دەشێوێنێ و ناچاری دەكا هەرجارێك تووشی وشەیەكی نەناسراو هات لە وشەنامەكەدا بۆی بگەڕێ و بیدۆزێتەوە و مانای بزانێ و بگەڕێتەوە سەر خوێندنەوەكەی. لەم هاتوچۆیەدا هەودای مەبەستەكە لە زەینیدا دەپسێ. كە چەند جار پەیتا پەیتا تووشی ئەم گێرە و كێشەیە هات وەڕەز دەبێ و كتێبەكە فڕێدەداتە ئەولاوە. بەڵام كە لە داوێنی لاپەڕەكەدا مانای لێدرابێتەوە گورج تەماشای دەكات و دەڕوا بەڕێی خۆیەوە.

ئەمە چەند مەبەستێك بوو لە كتێبی (گێلە پیاودا كە كاك عەبدوڵلا حەسەن زادە لە زمانی فارسییەوە كردوویەتە كوردی وەبەرچاوم كەوت. بە ڕاشكاوییەكی تەواویشەوە دەڵێم ئەم سەرنجانە لە نرخی كارەكەی ئەم كەم ناكەنەوە و بە كتێبێكی (380) لاپەڕەییەوە دیار نین. وە وەرگێڕانەكەی بە یەكێ لە وەرگێڕانە هەرە باشەكانی تا ئێستا لە زمانی كوردیدا دەزانم و و پیرۆزبایی لێدەكەم لەسەر كاری وەرگێڕان كە كارێكی زۆر پێویست و بەنرخە و ئەویش زۆر باشی لەدەست دێ شێلگیر بێ.

*سەرچاوە: گۆڤاری "ڕۆشنبیری نوێ"، بەغدا، ژ72، 1979، ل 32–38.

## نمونەی نوسینی وتارو لێکۆڵینەوە

# هۆکاری دامەزراندنی حیزبی "ژیانی کورد"

بڵاوکردنەوە: گۆڤاری ڕێگا*
نووسینی: پێناو "حەسەن قزڵجی"
لە فارسییەوە وەرگێڕانی: یاسین سەردەشتی

ئێمە لە سەرەتای گۆڤارەکەدا بە گشتی ئاماژە بۆ ئەو هۆکارانە دەکەین کە لە پشت دامەزراندنی (حیزبی ژیانی کورد)ەوەن و ئامانجمان لە بڵاوکردنەوەی گۆڤاری (ڕێگا) باس دەکەین، دیارە زۆر بە داخین لەوەی کە سانسۆری توندی حکومەتی سەربازی و چاودێری سەختی شارەبانی و کارئاگاهی و شکنجەی هەمیشەیی تێکڕای کارمەندانی دەستگای دکتاتۆری لە کوردستان تەواوی پێویستییەکانی لە دەستماندا نەهێشتووە و تەنانەت وەختی تەواویشمان نیە کە دەرفەت بدۆزینەوە وەك پێویست دەکات بە دوور و درێژی داواکارییەکانمان بخەینە بەرچاو.

هەر بۆیە ناچارین بە کورتترین شێوە لە گرنگترین بابەت قسان بکەین و بەشێکی گۆڤارەکەمان بە زمانی فارسی دەنووسین، تا دۆستانی ئازادیخوای غەیرە کوردمان بە ئاسانی بیخوێننەوە و دەستگای دیکتاتۆری و کۆنەپەرستانیش دەستی چەپەڵ و ئامانجە گڵاوەکانیان بە داوێنی ڕاستیەکانی ئێمەدا نەسوون.

گیانی میللیەت و هۆشی نەتەوایەتی و بەرژەوەندی کورد و کوردستانی ئێران، بە تایبەتی زەحمەتکێشان و زۆرینەی گەلی کورد هاندەرمان بووە تا لە پێناوی مافی سروشتی گەلی کورد و گەیاندنی هاواری مەزڵومانەی ئەم میللەتە بە گوێی جیهانی مرۆڤایەتی و شارستانیدا خەبات دژی داروودەستەی حکومەتی دیکتاتۆری تاران و ئیستعمارچییەکان و دەڵاڵ و نۆکەرانیان و بەکرێگیراوانی دۆلار لە ئێران، بە تایبەتی لە کوردستانی ئازیزدا بکەین و حیزبێك بە ناوی (ژیانی کورد) دابمەزرێنین.

هەر لە سەرەتای ڕۆژەکانی گەڕانەوەی هێزی دیکتاتۆری کەم و زۆر چالاکی کراوە، ئەمڕۆ کە چینی دەسەڵاتداری دەوڵەتی کۆنەپەرستی تاران دەیانەوێت هەنگاوی دزێوتر بۆ نابودکردنمان بنێن، بۆ نموونە هەروەك هەوڵدان بۆ کۆچاندنی گشتی کوردەکانی ناوچەی موکریان. لێرەدا ئێمەش بە پێویستی دەزانین تێکۆشانی خۆمان توندتر دەستپێبکەینەوە، ئەوەی وێڕای گشت ئەو بەرەست و هەڕەشە بێ شومارانەی هەن دەستمان کرد بە بڵاوکردنەوەی ئۆرگانی حیزب "گۆڤاری ڕێگا" و بڕیارمانداوە چەندە هەڕەشەکان زۆرتر و فشارەکان زیاتر بن هەر لە بڵاوکردنەوەی ئەم گۆڤارە بەردەوام دەبین و دید و هەستی کۆمەڵانی خەڵکی کورد دەخەینە بەرچاوی عەدالەت و مرۆڤایەتی دنیای ئەوڕۆکە خۆی لە دانیشەرانی سەر کورسی ئەنجوومەنی نەتەوە یەکگرتووەکان دەبینێتەوە و هەرچەند ئەو چاوی عەدالەتە نابینا بێت بە خەتێکی درشت تر نیشانیان دەدەین تا لە کۆتاییدا بزانین کە لە سایەی سەروەری ئەواندا چ بەڵایەك بەسەر میللەتانی هەژار و بێ دەرەتاندا دێت، چالاکی حیزبەکان سەبارەت بە ڕەوشی کورد و کوردستانی نێو چوارچێوەی ئێران لەخۆ دەگرێت و هەواڵ و تێکۆشانی لە پێناوی ئازادی و دیموکراتیزەکردنی تەواوی وڵاتی ئێران دەبێت و تەنیا پشتگیریمان هێزی لە بن نەهاتووی ئازادیخوازانی میللەتانی ئێرانە و بە پشتبەستن بە قانوونی ئەساسی ئێران.

چونکە بۆ دەستگای دیکتاتۆری حکومەتی تاران دووبارەکردنەوە و ئاشکراکردنی ڕاستییەکان پێویستە و جارێکی دی تەواو ڕاشکاوانە دەڵێین کە مافی سروشتی گەلی کوردمان لە سایەی حکومەتێکی دیموکراسی ئێرانی و بۆ کورد و کوردستان لە سنووری فیعلی ئێراندا و بەپێی قانوونی ئەساسی و بە شێوەیەکی عەقلانی و مرۆڤانە دەوێت و ڕێبەر و ڕێنیشاندەرمان گیانی نەتەوایەتیمانە و یار و یاوەرمان هێزی ئازادیخوازیمانە و ئامرازی کارمان ماڵ و گیان و تێکڕای هەموو شتێکمان لەگەڵ ئەم هەموو ڕاگەیاندن و دووبارەکردنەوەدا، ئومێدەوارین کۆنەپەرستان چیدی بەرگی ڕیاکاری نەپۆشن و تەشەر لە ئامانجە پیرۆزەکانما نەدەن و نەبنە ڕێگر گەرچی بە پێچەوانەشە گرنگییەکی ئەوتۆی نابێت چونکە ڕاستییەکان بۆ مرۆڤی دانا و هۆشیار ئاشکران.

ئێمە بە ناوی پشتیوانی لە ویژدان و ڕاستی و ئازادی لەم خەباتە سەختەماندا داوای هاوکاری و یارمەتی لە حیزبە پێشکەوتووخواز و ئازادیخوازەکانی ئێران و هەروەها لە ڕێکخراوە پێشکەوتووخواز و ئازادیخوازەکانی کورد دەکەین لە هەر کوێیەك بن و دەمانەوێت بە پشتگیری ئەوان خەباتمان بەتینتر بکەین. لەگەڵ میللەتی نەجیب و هاودەرمان کە ئازاربایجانییەکانە هاوکاری تەواو دەکرێت و پەیوەندی دۆستانە و مێژووییمان بەو لایەنانەوە پتەو دەکەین ئەمێستا تەنیا بۆ سەلماندنی بوون و ناساندنی مافەکانمان لە ئێراندا و و لە خوارەوە نەتەوایەتی خۆمان و پایە سەرەکییەکانی بە گشتی باس دەکەین.




## گەلی کورد و نەتەوەیی بوونی

بە کۆمەڵێك مرۆڤ دەوترێت نەتەوە کە خاوەن چەند پایە و ڕەگەزی وەك: زمان، ئایین، شوێنی جوگرافیایی، مێژووی هاوبەش، ئاوات و ئارەزووی هاوبەش بن، کورد خاوەنی تێکڕای ئەو ڕەگەزانەیە و لەلای دۆست و دوژمن مافی شانازی کردنی بە وشەی نەتەوەوە هەیە، خۆشبەختانە مێژووی هاوبەشی کورد بریتییە لە ژمارەیەکی زۆر ئاسەوار و نیشانەی گیانی نەتەوایەتییەکی بەهێز،

هەروەك لە خوارەوە بە کورتی لەسەر هەریەك لەو پایە سەرەکییانە دەدوێین.

## زمانی کوردی

دوا لێکۆڵینەوەی زمانەوانە ڕۆژهەڵاتناسەکان سەلماندویە کە کوردی زمانێکی ئاریایی کۆنە و "نیکیتین" زانای ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی دەڵێت: کە زمانی کوردی بەشێکە لە زمانی ئاریایی کۆن و خاوەنی شێواز و ڕێزمانی تایبەتی خۆیەتی و تایبەتمەندی زمانێکی ڕۆژهەڵاتی و بنەمایەکی ئاسایی هەیە.

زمانی کوردی لای ڕۆژهەڵاتناسەکان بایەخ و گرنگییەکی زۆری هەیە، تەنانەت لە دانیشگای "سوربون"ی مێژوویی لە پاریس کە ناوبانگێکی جیهانی هەیە چەند ساڵ پێش ئێستا بەشێکی تایبەتیان بە زمانی کوردی و بۆ خوێندنی ئەو زمانە تەرخان کردووە کە ئەرکی بەڕێوەبردنی لە ئەستۆی ڕۆژهەڵاتناسێکی فەرەنسی ناسراودایە.

چاپەمەنییە کوردییەکان لە پاش جەنگی یەکەمی جیهانییەوە پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆوە دیتووە. بەناوبانگترینیان لە ڕوسیا "ریی تازە" و لە سوریا "هاوار، ڕۆژا نوی، ستێر" و لە عێراق "بانگ کورد، ژین، گەلاوێژ، زار کرمانجی" و کتێب و نامیلکەی بەپێز بە شێوەیەکی بێشومار چاپ و بڵاودەکرێتەوە لەساڵەکانی دوا جەنگی جیهانیشدا چاپەمەنی کوردی قەڵەمبازێکی مەزنی دەستپێکردووە، لە ماوەی ساڵێکی کۆماری کوردستانی ئێراندا، "ڕۆژنامەی کوردستان، گۆڤاری کوردستان، نیشتمان، هاواری نیشتمان، ئاوات و گڕوگاڵی منداڵان" لە مەهاباد و "هەڵاڵە" لە بۆکان و "ڕاوێژ" لە سنە و لە تێکڕای ناوچەکانی کوردستان چالاکی چاپەمەنی کوردی لە زیادبووندا بووە.

## ئایین

نەتەوەی کورد جگە لە ژمارەیەکی کەمی مەسیحی و هێندێك کۆنە زەردەشتی (یەزیدی) نەبێ بە گشتی موسڵمانن و زۆربەیان سوننین و بنەمای مرۆڤایەتییان لە ئایینی زەردەشتی کۆنی خۆیانەوە وەرگرتووە و فێری بوون، بە هەمان شێوەش لێبوردنیان لەگەڵ ئایینەکانی دیدا هەیە و بە پێچەوانەی هاوسێکانیان کە لەم ڕووەوە دەمارگیرن. دەوڵەتە بەرژەوەندیدارەکان ویستوویانە، بە زۆر ناوی جیاوازی وەك ڕەگەزپەرستی و هاوئایینی کورد بتاوێننەوە و تا ئێستا سەریان داوە لە بەرد.

## شوێنی جوگرافی کوردستان

کوردستان بڕبڕەی پشتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە و بەشێکی فراوانی لە زنجیرە چیاکان پێکهاتووە کە لە دەریای ڕەشەوە تا نزیکی "قەفقاز" و تا کەنداوی فارس درێژە دەبێتەوە و لە بەشی خۆرئاواشی دەشتی بە پیت و فراوانی هەیە، لەم وڵاتەدا تەنیا کورد نیشتەجێیە کە لەگەڵ کەمینەکانی ئاشوری و کلدانی پێکەوە (9) ملیۆن کەس دەبن، ئازایەتی و وەفاداری بەشێکە لە ڕەوشتی دێرینەی ئەم گەلە هەروەها ئازادیخوازی و لێبوردنیش، گەلی کورد لە سەرەتاکانی مێژووەوە گەلێکی زیندوو بووە و جگە لە داواکردنی مافی ژیانێکی سروشتی شتێکی دی ناوێت، گەلی کورد لە زۆر ڕووی وەك پێکهاتنی کۆمەلایەتی و زمان و ئەدەبەوە جیاوازی هەیە و کوردستان یەکەیەکی جوگرافی و ئابوری و نەتەوەیی دانەپچڕاوە، بە قەولی نیکیتینی فەرەنسی کوردستان بەشێکە لە ناوچەیەکی ئاسیایی ناوخۆ و دەتوانرێت کێوەکانی ئاراراتی بۆ بکرێتە سەرەتا کە لە ڕۆژهەڵاتەوە زنجیرە چیای "بنتس" و لەوێوە سەرەوژێر دەبێتەوە تا بە "سیواس" و "کرداخ" –قەڵای ئەسکەندەروونە– و لەوێشەوە بەرەو خۆرهەڵات بە درێژایی هێڵی سنوری سوریا – تورکیا و کێوەکانی شەنگار لەخۆ دەگرێت و تا مووسڵ دەڕوات، هەروەها زنجیرە چیاکانی زیروس دەگرێتەخۆ تا هێڵی بەغداد – کرماشان و لەوێوە تا دەریاچەی ڕەزائیە و بە درێژایی هێڵی ڕۆژئاوایی دەریاچەی ناوبراو تا ئارارات.

ئەم کوردستانە مەزنە تا جەنگی بەینەلمیلەلی لە نێوان هەردوو حکومەتی عوسمانی و ئێرانی دابەشکرابوو، دواتر لە ئاکامی پەیکان و ڕێکەوتنە نێودەوڵەتییەکان و لە پای قازانجی دەوڵەتە ئیستعمارییەکان بەشی عوسمانییەکەی جارێکی تر بۆ سێ بەشی تر دابەشکرایەوە، یەکێکیان لە تورکیا و ئەوی دی کە لە عێراق و دوابەشیشیان کەوتنە سوریا.

ڕەفتاری تورکان لەگەڵ کوردەکاندا بێ نیهایەت وەحشیانە بووە و مەسەلەی دادگای ئیستقلال و تیرەبارانی ناودارانی کورد و قەتڵ و عامی کۆمەڵانی خەڵکی کورد لە تورکیا بەناوبانگە و مێژوویەکی خوێناوی لە یادا نەخشاندووە، زمانی کورد بە پێی یاسا لە تورکیا قەدەغەیە بەڵام وێڕای سیاسەتی "تەتریك"ی تورکە فاشستەکان کوردان مەردانە بەرگری ئەو بارە ناهەموارە دەکەن و زمان و خوخدەی نەتەوایەتی خۆیان لە گوند و شارۆچکەکان پاراستووە، بەڵام لە شارەکاندا لە سۆنگەی فشاری توند و وەحشیانەی کارمەندە فاشیستەکان خەڵکی تەنها دەتوانن لە ماڵەکانی خۆیان بە کوردی قسان بکەن.

لە سوریا پەروەردە و فێرکردن بە عەرەبییە تەنها ئەو کەسەی عەرەبی قسان دەکات لە گوندەکەی خۆی مامۆستایە بەڵام چالاکی چاپەمەنی و ئەدەبیاتی کوردی ئازادە و چەند گۆڤار و ڕۆژنامە لەوێ

بە زمانی کوردی بڵاودەکرێتەوە، لە عێراق قانونی ئەساسی ئاماژەی بە پاراستنی مافی کوردان داوە، لە هێندێك پارێزگاکانی باکور پەروەردە و فێرکردن بە زمانی کوردییە و چاپ و بڵاوکردنەوە بەو زمانە ئازادە، بەڵام تێکڕای ئەمانە تا ئەو شوێنە بڕەکات کە لەگەڵ بەرژەوەندی و سیاسەتی دەوڵەتدا پێچەوانە نەبێت.

ئەمما لە ئێراندا –هەمان ئێرانەکەی ئێمە– قانونی ئەساسی و تێکڕای یاساکانی دی ناوی کوردیان نەهێناوە و شتێك لە بارەی هەر شێوەیەکی بەکارهێنانی زمانی کوردی لە یاساکاندا ڕێی پێ نەدراوە، بەم شێوەیە لە ڕەفتاری حکومەت و کارمەندانی کۆنەپەرستی دەوڵەتی سەرەڕۆی ئێران لە تورکە فاشستەکان باشتر نەبووە، بەڵکە هەمان سیاسەتی ئەوانیان بەرامبەر کورد گرتۆتە بەر بە تایبەتی پاش چاوپێکەوتنی هەردوو دیکتاتۆرە شوومەکەی تورکیا و ئێران "پەهلەوی و مستەفا کەمال" دەوڵەتی ئێران لە هیچ ڕەفتارێکی نامەردانە دژی کورد نەپرینگاوەتەوە.

## مێژووی هاوبەشی کورد

شوێنەوارە کۆنەکان ماون "سۆمەرییەکان" ئەوە دەسەلمێنن کە کورد گەلێکە پێش دوو هەزار ساڵ بەری زایین لە کوردستاندا نیشتەجێ بووە و جارجارە لەگەڵ هێزە دراوسێیەکانی وەك بابلییەکان و حیسییەکان و ئاشورییەکان چۆتە مەیدانی شەڕ و شۆڕەوە و هیچ کاتێك سەری بۆ هیچ یەك لەم پەلاماردانە شۆڕنەکردووە و مادەی تەسلیم بوونیان نەبووە، کوردەکان لە شەڕی نەینەوا و بابلدا هاوکاری گسەروەیس"یان کرد و لە دەورانی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینییەکاندا خاوەنی مافی تایبەت و سەربەخۆیی خۆیان بوون کە پاراستنی پەرستگا (ئاتەشگەدە)کانی زەردەشتی بوو کە پیرۆزترین شوێنی ئەو زەمانە بووە و لە بەرامبەر زەینەفۆنی یۆنانیشدا بەرگری سەختیان نواندووە، لەگەڵ سلوقییەکانیشدا وەك جەنگاوەری ئازا بەشداری شەڕ و شۆڕەکانیان کردووە و بە ئیعترافی مێژوونووسانی ئێرانی بنەچەی ساسانییەکان کە حوکمڕانییەتی تەواوی ئێرانیان کردووە کورد بووە، لە پەلامار و تالانی مەغۆلەکاندا کوردستانیش وێرانکراوە، خودی سەلاحەددینی مەزن حەریفی ئازا و لێهاتووی پادشای ئینگلستان ڕیشارد (قلب الاسد) کورد بووە کە زۆربەی عەشیرەتە کوردەکانی لەژێر حوکمی خۆدا کۆکردۆتەوە و یەکێتی بۆ کوردان پێکهێناوە و لە سەدەی سێزدەهەمدا کورد لەگەڵ تەتەرەکاندا چۆتە جەنگەوە و سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، مێژووی نوێ سەبارەت بە پەلاماردانی کوردستان تا زەمانی سوڵتان سەلیمی یەکەم شتێکی وای تێدا ڕوونەداوە، سوڵتان سەلیم یەکەمین خەلیفەی عوسمانییە کەوتە کەڵکەڵەی سیاسەتی یەکێتی ئیسلامی و توانی سەرکەوتن بەسەر زۆر دەوڵەتانی ناوچەکە بەدەست بهێنێت.

پاش ئەم هاوکارییە بە پێی ڕێکەوتننامەیەك چەسپا کە میرە کوردەکان بە مەرجێك دان بە دەسەڵاتی سوڵتانی عوسمانیدا دەنێن کە مافی میرنشینەکان و دەسەڵاتیان لەنێو خۆی ناوچەکانیاندا بە شێوەی خودموختاری پارێزراو بێت و بە پێی ئەم ڕێکەوتنە کوردەکان لە جەنگی سوڵتانەکانی عوسمانیدا بەشداربوون و خزمەتی گەورەیان پێکردن، لە تەواوی کوردستاندا حاڵ بەم چەشنەوە بووە، تا کۆتایی جەنگی بەینولمیلەلی ڕابردوو کە ئیمپراتۆری عوسمانی هەڵوەشا و ڕەوشی جیهانیش گۆڕانی بەسەردا هات و کوردستان جارێکی دی چووە قۆناغێکی نوێوە کە شایەنی لێکۆڵینەوەی سەربەخۆیە.

## ئاواتی هاوبەش

کورد تەنها ئامانجێکی هەیە ئەویش وەدیهێنانی ئازادییە لەسەر بنچینەی دیموکراتییەکی ڕاستەقینە.

ئەی جیهانی مرۆڤایەتی ئەوەیە گەلەکەمان و ئەوەش پایە پتەوەکانی نەتەوایەتییمان، ئێمە سەبارەت بە ئێران و بە پشتبەستن بە بەڵگە و نووسراوە مێژووییەکان و دانپیانانی ئاشکرای ئاغای مظفر فیروز جێگری سەرەك وەزیرانی وەخت و نوێنەری دەسەڵات پێدراوی حکومەتی ناوەندی کە لە پەیمانی ئازاربایجان و تاراندا بوون و مافەکانی ئێمەی دان پیا ناوە مافی سروشتی خۆمان کە بریتییە لە دامەزراندنی حکومەتێکی خودموختاری دیموکراتی لە چوارچێوەی حکومەتێکی ناوەندی دیموکراتیدا هاوجووت لەگەڵ یاسای بنەڕەتی وڵاتدا داوا دەکەین و تا دوا هەناسە لە ڕێگای داواکاری مافەکانماندا خەبات دەکەین و دڵنیاشین چونکە ڕاستین سەرکەوتن هەر بۆ ئێمە دەبێت.

### تێبینی:

ئەم نووسینە، بە ئەسڵ لە یەکەم ژمارەی خەزەڵوەری 1327ی هەتاوی (ناوەڕاستی پایزی 1948)ی بڵاوکراوەی "ڕێگا" وەرگیراوە، لە (ئاڵەکۆك)ی "غەنی بلووریان"دا بڵاوەکراوەتەوە.

*سەرچاوە: یاسین سەردەشتی، "ڕێگا" ڕاستییەکی مێژوویی و سەرەتای خەباتێکی نوێ، "مەتین" (گۆڤار)، دهۆك، ژ 123، نیسانی 2002، ل 14-27.

# هەندێ زانیاری مارکسی- لێنینی
# چەند دەرسێکی سەرەتایییە*

ئامادەکردنی
حەسەن قزڵجی

چەند وشەیەك:

ماموٚستا حەسەنی قزڵجی کە ئامادەکاری ئەم دەرسانەیە، چیرۆکنووس و ئەدیب و نووسەر و سیاسەتمەدارێکی ناسراوی کوردی کوردستانی خۆرهەڵاتە و ساڵانێك بەرپرسی بەشی کوردیی ڕادیۆی (پەیکی ئێران) بوو. لە دەمێ ساڵەوە برادەریمان بەهێز بوو، هەر بەو هۆیەشەوە ئەو دەرسانەی (هەندێ زانیاری مارکسی–لێنینی) کە بۆ خوێندنەوە لە ڕادیۆی پەیکی ئێرانەوە ئامادەی کردبوون و کاتی خۆی پێشکەش کران، بە خەتی خۆی کەوتنە لای من و بە زمانێکی سادە و کوردییەکی ڕەوان نووسیونی و، هەرچەندە لە ساڵانی کۆتایی شەستەکاندا پێشکەشی کردمن، پاراستوومن و چەند جارێك بە شێوەی جۆربەجۆر سوودمان لێ وەرگرتوون و ئێستا وا بەم شێوەیە چاپ و بڵاودەکرێنەوە، ئەمەش لەسەر پێشنیار و نووسینەوەی کە کۆمپیوتەر و ڕێکخستنەوەی هاوڕێی بەڕێزم ئازادی نوری سەید وەلییە و، هیوادارم وێڕای تێپەڕبوونی ئەوەندە ساڵە، کە زۆر شت گۆڕدراون، کەڵکی خۆیان لەدەست نەدابێ و سەرەتایەك بن بۆ فێربوونی ئەو زانیارییانە و پاشان بۆ قووڵبوونەوە تیایاندا، بە سوودوەرگرتن لە زۆر سەرچاوە کە لەبەردەستدان.

ماموٚستای زانا و ئەدیب حەسەنی قزڵجی کە ئەندامی ڕابەرایەتی حزبی تودەی ئێران بوو، قارەمانانە لەژێر ئازاردا لە بەندیخانەیەکی تاراندا شەهید کرا. یەکێك لە بەرهەمە بەنرخەکانی قزڵجی نەمر کۆمەڵە چیرۆکی "پێکەنینی گەدا"یە کە نووسەرانی کورد دەزانن چ شوێنێکی دیاری لە چیرۆکنووسی کوردیدا هەیە.

جەلال دەباغ

1 ئایاری 2002

هەندێ زانیاری مارکسی لێنینی

دەرسی یەکەم

دنیابینی چییە؟

دنیابینی مانای تێکڕای بیروڕای کەسێك یان کۆمەڵێك دەربارەی سروشت و کۆمەڵ. ئەم دنیابینییە یان بە جۆرێکی زانستی و زانیارییە، یاخود پێچەوانەی زانستە و نازانیارییە.

دنیابینی نازانیاری:

بنچینەی لەسەر قبووڵکردنی ڕادێرانەیە..

دنیابینی زانیاری:

بنچینەی لەسەر دەلیلی عەقڵی دامەزراوە.. بە تەجروبە سەلمێنراوە و بە واقعییەت و ڕووداو پتەو بووە.

–مارکسیزم–لێنینیزم: کۆمەڵێك بیروڕای زانیاری و بە یەکەوە چەسپاوە دەربارەی قانوونەکانی بزووتن و گۆڕانی دنیا و کۆمەڵ. دەربارەی ئەوەی چۆن لە کۆمەڵێکی دامەزراودا لەسەر خەباتی چینایەتی و چەوساندنەوەی مرۆڤ لە لایەن مرۆڤەوە و دیلی و گیرۆدەیی نەتەوەیەك بە دەستی نەتەوەیەکی ترەوە. دەتوانرێ کۆمەڵێکی ئازاد لە ناکۆکییەکانی چینایەتی و دوور لە چەوساندنەوە و ڕەنج خۆری و ڕزگار لە دیلی و گیرۆدەیی نەتەوایەتی پێکبهێنرێ.

–ڕێوشوێنی بنچینەی مارکسیزم–لینینیزم.. کارڵ مارکس و فردریك ئەنگلس و ڤلادمێر ئیلیچ لێنین ڕێکیان خستووە.

–مارکس بۆ دانان و ڕێکوپێککردنی بیروڕای خۆی لە (3) سێ چاوگە کەڵکی وەرگرتووە کە ئەمانەن:

1–ئابووری ئنگلیز: واتە لە بیروباوەڕی ئابوری زانەکانی ئنگلیزەکان وەك (ئادەم سمیث و ڕیکاردۆ).

2–فەلسەفەی ئەڵمانی. واتە بیروباوەڕی فەیلەسوفەکانی ئەڵمانی وەك: (هیگڵ و فۆیەرباخ).

3–سۆسیالیزمی فەڕەنسایی.. واتە لە بیروباوەڕی ئیشتراکییە خەیاڵییەکانی فەرەنسایی وەك (سان سیمۆن و فوریە).

–مارکس و ئەنگڵس لە سەردەمی سەرمایەداری پێش ئیحتیکاردا دەژیان و تێدەکۆشان.. بیروڕای خۆیان لەو سەردەمەدا دەربڕی کە سەردەمی بوژاندنەوە و بەخۆداهاتنی سەرمایەداری و سەردەمی چاودێری و مل ملەی ئازاد بوو.

–لێنین لە سەردەمی سەرمایەداریی ئیحتیکاردا دەژیا و تێدەکۆشا.. و مارکسیزمی بەسەر سەردەمی پێگەیشتن و بوژاندنەوەی تێکەڵ بە کارەساتی سەروبەندی شەڕەکان و شۆڕشەکاندا تەطبیق کرد.

–مارکسیزم. لینینیزم لە (3) بەشی گرنگ پێکهاتووە: فەلسەفە. ئابووری و سۆسیالیزم.

–مارکسیزم. لێنینیزم.. دوای مارکس و ئەنگلس و لێنین بە هۆی تیئۆری زان.. یانی زانا و خاوەن بیروڕاکانی تری مارکسی. لێنینی و بە هۆی حزبە کۆمۆنیستەکانی دنیاوە پەرەی گرت و بەسەر وەزعی ڕۆژگاری ئێمەدا کە سەردەمی ڕزگاری نیشتمانییە.. سەردەمی ڕوخاندنی ڕژێمی مستعمرات و ئیمپریالیزمە.. سەردەمی پەیدابوون و پەرەگرتن و پتەوبوونی ڕژێمی سۆسیالیستی جیهانە.. تەطبیق کرا.

–مارکسیزم– لێنینیزم دنیابینی تەواوی حزبە شۆڕشگێڕە کارگەرییەکانی چەشنی نوێیە.. ئەو حزبانە بە پێی ئەم دنیابینییە علمییە دیاردە قورس و گرانەکانی کۆمەڵایەتی لێك ئەدەنەوە.. ستراتیژی و تاکتیکی خۆیان ڕێك دەخەن و دروشمەکانی دوور و نزیکی خۆیان ڕوون دەکەنەوە.

–مارکسیزم لێنینیزم چەکێکی کاریگەری وایە ئەگەر لە جێی خۆیدا و بە چاکی کەڵکی لێ وەربگیرێت دەتوانێ ببێتە هۆی سەرکەوتنی حزبی چینی کرێکار. مەسەلەی تەطبیقی دروستی دنیابینی مارکسی. لێنینی مەسەلەیەکی زۆر گرنگ و دژوارە..

–هەر کەسێکی شۆڕشگێڕ پێویستە دنیابینی مارکسی. لینینیی فێربێت و بە چاکی وەری بگرێت و بە قووڵی تێی بگات. ئەگەر مارکسیزم– لێنینیزم باش فێر نەبین و بە قووڵی وەری نەگرین.. هەروا نەختێکی لێ بزانین و زانینەکەشمان سەرزارەکی و کتێبی بێت.. جگە لەوە کە سوود و کەڵکێك ناگەیەنین، زیانیش ئەدەین.

ئەمە زانست و فێرکردێکی گەورە و بەرزە بەڵام وەرگرتن و تێگەیشتنی گران و زەحمەت نییە.. چونکە حەقیقەتە.. حەقیقەتیش هەمیشە سادە و ڕۆشنە.

دەرسی دووەم

دیالەکتیك چییە؟

فەلسەفەی مارکسی، ناوی ماتێریالیزمی دیالەکتیکە.. فەلسەفەی مارکسی لە (3) بەشی گرنگ پێکهاتووە..

1–ئسلوبی دیالەکتیك.

2–ماتیریالیزمی فەلسەفی.

3–ماتیریالیزمی مێژوویی.

ئسلوبی دیالەکتیك: نیشانی ئێمەی ئەدات کە تەبیعەت و کۆمەڵ بە پێی چ جۆرە یاسایەك لە بزوتنەوە و ئاڵوگۆڕدان.. فێربوونی ئسلوبی دیالەکتیك بۆ تێگەیشتنی دروستی دیاردەکانی تەبیعەت و کۆمەڵایەتی و بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم دیاردانە پێویستە. ڕاستە ئەگەر کەسێك زۆر خاوەن تەجرەبە و وردبێت و مەبەستێك باش موتالاَ بکات و نیازێکیشی نەبێ لە خۆیەوە بە چەشنی دیالەکتیك بیردەکاتەوە.. بەڵام بەهەر جۆر زانینی یاساکانی دیالەکتیك و بەکارهێنانی وریایانەی ئەم یاسایانە و بۆ بیرکردنەوەی دروست و چارکردنی ڕاست و دروستی مەسەلەکان کۆمەڵ دەکات.

یەکێ لە فەیلەسووفەکان دیالەکتیکی ناو ناوە ڕیاضیاتی شۆڕش. واتە بۆ ئەوە کە شۆڕشێك بتوانێ مەرجەکانی شۆڕش و ڕاپەڕین بە چاکی حساب بکات دەبێ ئەو ڕیاضیاتە باش بزانێ.

دیالەکتیك چوار یاسای گرنگی هەیە:

یەکەم: یاسای پەیوەندییە (قانون الترابط): واتە ئەم یاسایە ئەمەیە کە سەرانسەری دنیا.. گیاندار و بێگیان بە یەکەوە پەیوەندی هەیە و لە یەکتردا مؤثر و کاریگەرە.. تەواوی دنیا ئەشکالی جۆربەجۆری مادەیە کە دەگۆڕدرێ و پێدەگا.. ئەگەر لە دنیادا شتی جۆربەجۆر چلۆنایەتی وەك (جماد) و ڕەقینی و (نبات) و شیناوەرد.. (حیوان–انسان) لە مادی و معنوی دەبینین.. لەبەرئەوەیە کە بینای مادە تا دێ تێکەڵ و پێچراوەتر دەبێ. ئەم جۆربەجۆرییە دەلیلی ئەوە نییە کە دنیا لە شتێ بە تەواوی جیاوازی وا بە یەکەوە پەیوەندییان نەبێ، پێکهاتووە. لە زەمانی زوودا بە لایانەوە وابوو کە جسم و گیان دوو شتی بە تەواوی لێك جیاوازن. ئەمڕۆ دەزانین کە فکر و گیان خاسیەتی ئەو مادەیەیە کە بیناو پێکهاتێکی یەکجار زۆر گران و پێچراوەی هەیە.. و شتێك نییە لە مادە جیاواز بێت.

دووەم: یاسای بزووتنەوە و گۆڕان (قانون الحرکة والتغییر):

واتە ئەم یاسایە ئەمەیە کە سەرانسەری ئەو دنیایەی کە بە یەکەوە چەسپاوە و پەیوەندی هەیە وەکو یەك دەزگا وایە لە حاڵی بزووتنەوە و گۆڕانی هەمیشەییدایە. هیچ شتێك لەم دەزگایەدا بە حاڵێك و بە چەشنێك نامێنێت. (سکون و نەگۆڕان) ڕواڵەتە.. ئەصڵ بزووتن و گۆڕانە.

سێیەم: یاسای کێشە و ناکۆکی (التناقض):

لە یاسای یەکەم و دووەم تێگەیشتین کە سەرانسەری دنیا دەزگایەکی بە یەکەوە چەسپاوی وایە کە دەگۆڕدرێ.

ئێستا ڕەنگە ئەم پرسیارە بێتە پێشەوە: بۆچی دەگۆڕدرێ؟ لە زەمانی زوودا کە وەڵامی ئەم پرسیارەیان نەدەزانی خۆیان ئاسودە دەکرد و ئەیانگوت بزوێنەرێکی یەکەم هەیە ئەم جووڵە و بزواندنەی دەستپێکردووە.. بەڵام دواجار ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە: ئەو بزوێنەری یەکەمە کێ خستوویەتییە جوڵانەوە و بزووتن؟ کە وابوو ئەم وەڵامە بۆ قبووڵ کردن نابێ. دیالەکتیك دەڵێ (گۆڕان و بزووتن) هەر لەناو مادەدایە.. یا بە جۆرێکی تر بڵێین (جووڵاندن و بزووتن)

(ذاتی)یەو لە خۆوەیە. جوڵە و بزووتن بە واتای ئەوەی کە شتێك خەریك دەبێ ببێتە شتێکی دیکە.. یا بە چەشنێکی تر جیاوازی و کێشە و ناکۆکی پەیدا ئەبێت. لە هەموو شتێك و دیاردەیەکدا هەمیشە شتێك خەریکی پەیدابوون و بەخۆداهاتنە و شتێك بەرەو نەمان و فەوتان دەڕوات.. (تازە و کۆنە).. (ڕابردوو و داهاتوو) خەریکی خەباتن لە دژی یەکتر.. ئەم خەباتەیە کە (گۆڕان و بزووتن)ی پێکهێناوە.

چوارەم: یاسای پێگەیشتن (التطور):

واتای ئەم یاسایە ئەوەیە کە بزووتن و گۆڕان ئەنجامی کێشە و ناکۆکی دەروونی شتەکان و دیاردەکانە.. دووپاتبوونەوەی وەزعی پێشوو نییە.. بەڵکو هەمیشە بارودۆخێکی تازە و تەواتر و پێچراوەتر پێکدێنێ. (مادە) لە سادەوە بەرەو پێچراوە.. لە نزمەوە بەرەو بەرز دەبزوێ.. لە بێگیان گیاندار.. لە ئاژەڵ مرۆڤ. لە مرۆڤی پێشینان کۆمەڵی ئەمڕۆکە پێکهاتووە. گۆڕان لە سەرەتاوە دیارنییە و نابینرێ بە شێنەیی پێئەگات. لە پاشدا کە گۆڕان گەیشتە ڕادەیەکی تایبەتی. ڕاپەڕین یان بازدان پێکدێت و گۆڕانێکی خێرا لە کەیفییەتدا ڕووئەدات. ئاڵوگۆڕێکی شۆڕشی ڕووئەدا و کەیفییەتێکی تازە پەیدا ئەبێ. ئەگەر ئەم یاسایەی دیالەکتیك بە چاکی بەکاربێنین دەتوانین هەر دیاردەیەك بە قووڵی لێکبدەینەوە.

## دەرسی سێیەم

## ماتێریالیزمی فەلسەفی

وتمان دنیابینی لە (3) بەش پێکهاتووە: (فەلسەفە–ئابووری–سۆسیالیزمی زانستی) وتیشمان کە فەلسەفەی مارکسیزم (3) بەشی گرنگی هەیە: (ئسلوبی دیالەکتیك– ماتێریالیزمی فەلسەفی– ماتێریالیزمی مێژوویی) ئسلوبی دیالەکتیك و چوار یاساکەی فێربووین.. ئێستا دەمانەوێ کەمێك لەسەر ماتێریالیزمی فەلسەفی بدوێین.. ماتێریالیزمی فەلسەفی دەڵێ: دنیا مادەیە و هیچ کەسێك ئەوی دروست نەکردووە.. هەمیشە لە ڕابردوودا بووە و لە داهاتووشدا هەر دەبێ. چونکە تەجروبە نیشانی داوە کە هیچ شتێك لە عەدەم و نەبوونی موتڵەقەوە نایەتە وجود و مەوجودێکیش نییە کە ببێتە عەدەمی موتڵەق. ئێستا ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە: مادە چییە؟

لێنین مادەی ئاوا تەعریف کردووە "ئەو واقعیەتەیە کە لە دەرەوەی ڕوح، سەربەخۆ لە فیکر و شعوری ئێمە وجودی هەیە و ئێمە ئەو بە حەواسی خۆمان دەرك دەکەین" فەلسەفە ئەرکی سەرشانی نییە کە بڵێ مادە لە چی دروست کراوە. زانستە کە پلە بە پلە بیناو لێ پێکهاتنی مادە (سلول. ملکول. ئەتۆم و تۆسکاڵە سەرەتاییەکانی ناوەوەی ئەتۆم ئەنەڕژی) دەدۆزێتەوە و ڕۆژ بە ڕۆژ ئێمە زیاتر لە مادە تێدەگەیەنێ.

شعور: کە بە چەشنی کەموکوڕ و سەرەتایی لە ئاژەڵدا و بە چەشنێکی تەواو پێگەیشتوو لە مرۆڤی شارستانیدا هەیە. ئەنجامی پێگەیشتنی دوور و درێژی مادەیە.. و خاسیەتی مادەیەکی زۆر ڕێکوپێك و یەکجار پێچراوەیە کە پێی ئەوترێ مێشك.

تێگەیشتنی ئەمە کە چۆن مرۆڤ هەڵدەسوڕێ –دەدوێ– بیردەکاتەوە خۆ دەبینێ– ژیانی داهاتوو نەخشە دەکێشێ و تێبینی دەکا. لە ڕابردوودا بۆ مرۆڤ دژوار بوو. لەبەرئەوە وای دەزانی کە شعور خاسیەتی ڕوحە و ڕوحیش شتێکی ئاسمانی و غەیبی و نهێنییە. بەڵام زانستی ئەمڕۆ ڕوونی دەکاتەوە کە چۆن سلولەکانی مێشکی مرۆڤ کە ناویان (لۆزۆنە) وێنەی واقعی دەرەوە پێچەوانە و جێگیر دەکەن.. چۆن ئەو وێنانە لێك هەڵدەهاوێرن و تێکیان دەخەن. مرۆڤ بە دۆزینەوەی ئەم یاسایانە ئەمڕۆ خۆی ئامێری قسەکەر و بیرکەرەوە دروست دەکات کە پێیان دەگوترێ (سیبرنێتیك–بیونیك).

بەم پێیە یەکەم مادە بێگیان بوو.. لە پاشان مادەی گیاندار پەیدابوو.. یەکەم مادە بێشعور بوو. لە پاشان مادەی خاوەن شعور پەیدابوو. لەبەرئەمە مادە لە پێش شعورەوەیە.. ئەوانەی لایان وایە مادە لە پێش شعورەوەیە پێیان ئەوترێ (ماتێریالیست) واتە مادییەکان. و ئەوانەی لایان وایە شعور لە پێش مادەوەیە پێیان ئەوترێ (ئایدیالیست) واتە میثالییەکان.

ئایدیالیزم چەوتە و زانستی ئەمڕۆ بە تەواوی ڕەتی کردۆتەوە. مەبەستێکی تر کە (ماتێریالیزم) دەری ئەخات ئەوەیە کە مادە هەمیشە لەگەڵ کات و جێگا و بزووتندا هاوڕێیە.

بزووتن بێ مادە و مادە بێ بزووتن وجودی نییە و بزووتن شێوەی وجودی مادەیە. مادە بێ زەمان و مەکان.. و زەمان و مەکان بێ مادە وجودی نییە. زەمان و مەکان شکڵی وجودی مادەن.

## دەرسی چوارەم

## تیئۆری و پراکتیك. النظرية والتطبيق

لە دەرسی پێشوودا زانیمان کە مادە چییە.. چەشنی بوونی چۆنە.. شێوەکانی بووی ئەو کامانەن. ئێستا هەندێك تەعریفی شعور دەکەین. شعوری مرۆڤ بەرووبوومی ئینعکاسی دنیای دەرەوەیە لە مێشکی مرۆڤدا. مرۆڤ بە یارمەتی شعور دنیای دەرەوە دەناسێ. لە جەرەیانی کار و تێکۆشان و پراکتیکدا دنیا دەناسێ. لە پراکتیك یان کار تیئۆری پەیدا دەبێ بە نۆرەی خۆی زانست یا تیئۆری پراکتیك یا کار ڕێنوێنی دەکات. زانست و کار یا تیئۆری و پراکتیك پەیوەندییەکی توندوتۆڵ و نەپساویان بە یەکەوە هەیە. ئەمە لەو مەسەلە گرنگانەیە کە پێویستە هەمیشە لەبیر بێت.

پراکتیك یان عەمەلی مرۆڤ (3) شێوەی گرنگ و بنەڕەتی هەیە:

1–بەرهەمهێنانی مادی چ پیشەسازی و چ کشتوکاڵی.

2–تەجربە و لێکۆڵینەوەی زانستی.

3–خەباتی چینایەتی.

تیئۆریش (3) شێوەی گرنگ و بنەڕەتی هەیە:

1–زانستەکانی کۆمەڵایەتی و سروشتی.

2–ئایدیۆلۆژیای سیاسی و کۆمەڵایەتی کە تێکڕای بڕواو بیروڕای یەك یا چەند چینێکە لە مەڕ کاروباری سیاسی و کۆمەڵایەتی.

3–دنیابینی کە لە دەرسی یەکەمدا باسمان لێکرد.

جوڵانەوەی شۆڕشگێڕی بە بێ تیئۆری شۆڕشگێڕی ناتوانێ ڕێگای خۆی بۆ پێشەوە بکاتەوە. دەڵێن: جوڵانەوەی شۆڕشگێڕی کەشتییە و تیئۆری قیبلەنمایە.. قیبلەنما بێکەشتی ژەنگ هەڵدێنێ. کەشتیش بێ قیبلەنما ڕێ هەڵە دەکات.

زانستی سروشت و کۆمەڵایەتی ئەمڕۆ گرنگییەکی مەزنیان پەیداکردووە. لە سەردەمی ئێمەدا ڕاستە وخۆ بوونەتە بەشێکی هێزەکانی بەرهەمهێنەر و بزوێنەری گرنگی بزوتنەوەی کۆمەڵایەتین.. واتە ئەمڕۆ ئیتر پێگەیشتن و بەخۆداهاتنی هێزەکانی بەرهەمهێنەر بە بێ ڕێنوێنی و ڕابەری و هاوبەشی ڕاستەوخۆی زانست مومکین نییە. ئەمڕۆ ئەزموونە زانستییەکان بە توندی بوونەتە سەنعەتی و بە کۆمەڵ و ئیتر عالمی تەنیا کارێکی پێ ناکرێ. بۆ ناسینی دنیای دەرەوە شعوری مرۆڤایەتی لە دوو قۆناغدا کاردەکا. یەکەم قۆناغی حسی (درك کردن) و دووەم قۆناغی عەقڵی.

لە قۆناغی حسیدا مرۆڤ بە حەواسی خۆی دنیای دەرەوە هەست دەکا. لە قۆناغی عەقڵیدا ئەوەی هەست و دەرکی کردووە دەخاتە شکلی مەفاهیمەوە. و لە کۆکردنەوە و هەڵاواردنی ئەم مەفهومانە ئەحکامی مەنتیقی دەسازێنێ و نەتیجەی مەنتقی وەردەگرێ. جوڵانەوەکانی کۆمەڵایەتیش بە قۆناغی حسی و قۆناغی عەقڵیدا تێدەپەڕن. لە قۆناغی حسیدا تین و تاو و سۆز بەسەر خەباتکەرانی جوڵانەوەدا زاڵ دەبێ و تێگەیشتنی واقعییەت بە باری ئیحساساتدایە. لە قۆناغی عەقڵی جوڵانەوەکاندا تێدەکۆشین تا یاساکانی لەمەڕ جوڵانەوەی کۆمەڵایەتی بە قوڵی تێبگەن و خەبات بە باری دروست و واقعبینیدا بەڕێ بکەن. ئەم مەبەستانە کە وتمان "تیئۆری ناسینی" ناوە و بەشێکە لە ماتێریالیزمی فەلسەفی.

## دەرسی پێنجەم

## ماتێریالیزمی مێژوویی

### ماتێریالیزمی مێژوویی چییە؟

ئێمە ئەگەر یاساکانی دیالەکتیك بەسەر ڕەوتی کۆمەڵدا تەتبیق بکەین و ، لەم ڕوانگەیەوە دیاردەکانی مێژوویی مرۆڤ و کۆمەڵی مرۆڤایەتی سەرنج بدەین فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتی تایبەتیمان دەست دەکەوێ کە پێی ئەڵێن ماتێریالیزمی مێژوویی.

ماتێریالیزمی مێژوویی لە ڕاستیدا کۆمەڵ ناسینی مارکسیستییە. ئەم کۆمەڵ ناسییە تەواوترین و وردترینی کۆمەڵ ناسییەکانە. سەرمایەدارەکان نایانەوێ چۆنییەتی و ناوەڕۆکی دیاردەکانی کۆمەڵایەتی بەو چەشنەی کە هەیە ئاشکرا بێ. لەبەرئەوە لە وڵاتەکانی سەرمایەداریدا جامعە و کۆمەڵناسی بە لێکۆڵینەوەی تەجریبی تەنگەبەر دەکا و یاساکانی ڕەوتی مێژوو دەرناکێشێ.

مارکسیزم بە پێچەوانەی ئەوە ئەیەوێ ئەم یاسایانە بخاتە ڕوو چینەکانی شۆڕشگێڕ بەم یاسایانە ئامادە بکات تا ئەوان بەسەر ڕەوتی لەخۆوەی مێژوودا زاڵ بن و دەستیان بگاتە هونەری شۆڕش و کۆمەڵی تازە دامەزرێنن.. بە پێی ماتێریالیزمی مێژوویی دەزگای جامعە و کۆمەڵی مرۆڤ لە دوو بەشی گرنگ و بنەڕەتی پێکهاتووە.

یەکەم: ژێربینا (البنية التحتية) یاخود وجودی مادی کۆمەڵ

دووەم: سەربینا (البنية الفوقية) یاخود شعوری کۆمەڵ

ژێربینا.. تێکڕای پەیوەندییەکانی ئابووری کۆمەڵێکی تایبەتییە کە لە هێزەکانی بەرهەمهێنەر و پەیوەندییەکانی بەرهەم پێکهاتووە. هێزەکانی بەرهەمهێنەر بریتین لە مرۆڤەکانی بەرهەمهێنەر لەگەڵ ماشینەکان یان ئالەت و ئامرازەکانی بەرهەم، بەڵام پەیوەندییەکانی بەرهەم، واتە پەیوەندییەکانی موڵکایەتی، یانی ئەمە چ کەسێك خاوەنی ئامراز یان ماشینەکانی بەرهەمهێنەرە لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵدا لە کاتی بەرهەمهێناندا چ چەشنە پەیوەندییەك هەیە. پەیوەندی سوود و قازانج کێشانەوە یاخود پەیوەندی هاوکاریکردن؟

ئەم دوو مەفهومە.. واتە هێزەکانی بەرهەمهێنەر و پەیوەندییەکانی بەرهەم مەفهوم و مەقولەیەکی یەکجار گرنگن.

سەربینای جامیعە و کۆمەڵ واتە ڕوحیات و فیکر و بیروڕا و بڕواکانی کۆمەڵ. سەربینا بە بەشێك لە شعوری کۆمەڵ ئەزانن کە گۆڕانی ژێر بینای کۆمەڵ ئەویش ئەگۆڕێ.

چ پەیوەندییەك (لە نێوان سەربینا و ژێربینادا هەیە؟).

بە گۆڕانی ژێر بینای کۆمەڵ واتە بە گۆڕانی شێوەی وجودی کۆمەڵ: گۆڕانی ئالەتەکان.. ماشینەکان پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و موڵکایەتی، بە کورتی بە گۆڕانی ژیانی ئابوری کۆمەڵ سەربیناش ئەگۆڕدرێ. یانی لە ڕوحیات و بیروڕا و بڕوای کۆمەڵدا گۆڕان پەیدا دەبێ.. بەڵام مارکسیزم تەنیا سەرنجی کاریگەری گۆڕانی ژێربینا لەسەر بینا نادات. ئەگەر مارکسیزم کاریگەری ژێربینای لە سەر بینادا بدیایە و پێچەوانەی ئەوی نەدیایە. تووشی هەڵەیەکی گەورە ئەهات.. دوژمنەکانی مارکسیزم بوختانێکی ئاوا بەم قوتابخانە زانستییە ئەکەن و ئەڵێن مارکسیزم دەورگێڕانی مەسەلەکانی ئابوری لە ڕەوتی مێژوودا موتڵەق کردووە. ئەم بوختانە نادروست و بێ جێیە. مارکسیزم لەم بڕوایەدایە کە سەربینای کۆمەڵ واتە ئایین– ماف– سیاسەت. فەلسەفە– ڕوسم و عادەت. ڕوحیاتی کۆمەڵایەتی و هی تر. بە نۆرەی خۆی کارئەکاتە ژێربینا و ڕەوتی ئەو خێرا یان شل دەکات. بەم پێیە سەربینا و ژێربینا کاردەکەنە یەکتر، بەڵام ژێربینا بە کارترە و دەورێکی گرنگتر دەگێڕێت جگە لەمە سەربینای کۆمەڵ بەش بە حاڵی خۆی جوڵە و بزوتنێکی نیسبیی سەربەخۆشی هەیە. چونکە لە تەرکیبی بیروبڕوا و ڕوحیات و ڕەسم و عادەتی پێشوو –بیروبڕوا و ڕوحیات و ڕەسم عادەتی تازە پەیدا دەبن بێئەوەی گۆڕانێکی گرنگ لەژێر بینای کۆمەڵدا بووبێت.

ئەگەر ئێمە ئەم تەئسیرە پێچراوەیەی ژێربینا و سەربینا لە یەکتردا و ئەم گۆڕانی تا ڕادەیەك سەربەخۆیەی سەربینا بە چاکی تێبگەین فەلسەفەی کۆمەڵایەتی مارکسیزم تێگەیشتووین و تووشیلا

ئیقتصادیەت و موتڵەقکردنی عاملی ئابوری نابین. ئەگینا تێی نەگەیشتووین. بەشی هەرە گرنگی فەلسەفی کۆمەڵایەتی مارکسی ئالێرەدایە.

## دەرسی شەشەم

### پەیوەندی هێزەکانی بەرهەمهێنەر و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و شۆڕشی کۆمەڵایەتی

بۆئەوەی کە هێزەکانی بەرهەمهێنەر بە بێ بەرهەڵست و بە ئازادی پێبگەن و بەخۆدا بێن، ئەبێ پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان واتە (پەیوەندییەکانی موڵکایەتی پەیوەندییەکانی ئابوری لەناو ئەندامەکانی کۆمەڵدا) بە چەشنێك بێ کە مەیدانی ئەم پێگەیشتن و بەخۆدا هاتنە بدات. لە حاڵەتێکی وادا ئەڵێین لە نێوان هێزەکانی بەرهەمهێنەر و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێناندا پێکەوە گونجان و توافق هەیە. بەڵام کاتێك دێت کە پێگەیشتن و بەخۆداهاتنی هێزەکانی بەرهەمهێنەر ئیتر لە چوارچێوەی پەیوەندییەکانی وەختدا سەرناگرێ و ئەم پەیوەندییانەی بەرهەمهێنان یا چەشنی موڵکایەتی و پەیوەندییەکانی تری ئابوری ناو ئەندامانی کۆمەڵ بۆ پێگەیشتن و بەخۆداهاتنی هێزەکانی بەرهەمهێنەر دەبنە بەرهەڵست.. بۆ نموونە. ڕژێمی پاشایەتی پێش شۆڕشی (14ی تەموز) بەرهەڵستی پێگەیشتن و بەخۆداهاتنی هێزەکانی بەرهەمهێنەر بوو لە دێهات و تەواوی ئابوری وڵاتدا.. ئەوە بوو سەردەمی نەگونجان و تەوافق نەکردنی هێزەکانی بەرهەمهێنەر و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان دەستی پێکرد.. ئەوە سەردەمی دەستپێکردنی شۆڕشی کۆمەڵایەتی بوو.. شۆڕشە پیرۆزەکەی 14ی تەموز تەقییەوە.. لە حاڵەتی وادا کۆمەڵ ناچارە تەشکیلات و یاسا و ڕژێمە کۆنەکەی خۆی بگۆڕێ. تەشکیلات و یاسا و ڕژێمی تازە دابمەزرێنێ.. بارودۆخێکی وا پێکبێنێ کە لەگەڵ پێگەیشتن و بەخۆداهاتنی هێزەکانی بەرهەمهێنەر بگونجێ و ڕێك بکەوێ.. کۆمەڵ ناچارە چەشنی کونەی موڵکایەتی بگۆڕێ. چەشنی تازەی موڵکایەتی لە جێی ئەو دابنێ.. سەبارەت بەمە موڵکایەتی خاوەنی کۆیلەکان جێی خۆی بۆ موڵکایەتی دەرەبەگەکان بەجێهێشت.. موڵکایەتی دەرەبەگەکان جێی خۆی بۆ موڵکایەتی سەرمایەدارەکان بەجێهێشت. بە فەوتانی سەرمایەداری موڵکایەتی تایبەتی کۆتایی دێت. چونکە بەرهەمهێنان لەم سەردەمەی ئێمەدا زۆر بە توندی بۆتە کۆمەڵایەتی و ئەم بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتییە لە چوارچێوەی موڵکایەتی تایبەتی سەرمایەدارەکاندا ناگونجێ. لەبەرئەمە ئەبێ موڵکایەتی کۆمەڵی واتە (سۆسیالیستی) پەیدا بێ تا هێزەکانی بەرهەمهێنەر بە ئازادی و بەبێ بەرهەڵست پێبگەن و بەخۆدا بێن.

ئەم ڕێباز و ڕەوتەی باسمان کرد ناونراوە (یاسای توافقی حەتمی هێزەکانی بەرهەمهێنەر و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان) مارکس ئەم یاسایەی دۆزیوەتەوە.. ئەمڕۆ گەلێ لە کۆمەڵناسەکانی سەرمایەداریش دان بەوەدا ئەنێن کە یاسای تەوافقی حەتمی هێزەکانی بەرهەمهێنەر و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان ڕاست و دروستە. مارکس بە پێی ئەم یاسایە پێویستی بەرپابوونی شۆڕشی کۆمەڵایەتی سەلماند. لەبەرئەمە شۆڕش دیاردەیەکی حەتمی پێگەیشتنی کۆمەڵە. شتێکی هەڵبەستراو دڵخواز یا ئەنجامی "کەلەشەقی" کۆمەڵانی گەل نییە. وەك تاقم و دەستەکانی دژی شۆڕشگێڕی کۆمەڵ دەیانەوێ نیشانی بدەن.

واتای شۆڕش. گواستنەوەی دەسەڵاتی حوکمە لەدەست چینەکانی خۆپارێز و کۆنەپەرستەوە بۆ دەست چینەکانی پێشکەوتوو کە دەیانەوێ ڕژێمی تازە بە سوودی پێگەیشتن و بەخۆداهاتنی کۆمەڵ دامەزرێنن واتای شۆڕش لە باری زانیاری مارکسیزمی– لێنینزمە و لەم گواستنەوەی دەسەڵاتە زیاتر هیچی تر نییە.

بەڵام شۆڕش لە باری شێوەی بەرپابوونییەوە دوو جۆرە (هێمنانە. بە زۆر).

چەشنی گرنگی شۆڕشی بە زۆر بریتییە لە ڕاپەڕینی چەکدار و شۆڕشگێڕی یان (شەڕی پارتیزانی– پێشمەرگایەتی) شۆڕشی هێمنانە لە ڕێگەی دەستخستنی زۆربەی دەنگ لە کۆمەڵدا و ڕوخاندنی یاسای ئارامی دەستەی حوکمداری کۆنەپەرستەوە پێکدێت. لە هەردوو بارەکەیدا شۆڕش گۆڕانکارییەکی کەیفیە لە کۆمەڵدا. جگە لە مەرجی تەوافق نەبوونی نێوان هێزەکانی بەرهەمهێنەر و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان بۆ سەرکەوتنی شۆڕش مەرجی (بابەتی و خودی عەینی و زەینی) (الشروط الموضوعیة والذاتیة)ی پێویستە.

مەرجی بابەتی شۆڕش: بریتییە لە بوونی بارێکی شۆڕشگێڕی لە کۆمەڵدا.. باری شۆڕشگێڕی ئەو کاتەیە کە دەستەی حوکمدار تووشی ئاڵۆزی ببێ و نەتوانێ بە شێوەی پێشوو حوکمداری بکات و ژێردەستەکانی کۆمەڵیش تووشی هەژاری و بێ دەرەتانێکی قورس ببن و ئیتر نەیانەوێ بە چەشنی پێشوو حوکمیان بەسەردا بکرێ و تێکۆشان و چالاکی شۆڕشگێڕی بە خێرایی پەرە بگرێ.

مەرجی (زەینی) خودی شۆڕش:

بوونی حزبی شۆڕشگێڕی چینی پێشڕەوە. حزبێکی وا کە بتوانێ کۆمەڵانی هەژار بە دوای خۆیدا ڕابکێشێ. لە سەردەمی ئێمەدا مەرجی زەینی شۆڕش بریتییە لە بوونی حزبی چەشنی نوێی چینی کرێکار کە بتوانێ توێژەکانی زەحمەتکێشی شار و لادێ بە دوای خۆیدا ڕابکێشێ و بە شۆڕشگێڕی شۆڕش بەرێتە سەر. لینین ئەڵێ: لەمەڕ بارودۆخی شۆڕشگێڕی ئەوەندە بەس نییە کە ژێردەستەکان و ئەوانی لای خوارەوە نەیانەوێ.. بەڵکو پێویستە دەسەڵاتدارەکان و ئەوانی لای سەریشەوە نەتوانن.

هەلپەرستە یەمینییەکان پێویستی شۆڕشی کۆمەڵایەتی ڕەت دەکەنەوە و وا بانگەشە دەکەن کە لە ڕێگەی ڕیفۆرمەوە ئەتوانن بگەن بە ئامانج!!

ئاژاوەچییە چەپەکانیش (الیساریە الفوضویة) پێویستی بوونی مەرجەکانی عەینی و زەینی ڕەت دەکەنەوە و وا خەیاڵ دەکەن کە بە

هەندێ ئازایی و خۆڕاهێنانی شۆڕشگێڕی ئەتوانن ڕژێمی کۆنەپەرست بڕوخێنن.

مارکسیزم- لێنینیزم هەلپەرستی ڕاستڕەوی و ئاژاوەچێتی چەپیش ڕەت ئەکاتەوە.

دەرسی حەوتەم

چینەکانی کۆمەڵ و دەوڵەت

(طبقات المجتمع والدولة)

کۆمەڵ لەو توێژانە پێکدێ کە نەخشی ئەوان و دەورگێڕانیان لە ئابوریدا یەك چەشن نییە و پێیان ئەوترێ چینەکان. ئەتوانین چینەکان بە (3) دەستە بەش بکەین.

1-چینەکانی چەوسێنەر (سوودکێشەرەوە- الطبقات المضطهدة) ئەم چینە خاوەنی هۆیەکانی بەرهەمهێنانن. بەڵام خۆیان خەریکی کاری بەرهەمهێنان نابن. بۆ نموونە. لە کۆمەڵی ئێمەدا خاوەن موڵکەکان و سەرمایەدار (بۆرژوا)کان گرنگترین ڕەنج خۆر و چەوسێنەرن.

2-چینەکانی چەوساوە (الطبقات المضطهدة): ئەم چینە خاوەنی هۆیەکانی بەرهەمهێنان نین، بەڵام خۆیان خەریکی کاری بەرهەمهێنان ئەبن بۆ نموونە لە کۆمەڵی ئێمەدا کرێکارانی پیشەسازی و کشتوکاڵی (پرۆلیتاریا) گرنگترین چینەکانی چەوساوەن.

3-چینەکانی ناونجی (الطبقات الوسطى):

ئەمان خاوەنی هۆیەکانی بەرهەمهێنانیشن و خۆشیان ڕاستەوخۆ خەریکی کاری بەرهەمهێنان ئەبن وەك سەنعتکاریەکانی شارەکان و ڕیزەکانی ناونجی و دەستکورتی دێهات.

بە درێژایی مێژووی نوسراوی مرۆڤایەتی، لە نێوان چەوسێنەرەکاندا وەك (ئاغا و بەگ و سەرمایەدارەکان) لە لایەکەوە و چەوساوەکان وەك (مسکێن و ڕەعیەت و فەلاحی هەژار و کرێکاران) لە لایەکی ترەوە خەباتی چینایەتی هەبووە. چینە ناونجییەکانیش هەمیشە بە پێی ئەوە کە بارودۆخیان ئەوانی لە کام دەستە نزیك کردۆتەوە لەم ناوەدا ئەملاو ئەولایان کردووە.

ڕوناکبیران: ئەم دەستەیە پێکهاتووە لە هەموو ئەندامانی چینەکانی کۆمەڵ -چەوسێنەر یان چەوساوە- لەوانەی کە خەریکی کاری فیکرین وەك (دکتۆر- هونەرمەند- پارێزەر- ئەندازیار- مامۆستا- خوێندکار- هتد..) کار بەدەستان و فەرمانبەرانیش توێژێکی ترە لە کەسانی تێکەڵ و هەڕەمە پێکهاتووە. باری هاوبەشیان کارکردنە لە دەزگای دەوڵەتدا. هەندێك کەس فەرمانبەران بە بەشێك لە ڕووناکبیران ئەزانن.. ئەتوانین فەرمانبەرەکان بە (عەسکەری و مەدەنی) بەش بکەین.

لێنین: تێگەیشتنی پێکهاتن و بینای چینایەتی کۆمەڵی زۆر بە گرنگدا ئەنا و دەیسپارد کە دەربارەی دروشمەکان و بیروڕای سیاسییەکان سەرنج بدەن و بپرسن کە بە قازانجی کام چینن.

دەوڵەت: لە کۆمەڵێکدا کە بناغەی لەسەر چینەکانی لە ئاشتی نەهاتووی چەوسێنەر و چەوساوە بێ، نوێنەری چینە چەوسێنەرەکانە. لە کۆمەڵێکی ئاوادا دەوڵەت هەر شێوە و چەشنێك بێت لە ناوەڕۆکدا دیکتاتۆری ئەم چینانەیە. بۆ نمونە لە کۆمەڵی سەرمایەداریدا دەوڵەت دکتاتۆریی سەرمایەدارەکانە، واتە دیکتاتۆری کەمایەتییە لە دژی زۆربەی خەڵك. بەڵام لە سەردەمی گواستنەوە لە سەرمایەدارییەوە بۆ کۆمەڵی سۆسیالیستی دەوڵەت دیکتاتۆری پرۆلیتاریایە. واتە دیکتاتۆریی زۆربەیە بە سەر کەمایەتیدا.

سۆسیالیزم چینەکانی چەوسێنەر لەناو ئەبا.. هەر لە سەرەتاوە لە کۆمەڵدا ئەو چینانەی کە قازانجی هاوچەشنیان هەیە ئەهێڵێتەوە لە پاشدا وردە وردە بەرەو پێکهێنانی کۆمەڵی خاڵی لە چین دەڕوات.

دەرسی هەشتەم

قۆناغەکانی ئابوری-کۆمەڵایەتی

ئەگەر لە بارەی بارودۆخی هێزەکانی بەرهەمهێنەر و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و پێکهاتن و چینایەتییەوە سەرنجی مێژوو بدەین و بمانەوێ بەم پێیە چینەکان دابەش بکەین و وردببینەوە ئەتوانین پلە و قۆناغی وا دەستنیشان بکەین کە تا ڕادەیەك کۆمەڵانی هەموو وڵاتان بەرە بەرە و بە دوای یەکدا بەم پلە و قۆناغەدا تێئەپەڕن. قۆناغەکانیش ئەمانەن.

(شیوعییەتی سەرەتایی-کۆیلایەتی-دەرەبەگایەتی-سەرمایەداری-سوسیالیزم). ئەوا بە کورتی باسی هەر یەك لەم قۆناغانە ئەکەین:

1-شیوعییەتی سەرەتایی: ئەو کاتەیە کە موڵکایەتی تایبەتی نەبوو چونکە پێگەیشتن و بە خۆداهاتنی هێزەکانی بەرهەمهێنەر لە ڕادەیەکی یەکجار نزم و دواکەوتوودا بوو. شیوعییەتی سەرەتایی وردە وردە پێی نایە قۆناغی سستمی خێزانییەوە و لە سیستمی خێزانیدا پەیوەندی خوێن و خزمایەتی زۆر بە گرنگ دائەنرا. لەم سستمەدا لە سەرەتاوە دەورگێڕانی ژن و دایك لە کۆمەڵدا زیادبوو ئەم کۆمەڵە بە گەورەیی دایك (عهد زعامه الام) ناوئەبرێ لە پاشدا دەورگێڕانی پیاو و باوك لە کۆمەڵدا زۆر بوو و ئەم کۆمەڵە پێی ئەوترا باوك گەورەیی. پاشماوەی سستمی خێزانی و باوك گەورەیی هێشتا لە ناو تیرە و هۆز و خێڵەکانی کوردا زۆرە.

2-کۆیلایەتی: وردە وردە لە کۆمەڵدا موڵکایەتی تایبەتی پەرە دەگرێ. دیلەکانی شەڕ و زۆر لە قەرزدارە هەژارەکان دەکرێنە کۆیلە، کۆمەڵ دابەش ئەبێ بە دوو بەشەوە. (گەورەکان و کۆیلەکان) ئەمە یەکەمین چینەکانی لە ئاشتی نەهاتوون لەناو کۆمەڵدا کاروباری ڕەنجی کۆیلەکان بە تەواوی هی گەورەکان بوون و گیانی هەر کۆیلەیەك لەبەردەستی گەورەکەیدا بوو.

3-دەرەبەگی: لەم ڕژێمەدا واتە ڕژێمی ئاغا و ڕەعیەت، ڕەعیەت بە پێچەوانەی کۆیلە، ئەیتوانی بەشێك لە بەروبوومی کاری خۆی بۆ خۆی

هەڵگرێ و بەشێکیشی بدا بە ئاغا. هەرچەندە ڕەعیەت لە زنجیرەی دیلێتی ئاغادایە. بەڵام ئاغا قانونی حەقی کوشتنی ئەوی نییە. ئاغا بێکار بە ڕەعیەت دەکا و موڵکانە و خەرج و باج و پیتاکی نەختینە و بەربوومی لێ دەستێنێ. لە کۆمەڵی ئێمەدا هێشتا پاشماوەی هێزی ڕژێمی ئاغا و ڕەعیەتی دەبینرێ.

4–سەرمایەداری: یان کۆمەڵی کاری کرێ گرتەیی:

بە پێگەیشتن و بەخۆداهاتنی هێزەکانی بەرهەمهێنەر وردە وردە کارگە و کارخانە پەیدا ئەبێ.. هەژارەکانی شار و دێهات هێزی شان و باهوی خۆیان بە سەرمایەدارەکان ئەفرۆشن و ئەبنە کرێگرتە. سەرمایەدارەکان بەروبوومی کاری کرێگرتەکان بۆ خۆیان هەڵدەگرن.. ئێمە لە دەرسێکی تردا بە درێژی باسی سەرمایەداری ئەکەین.

5–سۆسیالیزم– ئیشتراکییەت:

چەوساوە و ڕەنج خوراوەکان بە ڕابەرایەتی چینی کرێکار دەسەڵاتی سەرمایەدارەکان تێك ئەدەن و موڵکایەتی کۆمەکی دائەمەزرێنن.. ئێمە دەربارەی سۆسیالیزم لە دەرسێکی تردا بە درێژی باسی ئەکەین.

مارکس دەربارەی چەشنێکی تریش قسەی کردووە کە لە ئاسیادا بووە و ناوی ناوە (شێوەی بەرهەمهێنانی ئاسایی) کە لەسەر کۆمۆنی وەرزێری و موڵکایەتی گەورە و فراوانی دەوڵەت لە زەوی و زاردا و لەسەر ڕژێمی دکتاتۆری سەختی پاشایەتی دامەزراوە.. و باری خودایەتی پادشاشی لەگەڵ بووە.. ئەمە هێشتا باسی لەسەر ئەکرێت.

بەهەرحاڵ پێویستە بزانین ئەم چەشنە و قۆناغانەی باسمان کردن لە هەموو وڵاتەکاندا یەك شێوە و جۆر نەبوون و هەر وڵاتە تایبەتمەندی خۆی هەیە.. بۆ نموونە دەرەبەگی وڵاتی ئێمە و وڵاتانی دروسێمان بە چەشنی دەرەبەگی ئەوروپا نییە.. ئەگەر کەسێ بیەوێ ئەم چەشنانە بە یەك جۆر بزانێ تووشی هەڵە دەبێ.. پێویستە تایبەتمەندییەکانی پلە و قۆناغەکان بە وردی تێبگەین و بە باشی سەرنجیان بدەین.

دەرسی نۆیەم

سەرمایەداری

سەرمایەداری ڕژێمێکە بناغەی لەسەر چەوسانەوە و ڕەنجخۆری کاری کرێگرتەیە لە لایەن سەرمایەدارەکانەوە. چەوسانەوە و ڕەنج خۆری یاخود سوود لێکێشانەوە ئەوەیە سەرمایەدارەکان ئەو نرخە زیادەیە بۆ خۆیان هەڵئەگرن کە کارگەر بە ڕەنجی شان و کاری خۆی پەیدای ئەکات.

نرخی زیادە: بریتییە لە جیاوازی نێوان ئەو کرێیە کە کرێکار لە بری کاری خۆی وەری ئەگرێ لەگەڵ ئەو نرخە ڕاستەقینەیەی کە بە ڕەنج و کاری خۆی پێکی دێنێ. بۆ نموونە وا دابنێین کە کرێکارێك بە سەعاتێك کارکردنی خۆی یەك مەتر شاڵی تەنیوە کە بایی (200) فلسە.. سەرمایەدار ئەم (200) فلسە نادات بە کرێکارەکە بەڵکو (100) فلسی ئەداتێ کە پێی ئەوترێ کرێ و (100) فلسەکەی تری کە پێی ئەوترێ نرخی زیادە بۆ خۆی هەڵدەگرێ.. لە کۆبوونەوەی وردەوردەی نرخی زیادە سەرمایەدار پەیدا ئەبێ لەبەر ئەمە سەرمایە لە ڕاستیدا بەروبوومی کاری کرێکارانە و کۆبۆتەوە.. سەرمایەدار بە یارمەتی سەرمایە بەرهەمهێنانی کۆمەڵ ئەگرێتە دەست خۆی قازانجی سەرمایەدار و بازرگان و قازانجی خاوەن بانکەکان هەمووی چەشنی جۆربەجۆری نرخی زیادەیە چونکە تاقە هێزێك کە سامان پەیدا ئەکات کاری بەرهەمهێنەرە.. سەرمایەداری لە تەمەنی خۆیدا بە دوو قۆناغی سەرەکیدا تێپەڕیوە:

1–سەرمایەداری پێش ئیحتیکار: کە بناغەی لەسەر بەربەرەکانی و ململانێی ئازادی سەرمایەدارەکانە (المنافسة الحرة) سەرمایەداران لەم سەردەمەدا قازانجێکی ناونجییان دەست ئەکەوێ.

2–سەرمایەداری ئیحتیکاری: کە ململانێی ئازادی تیا تەنگەبەر ئەبێ و تەنها ململانێی ناو خاوەن ئیحتیکارەکان ئەمێنێت.. سەرمایەداری ئیحتیکاری (مۆنۆپۆل) یان ئیمپریالیزم دوای ئەوپەڕی قازانج ئەکەوێت.

لە سەردەمی ئێمەدا سەرمایەداری ئیحتیکاری گەیشتۆتە سەرمایەداری ئیحتیکاری دەوڵەتی واتە ئەو سەردەمەی کە دەوڵەت و ئیحتیکارەکان بە یەکەوە جۆشیان خواردووە و دەستیان داوەتە دەستی یەك تا ئابوری وڵات هەڵسووڕێنن. عەیبی گەورەی سەرمایەداری پەشێوی بەرهەمهێنانە.. بەرهەمهێنان بە هۆی دامەزراوە جۆربەجۆرەکانی سەرمایەداری کە لەگەڵ یەکتر کێبڕکێ (منافسە) دەکەن و بۆ دەستخستنی قازانج پێکدێن.. لەبەرئەمە جاری وا هەیە نرخی زیادی پەیدا ئەبێ و سەردەکێشێتە ئاڵۆزی و بێکاری بە کۆمەڵ و شتی واوە.

سەرمایەداری ئیحتیکاری دەوڵەت ئەیەوێ بەرگری ئەم پەشێوییەی بکات بەڵام هەوڵدانەکەی چاری بنەڕەتی نییە و ڕووکەشە.. سەرمایەداری بە تایبەتی لە سەردەمی ئیحتیکاریدا لە ڕێگەی دەستتێوەردانی ئابوری و سیاسی و نیزامییەوە وڵاتەکانی لاواز و دواکەوتوو دەکێشێتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، ئەو وڵاتانەی کە لەژێر دەستی ئیمپریالیستەکاندان دوو بەشن.

1–وڵاتانی ژێردەستە (المستعمرة) کە تەنانەت سەربەخۆیی تەواویشیان نییە و حکومەت بە ئاشکرایی بەدەست ئیمپریالیستەکانەوەیە.

2–وڵاتانی نیوەژێردەستە (شبه مستعمرة) کە حکومەت ڕاستەوخۆ بە دەست ئیمپریالیستەکانەوە نییە و سەربەخۆیی بە ڕواڵەت هەیە. بەڵام لە ڕاستیدا ئیمپریالیستەکان بەسەر هەموو کاروبارێکی وڵاتدا زاڵن.

–ڕژێمی مستعمەراتی ئیمپریالیستی: لە سەردەمی دوای شەڕی دووەمی جیهانییەوە دەستی کردووە بە ڕووخان و ئێستا تەنیا چەند وڵاتێك بە شێوەی مستعمەرەی ڕەسمی ماونەتەوە.. ئێستا

ئیمپریالیستەکان شێوەی ئیستعماری داپۆشراوتر بەکاردێنن کە بە شێوەی ئیستعماری نوێ (نیو کۆلۆنیالیزم) بەناوبانگە و بەم پێیە دەسەلاتی ئابوری خۆیان لەم ولاتانەدا ڕائەگرن.. جولانەوەی کرێکاران بۆ ڕزگاری لە (ئیستعمار و ئیستعماری نوێ) لە سەردەمی ئێمەدا تێکەڵ بوون.. لە ڕاستیدا ڕزگاری لە چنگ ئیستعمار بە بێ ڕزگاری لەدەست سەرمایەداری لە تواناادا نییە.

## دەرسی دەیەم

سۆسیالیزم:

بە ڕووخانی سەرمایەداری و دامەزراندنی دکتاتۆری برولیتاریا مەرجی کۆمەلایەتی پێکهێنانی کۆمەڵی نوێی سۆسالیستی پێکدێت.. بە پێچەوانەی سەرمایەداری کە لە خۆیەوە لە ناوجەرگە و هەناوی کۆمەڵی دەرەبەگیدا پێئەگات و پەیدائەبێت کۆمەڵی سۆسیالیستی بە وریایی و تێگەیشتویی بە هۆی حزبی پێشڕەوی چەشنی نوێی چینی کرێکارەوە -یانی حزبی شیوعی- دروست ئەکرێت.. ئەم کۆمەڵەیە بە دوو قۆناغدا تێپەڕ ئەبێت:

1)قۆناغی سۆسیالیستی:

کۆمەڵ لەم قۆناغەدا لەسەر بنچینەی (لەهەر کەس هێندەی توانای و بۆ هەرکەس هێندەی کارەکەی) دائەمەزرێ.. سەبارەت بەوەی توانا و ئیش و کار جۆربەجۆرە ئەو کرێیەش کە ئەدرێ جۆربەجۆرە.. لەبەرئەوە لەم کۆمەڵەدا هێشتا یەکسانی و یەك چەشنی ڕاستەقینەی ئابوری و کۆمەلایەتی پێك نەهاتووە.

2-قۆناغی کۆمۆنیستی:

کۆمەڵ لەم قۆناغەدا لەسەر بنچینەی (لەهەرکەس هێندەی توانای و بۆ هەرکەس هێندەی پێداویستی) دائەمەزرێ.. لەبەرئەوەی کە پێداویستی تەقریبەن یەك چەشنە لەم قۆناغەدا یەکسانی و بەرامبەری ڕاستەقینەی ئابووری و کۆمەلایەتی پێکدێت.. قۆناغی کۆمۆنیستی تەنیا ئەوکاتە دائەمەزرێت کە نعمەتەکانی مادی و مەعنەوی بە زۆری پەیداکرێ و لە نێوان کاری فیکری و بەدەنیدا جیاوازی نەمێنێ.. لە نێوان شار و دێدا جیاوازی نەمێنێ.. سەرکەوتنی کۆمۆنیزم لەسەر بنچینەی بەرزترین ڕادەی تەکنیك و زانیاری و ڕابەرایەتی عیلمی کۆمەڵ و لەسەر بنچینەی ئامادەیی ڕوحیاتی عیلمی کۆمەڵ و لەسەر بنچینەی ئامادەیی ڕوحیاتی کۆمەڵێ لە تواناادا ئەبێ.

لەو کۆمەلانەدا کە زۆر پەرەیان نەسەندووە و کەم بووژاوەن و هێشتا پاشماوەکانی سستمی خێزانی و دەرەبەگ هەیە و دەسەلاتی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی دەولەتە ئیمپریالیستەکان بەسەریاندا هەیە شۆڕشی سۆسیالیستی ناچارە لە پێشدا بە قۆناغی میللی و دیموکراسیدا تێپەڕێ. ئەم قۆناغە ئامادەیی و بووارە.

کەوابوو ئەرك و فرمانەکانی قۆناغی میللی و دیموکراتی بریتییە لە (هێنانەدی سەربەخۆیی سیاسی و ئابووری و ئیصلاحی زراعی ڕاستەقینە و پەرەپێدانی بەشی دەولەت لە ئابووریدا و هێنانەدی حاکمیەتی کۆمەلایەتی خەڵك و مافی گەلەکان و بە دیموکراتی کردنی ژیانی کۆمەلایەتی) و بەم پێیە لە هەموو بارێکەوە ڕێگە بۆ دامەزراندنی کۆمەڵی سۆسیالیستی خۆش ئەکرێت.

قۆناغی میللی و دیموکراسی پێویستە بە وردی و ئارام نشینەیی ڕابورێ و هەوڵ بدرێ عناصری سۆسیالیستی -نەك بە زۆر و فرمان- بەڵکو بە نیشاندان و ئیسپاتی باشی و زیندوویەتی خۆیان بەسەر عناصری غەیرە سۆسیالیستیدا زاڵ ببن.. ئەگەر لە تێپەڕبوون بە قۆناغی میللی و دیموکراتیدا پەلەو تالوکە بکرێ و سۆسیالیزم بە زۆر فرمان و ئەسپاردن دامەزرێ زیانێکی وا لە سستمی کۆمەلایەتی پەیدا ئەبێ کە بە ئاسانی چارەسەر ناکرێ.

تەنیا ئەو کاتە قۆناغی دیموکراتی میللی دەتوانێ ببێتە سەرەتای دامەزراندنی سۆسیالیزم کە ڕابەرایەتی چینی کرێکار و حزبی ئەو کە بە بیروباوەڕی مارکسیزم-لێنینیزم چەکدار بێ- لە کۆمەڵدا مسۆگەر کرابێت.

## دەرسی یانزەهەم

حزب:

حزبی چەشنی نوێی چینی کرێکار باشترین چەکی پێویست و گرنگە بۆ دەستخستنی سەرکەوتنی خەباتی چینایەتی و شۆڕش و سەرکەوتن لە دامەزراندنی ژیانی نوێی سۆسیالیستیدا.. حزبی چەشنی نوێی چینی کرێکار شوێنی کۆبوونەوە و ناوەندی پێشڕەوترین کەسانی چینی کرێکار و تەواوی ئەو کەسانەیە کە ئامادەن لە ڕێگەی ئامانجەکانی ئەم چینەدا خەبات بکەن.

حزبی شیوعی تاقە حزبی چەشنی نوێی چینی کرێکارە لە ولاتێکدا کە خەڵکی جۆربەجۆری تێدا ئەژین حزبی چەشنی نوێی چینی کرێکار (هەروەها ڕێکخراوەکانی تری چینی کرێکار) ئەبێ تاقە ڕێکخراوی تەواوی خەڵکەکانی بێ تا خەباتی گشت کرێکاران یەك و بەرەو سەرکەوتنیان ببات.. حزب لە ڕابەرایەتی و کادر و ئەندامانی سادە پێکدێت.. ڕابەرایەتی لە حزبدا کۆمەڵییە (جماعی) بەلام مەسئولییەت بەرپرسیاری فەردییە.. کاری ڕابەرایەتی بە پێی ڕێوشوێنی زانست دیاری ئەکرێت و ئەمەش چوار بەشە:

1-کۆکردنەوەی بەڵگەی پێویست و موتالاکردنیان بە وردی.

2-لێکۆڵینەوە و پشکنینی بەڵگەکان بە پێی مارکسیزم- لێنینزم.

3-دەرهێنان و دانانی دروشم و ڕێنوێنییەکانی کار لەو لێکۆڵینەوانە.

4-بەجێگەیاندنی ئەم دروشم و ڕێنوێنیانە.. پێڕاگەیشتنی بەجێگەیاندن و ڕاستکردنەوەی هەڵە و سەرلێشێوان.. بە کورتی شێوەی بیرکردنەوە و کاری ڕابەرایەتی و تەواوی حزب نابێ شێوەی زەینیگەری (ذاتی) بێ. بەڵکو ئەبێ سەرنجی واقعی (عەینی- موضوعی) بدرێ بێئەوەی گوێ بدرێتە ئەوەی ئاخۆ بە باری ئاوات و ئارەزووی ئێمەدایە یان نا.

ناوەڕۆکی مەرکەزی حزب کە ڕێکخراوەی حزب هەڵئەسوڕێنێ پێی ئەوترێ کادر یان تێکۆشەرانی حزب. کادر لە تێکۆشەرترین و وریاترین ئەندامی حزب بە پێی هەڵبژاردن یا دیاریکردن ئەخرێنە سەرکار.

دامودەزگا و بینای حزبی چەشنی نوێی چینی کرێکار بە پێی مەبدەئی ناوەندایەتی دیموکراتی بەڕێوە ئەبرێت. ناوەندایەتی (مرکزیەت) یانی گوێڕادێری کەمایەتی بۆ زۆربە. گوێڕادێری هەیئەتەکانی خوارەوە بۆ ئەوانی سەرەوە و ڕێکوپێکی یەك چەشن لە بەرامبەر ڕێنوێنییەکان و ئەسپاردنی حزبدا. ڕەوشتی دەستەبەش پێکەوەنان و تاقم دروستکردن لە حزبدا قەدەغەیە. بوونی یەکێتی ئیرادە و کارکردن مەرجی بنچینەی پاراستنی دەسەڵاتی تێکۆشەرانی حزبە.

دیموکراتی مانای ئەوەیە ئۆرگانەکانی ڕابەرایەتی بە هەڵبژاردن بێ. ڕابەرایەتی ڕاپۆرت بخاتە بەردەم ئەندامانی حزب. هەقی ڕەخنە و ڕەخنە لەخۆگرتن ئازاد بێ. پێش بڕیاردان باس و لێکۆڵینەوەی پێویست لە مەسەلەکاندا بکرێ. دوای بڕیاردانی تێکڕا بۆ جێبەجێکردنی ئەو شتانەی بڕیاریان داوە تێبکۆشن. بە پێی بارودۆخی خەبات تەناسبی نێوان ناوەندایەتی و دیموکراسی ئەگۆڕدرێ.. بەڵام حزب هەرگیز نابێ لەم مەبدەئە گرنگە دەرچێت.

لە حزبدا ئەبێ باری نهێنی و ئاشکرایی لەبەرچاو بگیرێت.. دەزگاکانی ڕابەرایەتی حزب لە بەرامبەر ئەندامەکانی حزب و ئەندامانی چین و کۆمەڵدا هەمیشە واقعیەت و ڕاستەقینە ئەڵێن. بەڵام هەر لەو کاتەشدا ئەبێ بۆ دەرخستنی سەرکەوتن و بۆ بەربەستی دەرفەتی دوژمن و پاراستنی حزب و ئەندامانی بایەخ بدرێ بە نهێنی لە ئیشوکاردا.

بە باش سەرنجدانی تەناسبی نێوان نهێنی و ئاشکرایی لەو مەسەلە گرنگانەیە کە ئەبێ بە چەشنێکی تایبەتی ڕوون بکرێتەوە.. حزب خاوەنی بەرنامەیەکە کە ئامانجەکانی دوور و نزیکی حزبی تیا ڕوون کراوەتەوە هەروەها خاوەنی پەیڕەوی ناوخۆیە (النظام الداخلي) کە ڕێوشوێن و ژیانی حزبایەتی و پێکهێنانی دامودەزگای حزبی تیا ڕوون کراوەتەوە. ڕێوشوێنی حزب بۆ هەموو ئەندامان وەك یەکە و بەجێگەیاندنی ئەوانە ئەرکی سەرشانی هەموو ئەندامەکانی حزبە. حزب بە بێ جێبەجێکردنی ئەو ڕێوشوێنانە بە وردی و ڕێکوپێکی. توانای خەبات و تێکۆشانی خۆی لە کیس ئەچێت.

## دەرسی دوانزەهەم

خەباتی حزبی:

خەباتی حزبی دوو جۆرە:

1-خەباتی دەرەوەی حزب

2-خەباتی ناوخۆی حزب

یەکەم: خەباتی دەرەوەی حزب: ئەمە خەباتی سەرەکی حزبە.. خەباتی حزبە لە دژی دوژمنەکان و هەموو ئەوانەی پێچەوانەی دیموکراسی و سۆسیالیزمی ئەجوڵێنەوە.. ئەم خەباتە دژی ئەو دوژمنانە و هەموو ئەوانەشە کە بۆ ماوەیەك یان هەمیشە هاوکاریان ئەکەن.. چینی کرێکاریش لەم خەباتەدا لایەنگیر و هاوپەیمانی خۆی هەیە.. مەبەستی ئەم خەباتە گەیشتنە بەو ئامانجانەی کە لە بەرنامەی حزبدا دیاریکراوە. ئەم خەباتە (2) چەشنی هەیە:

A خەباتی ئایدیۆلۆجی یان (فیکری): ئەم خەباتە بە قازانجی دنیابینی و سیاسەتی حزبە. لە دژی دنیابینی و دوژمنەکانی حزبە. لە ڕێگەی پڕوپاگەندەی نووسراو و زمانی و هی ترەوە ئەبێت.

B خەباتی حزبی سیاسی: وەك هاوبەشیکردن لە هەڵبژاردن و لە خەباتی پارلەمانیدا.. ڕێکخستنی خۆپیشاندان بۆ هێنانەدی مەبەستێکی سیاسی. خەباتی جۆربەجۆر بۆ زاڵبوون بەسەر هێزە سیاسییەکانی بەرەنگاردا.

C خەباتی ئابوری: یانی ئامادەکردنی چینی کرێکاران و هاوپەیمانەکانی بۆ خەباتی داواکردن لە ڕێگەی هێنانەدی مافەکانی ئابوری و پیشەیی خۆیاندا.. و هەڵکێشانی ئەم خەباتە لەگەڵ ئامانج و مەبەستەکانی سیاسی.

خەبات بە دوو چەشن ئەکرێ:

1-ئاشکرا لە چوارچێوەی مۆڵەتی یاساییدا.

2-نهێنی و لە پشتەوەی ئەو یاسایانەوە کە هەن حزب لە کاتی کارکردنی ئاشکراییدا هەمیشە خۆی بۆ ئەوە ئامادە بکات کە هەرکاتێ پێویست بوو بە باری نهێنیدا وەرچەرخێت.

خەباتی نهێنی دەسەڵات و دەرەتانی حزب تەنگەبەر ئەکات. لەبەرئەوە ئەبێ حزب لە کاتی نهێنیدا هەمیشە بۆ ئاشکرابوونی خۆی خەبات بکات. لە سەردەمی کاری نهێنیدا حزب ناچارە شێوەی ژیانی خۆی بگۆڕێت. خەباتی دەرەوەی حزب بۆ گەیشتن بە ئامانج دوو چەشنی بنچینەیی هەیە:

-چەشنی هێمنانە و بە ئاشتی.. وەك: ڕاپەڕین.. خۆپیشاندان و.. هتد.

-چەشنی زەبر و بە تەوژم و هێزبەکارهێنان.. وەك: ڕاپەڕین. شەڕی شۆڕشگێڕی.

حزب بە لایەوە باشترە کە لە ڕێگەی هێمنانەوە بە ئاشتی بگاتە ئامانج. بەڵام چینەکانی سەر حوکم و خاوەن دەسەڵات هەروا بە ئاسانی مل نادەن و تێکۆشانی بە تەوژم بە زۆر بەسەر حزبدا ئەسەپێنن.

خەباتی حزبی لە دژی دوژمنەکانی حزب بە پێی ڕێوشوێنێك ئەکرێ کە پێی ئەوترێ ئستراتیژی و تاکتیك.. ئێمە لە دەرسێکی تردا بە درێژی ئەمە ڕوون ئەکەینەوە.

خەباتی ژوورەوەی حزب:

ئــەم خەباتــە لــە دژی ئەوانەیــە کــە دنیــابینی و ڕێوشــوێنی ڕێکخراوەکانی حزب تێك ئەدەن و لە مەبدەئەکانی ژیانی ناوخۆیی حزب لائەدەن و سەرکێشی ئەکەن بە پێچەوانەی بەرنامە و پەیڕەوی ناوخۆ.. ئەم خەباتە بۆ پتەوکردن و یەکپارچەیی حزبە، بۆ چەسپاندنی ڕیزەکانییەتی..، بۆ لەناوبردنی هەڵەی چەپ و ڕاستڕەوییە لە ڕێبازی حزب یان هەیئەتەکانیدا.. شێوەی بنچینەیی خەباتی ژوورەوەی حزب (ڕە خنەیە).. خەباتی ژوورەوەی حزب ئەبێ خاوێن و داهێنەرانە بێت و دووربێت لە ڕەوشتی دەستەیی و تێکدەری و خۆپەرستی و مەبەستی شەخصی.. ئەگەر وانەبێ زیانێکی زۆر ئەدا لە حزب و دەزگاکانی زەبت و ڕەبتی حزبی لاواز ئەکات.

دەرسی سیانزەهەم

ئستراتیژ و تەکتیك

ئستراتیژی و تەکتیکی حزبی چەشنی نوێی چینی کرێکار عیلمێکە کە زانا گەورەکانی چینی کرێکار –مارکس و ئەنگلس و لێنین– و خاوەن بیروڕاکانی تر بناغەیان داناوە.. ئستراتیژی و تاکتیکی حزبی شۆڕشگێڕی چینی کرێکار عیلمی ڕابەرایەتی و خەباتی پڕۆلیتاریا و هەموو زەحمەتکێشەکانە بۆ ڕزگاری نیشتمانی و کۆمەڵایەتی و بۆ سەرکەوتنی سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم.

ئستراتیژ سەردەمێکی مێژوویی پێگەیشتنی شۆڕش ئەگرێتە بەر.. شۆڕش دوو قۆناغی ئستراتیژی هەیە قۆناغی یەکەم دیموکراسی میللی– کە ئامانجی ئستراتیژی لەم قۆناغەدا گەیشتن بە سەربەخۆیی سیاسی و ئابوری و بە دیموکراسی کردنی ژیانی سیاسی و ئابوورییە.

قۆناغی دووەم سۆسیالیستە: دروشمەکانی ئستراتیژی یانی ئەو دروشمانەی کە داوای حزب لە قۆناغێکی تایبەتی ئستراتیژیدا دیاری ئەکات.

بەڵام تاکتیك سەردەمەکانی کەموکورت ناوەوەی قۆناغێکی ئستراتیژی و چەشن و شێوەی دیاریکراوی خەباتیش لە مەرج و زروفێکی تایبەتیدا ئەگرێتە بەر.

تاکتیك بەشێکە لە ئستراتیژ و تابیعی ئەوە. ئەبێ قۆناغەکانی تاکتیك بە جۆرێك دەستنیشان بکرێن و بە چەشنێك ببرێن بەڕێوە کە سەربکێشێتە گەیشتن بە ئامانجی ئستراتیژی. ئەو دروشمانەی کە لە قۆناغەکانی تاکتیکیدا ئەهێنرێنە ناوەوە پێیان ئەوترێ دروشمی تاکتیکی.. قاعیدە و ڕێوشوێنەکانی بنەڕەتی ئستراتیژی و تاکتیکی حزبی شۆڕشگێڕ بە پێی تەجروبە دەستکەوتوون.

لێکۆڵینەوەی وردی مەرجەکانی خودی و بابەتی (الموضوعیة والذاتیة) جولانەوە. لێکدانەوەی وەزعی تایبەتی دنیا و وڵات خۆپاراستن لە دەردی لە ڕێ لادانی چەپ و ڕاست و هەلپەرستێتی یەمینی و یەساری. مەرجی گەیشتن بە ئامانجی باش و دروستی ئستراتیژی و تاکتیکە.

ڕێکخستنی ئەو هێزانەی کە ئەتوانرێ لە کاتێکی تایبەتیدا لە دژی دوژمن یەکبگرن. و چەند بتوانرێ زیاتر ڕووتاندنەوە و تاقخستنەوەی دوژمن. کەڵك وەرگرتن بە جۆرێکی باش لە هەموو عامل و هۆیەکانی لەبار. کەڵك وەرگرتنی دروست لە هێزەکانی هەمیشەیی و کاتی شۆڕش. هەڵبژاردنی ڕاست و دروستی کاتی دەستکردن بەکار. دۆزینەوەی تاڵ و هەودا ئەسڵییەکانی کار لە ڕەوتی خەباتدا. دیاریکردنی کەسانی لێهاتوو بۆ پێسپاردنی کار. بەشکردنی گیروگرفتەکان بە دەستە دەستە و چاککردنی هەر دەستەیەکیان بە جۆرێکی تایبەتی هێنانەدی هەر جارەی بەشێك لە ئامانجەکان بەڵام ڕۆیشتن بە وریایی و ئاگادارییەوە بەرەو ئەو ئامانجانە.. و هەندێ شتی تری لەم بابەتە زنجیرەیەك بنەماو ڕێوشوێنی ئستراتیژی و تاکتیکە و بە پێی تەجروبە دەستکەوتوون و ئەبێ لە ڕەوت و ڕێبازی خەباتدا لەبەرچاو بگیرێن.

سەرچاوە: هەندێ زانیاری مارکسی لینینی، ئامادەکردنی حەسەن قزڵجی، چاپی دووەم، حوزەیرانی 2002 (لەسەر ئەرکی حزبی شیوعی کوردستان چاپ کراوەتەوە).



## نموونەی دەقی وەرگێڕدراو

# 1. چارەڕەشەکان*

نووسینی: ویکتور هۆگۆ

ئەو شەوە شەوێکی بە باو بۆران بوو. زنجە نابووتەکە تاك و تەنیا لە قەراخ دەلیا مابووەوە، لەو تاریکاییەدا ژوورەوەی زنجەکە ڕۆشن و ڕووناك بوو، لە لایەکەوە تۆڕی ماسیگرتن بە دیوارەوە هەڵاوەسرابوو، لە لایەکی تریشەوە قەرەوێڵەیەك ئەبینرا لە تەنیشتییەوە پێنج منداڵی بچکۆلە لەسەر جێگە و بانێك کە لەسەری قەرەوێڵەکە ڕاخرابوو نووستبوون، بڵێسەی ئاگری سووری ئاگردانەکە کە ڕووناکیی دابووە بنمیچەکە.. دایکی منداڵەکان کە ژنی ماسیگرێك بوو، سەری نابووە سەر سەرین، وە لە سەرخۆ دۆعای ئەخوێند.

وت و وێرەی خەفەتاوی و خەیاڵی بە ترس و سام ئارامی لێ هەڵگرتبوو، ژنەکە تاك و تەنیا، هەر بە تەواوی تەنیا بوو وە زۆر بە وردی و شپرزەیی گوێچکەی لە هەراو هوریای دەرەوە گرتبوو ترس و پەشێوی تەنگەتاوی کردبوو، خەم و خەفەت دڵەتەپەی پێخستبوو.

لە دەرەوە، لە پشت دەلاقەی زنجەکە دەریای شڵەژاو ئەیلرفاند، هەموو جێگەیەکی لە چنگی خۆیا ئەگلۆفی، دەریا هاژەی ئەهات و، بە شەپۆلە سپییە کەفاوییەکانیەوە خۆی بە قەراخدا ئەدا، لە هاژەی دەلیا ترس و پەشێوی و، لە ناڵەی با و بۆران خەم و خەفەت هەست ئەکرا، خاوەنی زنجەکە کابرایەکی ماسیگر بوو کە ئەو ڕۆژە دەمی خۆراوا چووبووە دەلیاوە وە هێشتا نەگەڕابووەوە، چەند ساتێکی دوور و درێژ بوو لەگەڵ با و بۆراندا دەستەویەخە بوو، لە تەك شەپۆلەکاندا ئەجەنگا.

لە ساڵانی هەرە زووی منداڵییەوە ناچار بوو مل بۆ فەرمانی ژیان ڕاکێشێت و خەریکی کاری پڕ لە مەترسیی ماسیگری بێت. لەمێژ بوو خووی بەم ژیانەوە گرتبوو، بە باران، بە با و بۆران، بە کرێوە و گەردەلوول و سەهۆڵبەندان، تەنانەت لە سەختترین و ئاڵۆزترین کاتی دەلیادا ئەچووە دەلیاوە، وەك مەرگ بە لایەوە شتێکی باو و بەردەم و دەستان بێت، گوێی بە هیچ شتێك نەئەدا و هەمیشە بە خۆی ئەگوت:

منداڵەکان نانیان ئەوێت، نابێ لە با و بۆران بترسم، ئەبێ بڕۆم، بەربەرەکانی لەگەڵ ژیان و لەتەك شەپۆلە وروژاوەکاندا بکەم، هەمیشە بەم بیروڕایەوە تاك و تەنیا سواری گەمیەکەی ئەبوو، ئەڕۆیشتە ناو گێژاوەوە، ناو شەپۆلی دوابڕاوەوە.

چەند ئازایی ئەوێت؟ چەند کارامەیی ئەوێت کە ئینسان بتوانێ خۆی بە شەپۆلەکانی دەلیا بسپێرێت و لەگەڵ ئەوەشدا بە گژ شەپۆلەکاندا بچێت، چەند گرانە ئینسان بتوانێ بەربەرەکانیی گێژاو و دەلیای شڵەژاو بکات؟ ئەم کارە شان و باهویەکی بەهێز و پتەوی ئەوێت، کاتێ گەردەلوول شەپۆلەکان وەك ماری شەڕانی بە لێواری گەمیەکەدا هەڵئەگەڕێن و ڕەنگ بێ لە ترسی با بێت کە شەپۆلەکان ئەناڵێنن و بە کەفی سپی ئەڕشێنەوە.

(ژانی)ی ژنی ماسیگر هێشتا نەخەوتبوو، بەخەبەر بوو، حەزیشی بکردایە نەیئەتوانی بخەوێ، شپرزەیی و پەشێوی بواری نەئەدا ئارام بگرێ، گرمەگرم و ناڵە و نرکەی ئەم شەوە پڕ لە گەرد و لوولەی ئەهاتە گوێ و ناچاری ئەکرد لە کەمترین و بچووکترینی ئەوانە گوێ بگرێت.

جاروبار دەنگی گڕ و بێفەڕی مەلە دەلیاییەکان ئەهات و ئەم قاووقیژە مێردەکەی ئەهێنایە بەرچاوی کە لە گەمیەکەیدا دانیشتووە و لەناو شەپۆلانی سامناکدا بەرز و نزم ئەبێتەوە، (ژانی) سەری خۆی نابوو بە سەرینی منداڵەکانییەوە و کەوتبووە پەرۆش و پەژارەیەکی قوڵەوە..

لە دڵی خۆیا ئەیگوت: ئای ژیان بە هەژاری و دەستەنگی چەند سەختە، دەستەویەخە بوون لەگەڵ بێپارەیی و نەبوونیا چەند گرانە؟

ئێمە بەم هەموو ڕەنجدان و مەینەتکێشانەوە، تەنیا نانی جۆمان دەس ئەکەوێت خێزانەکەمان هەموو پێخاوسن، بە درێژایی عومریان ئەبێ سەبر بگرن، ڕەنج بدەن، مل لە ملی هەژاری بنێن، بۆچی؟ ئاخر بۆچی؟ لەبەرچی؟

بۆران توندتر ئەبوو، دەلیا ئەیلرفاند، شەپۆلەکان وەك کێو ئەدران بە قەراخا، پرش و بڵاو ئەبوونەوە، لەناو هەور و مژی دەریادا، جاروبار ئەستێرەیەك کوتوپڕ ئەدرەوشایەوە، وەك پزیسکێك لە کورەی ئاسنگەردا لەناو دوکەڵدا بریقە بداتەوە و لەناوبچێ، ئەم ئەستێرەش خێرا گوم ئەبوو.

شەوگار شەق بووبوو، بێگومان لەو کاتەدا بەختەوەران، دەوڵەمەندە پارەدارەکان، بە خۆشی و شادی خەریکی ڕابواردن و خواردنەوە و سەما و هەڵپەڕکێ بوون، بەڵام لەم ساتەدا ماسیگر لە چ حاڵێکا بوو؟

ئەو بەدبەختە، بێچارە، ڕەنگ هەڵبزڕکاوە، پاڵتاوە چەرمینەکەی بە شانیا دابوو، لە تاریکایی تەم و مژاوی دوا بزاوی شەودا لە گەمیەکەیدا دانیشتبوو چاوەڕوانی چارەنووسی ئەکرد..

پەیتاپەیتا بەرەو پێش ئەڕۆیشت، بەڵام نیشانەیەك لە قەراخ نەبوو، ژانی، ژنە چارەڕەش و چاوەڕوانەکەی تارمایی سامناك و دزێو و بەترسی یەك لە دوای یەك ئەهاتە بەرچاو، دڵی بە پەرۆش و پەژارە تەنگ و گیرابوو، چاوی فرمێسکی هەڵئەوەراند و بە ناچاری و بە لێوەلەرزە پەیتاپەیتا ئەیگوت: خوایە! چەندە ماسیگر لە بنکی دەلیادا خەوتوون، ئەوانە هەموویان لە شەوێکی وەك ئەم شەوەدا ڕۆیشتوون و نەگەڕاونەتەوە.

* * *

ژانی فانۆسی هەڵگرت: بە بیریا هات وەختی ئەوە هاتووە بچێ بە پێشوازیی مێردەکەیەوە. لە دڵی خۆیا ئەیگوت: ئەبێ دەلیا هێشتا ئارام نەبووبێتەوە؟ بەشکم هەوا ڕون بووە و باران لە توند و تیژی کەوتووە، با بڕۆم بزانم بورجی چاوەدێری ڕووناك بووە؟ لە زنجەکە هاتە دەر، بۆ بەیانی زۆری مابوو.. مژێکی توند سەرانسەری ئۆقیانوسی داپۆشیبوو، دەلیا هەر وەك پێشوو بەڵکو توندتر ئەیلرفاند و بارانیش دایکردبوو..

ژانی بە زەحمەت وەك کوێر بە پەلەکوتە ئەڕۆیشتە پێشەوە، کوتوپڕ توشی زنجێکی تاریك هات، ئەم زنجە تەواو لە تاریکاییدا نوقم بووبوو، نە چرایەکی تیا ئەسوتا و نە ڕۆشناییەکی لێوە ئەبینرا، با بە توندی لە بانە پڕ لە کون و کاژێرەکەی ئەدا و گڤەگڤی ئەهات و نزیك بوو بە جارێ زنجەکە لە بن هەڵکەنێت.

ژانی پشوویەك وەستاو بیری کردەوە: ئەمە زنجی دراوسێ نەخۆشەکەمانە، ژنە چارەڕەشەکەی لە شەوێکی وادا و لەم تەنگانەیەدا تەنیایە. با بچم بزانم پێویستییەکیان نییە؟ بە ڕاستی خەم و دەردی ژیان و بەدبەختی بە جارێك ئەوی لەبیر بردوومەتەوە.

دوێنێ مێردەکەم ئەیگوت زۆر تەنگانەیەتی ئەبێ هەر بیبینم.. ژانی توند لە دەرگای دا، دەنگ نەبوو، لە دڵی خۆیا ئەیگوت: زگم پێی ئەسوتێ! هەژارە.. ئەو لە ئێمە هەژارترە، منداڵەکانی باوکیان نییە و بێکەسن، دیارە ئەوانیش وەك خۆمان هیچیان نییە بیخۆن! هەر هەژارانن دڵیان بۆ حاڵی یەکتر ئەسوتێ، ژانی لە دەرگای ئەدا و بانگی ئەکرد، بەڵکو کەسێك گوێی لە دەنگی بێت و دەرگاکەی لێ بکاتەوە، بەڵام دەنگی لەناو گرمە و گڤەی باو بۆراندا گوم ئەبوو، وەڵامێك نەئەگەیشت، لە ناکاو لەبەر توند کوتانی ئەو دەرگاکە کرایەوە، ژانی چووە ژوورەوە، زنجە تاریکەکەی بە ڕۆشنایی فانۆسە کزەکەی خۆی ڕووناك کرد، بەڵام هەوەڵ هەنگاو لە ترسا لە جێی خۆی وشك بوو، لە قوژبنێکا ژنە دراوسێکە بێ چرکە کەوتبوو، قاچی نوشتابووەوە و دەمی داچەقابوو، گیانە بەدبەخت و ڕەنجاوەکەی، ئەوی بەجێ هێشتبوو، لە هەموو ژیان پاش عەمرێك بەربەرەکانیی هەژاری و دەستەنگی تەنیا ئەم لەشە سارد و سڕەی لێ بەجێ مابوو، لە تەنیشت ئەم لەشە سارد و سڕەوە، دوو منداڵەکەی خەوێکی خۆش و شیرینیان لێ کەوتبوو، دایکەکە وەختی خەوتن سەرپۆشە شڕەکەی خۆی پیا دابوون، تا سەرمایان نەبێ..

لە پاش تاوێك ژانی لەوێ هاتە دەرەوە، دەستی ئەلەرزی و بەتانییەکی پێچابووەوە و بە زەحمەت هەڵیگرتبوو..

بۆچی وا دڵەتەپەی پێکەوتبوو؟ بۆچی لنگی ئەلەرزێ؟ بۆچی لە ترسانا ئەیڕوانییە دەوروبەری خۆی؟ کە گەیشتە ماڵەوە تەم وردە وردە لە قەراخ دەلیا ئەڕەوییەوە.. ژانی بە پەشۆکاوی و ڕەنگ بزڕکاوی لەسەر کورسییەك لە تەنیشت جێگەوبانەکەوە دانیشتبوو، هێشتا چاوەڕێی مێردەکەی بوو، دیسان پەرۆشی و پەژارەیی هورووژمی هێنابووە سەری ئەوەندەی نەمابوو لە خەفەتا دڵی بتەقێ، لەژێر لێوەوە ورتەورتی بوو، بەخۆی ئەگوت:

ئەم کارە چی بوو من کردم! مەگەر مێردەکەم دەرد و خەمی کەم بوو؟ ئەو بۆ بەخێوکردنی خۆم و پێنج منداڵەکەم لە مەینەتایە، ئێستا ئەمانەشی لێ زیاد بوو، ئای خوایە.. ئەڵێی مێردەکەم هاتەوە، نەء خاترجەم داڵغە لێ ئەدەم، وا دیارە هیچ کەس نییە، ڕۆژگارێکی ڕەشە، ئێمە خۆمان هیچمان نییە بیخۆین، کارێکی باشم نەکرد، بەڵام ئەی چیم بکردایە؟ بێگومان مێردەکەم لێم ئەدا، خۆم ئەزانم شایانی لێدانم، ئەڵێی هاتەوە! نەء دەنگی بایە! خوایە من چەند گەوجم، بە درێژایی شەو چاوەڕێی بووم کەچی ئێستا لە هاتنەوەی ئەترسم! ژانی، دڵتەنگ و ماندوو، سەری کردبووە سەر دەستی و خەوێکی ئاڵۆزی لێکەوتبوو.

* * *

ئیتر لرفەی دەلیا وناڵەی با نەئەبیسرا، لە پڕێکا دەستێکی قورس و قایم دەرگای زنجەکەی کردەوە، ڕووناکیی کەم ڕەنگی

بەیانی لە لابەلای دەرگاکەوە دایە ناو زنجەکە و لەگەڵ ئەم ڕووناکییە کابرای ماسیگریش هاتە ژوورەوە بانگی کرد: هاتمەوە!..

ژانی ڕاپەڕی و بە دڵخۆشی هەستا و دەمی نا بە پاڵتاوە زبر و خوساوەکەیەوە و ماچی کرد. مێردەکەشی ئەوی گرتە باوەش و ئەیڕوانییە چاوەکانی. ژانی بە هەناسەبڕکەوە گوتی: خۆشەویستەکەم ئاخرەکەی هاتیتەوە! خۆ بێوەی و ساغی؟ نێچیرێکت نەچیرێکت دەسکەوتووە؟

ماسیگر گوتی: نێچیر نەبوو! سەوڵەکەم لەدەست دەرچوو! تۆڕەکە دڕا! زۆری نەمابوو تیابچم، چارە چییە؟ ئێستە پێم بڵی بزانم منداڵەکان ساغن! هەوایەکی چەند ناخۆشە! وەخت بوو نوقم بم! چەند جار کەوتمە گەرووی مەرگەوە! ئەی تۆ پاش من خەریکی چی بووی؟

ژانی گوتی: چاوەڕێی تۆ بووم، تۆزێ درومانم کرد، وەخت بوو لە ترسا بمرم، زۆر پەرۆشی تۆ بووم، بە درێژایی شەو دەلیا ئەیلرفاند، منداڵەکان چاکن، تۆ ئەزانی شتێکی زۆر خراپ ڕوویداوە؟ من دەمەو بەیان چوومە لای دراوسێکەمان، چارەڕەشە دوێ شەو مردووە! منداڵەکانی تەنیا و بێسەرپەرشت ماون. ژانی هەژار کە ئەم قسانەی ئەکرد لە بەر شپرزەیی و پەشێوی ڕەنگی بزڕکابوو. نەیئەتوانی قسەکانی بە ڕێکوپێکی بکات، لە لێدان ئەترسا، وەك کارێکی خراپی کردبێت. دیسان گوتی:

منداڵەکان زۆر وردن، کچە گەورەکەی تازە پێی هەڵگرتووە!

ماسیگر تاوێك بیری کردەوە و لە پاشان گوتی: قوڕبەسەرانە چەند خراپیان لێ قەوماوە! بێگومان ئەفەوتێن! کێ بەخێویان ئەکات؟ خەڵکی ئەم دێیە هەموویان هەژارن! پتریان هیچیان نییە خۆیان بیخۆن. من زۆر حەز ئەکەم ڕایان بگرم، بەڵام خۆمان پێنج منداڵمان هەیە.. چی بکەین؟!

ماسیگر بە خەم و خەفەتەوە کڵاوە خوساوەکەی فڕێدایە قوژبنێك و لەژێر لێوەوە گوتی:

نەء! بیرکردنەوەی ناوێ! ئێمە پێنج منداڵمان هەیە! ئەوانیش دوانن.. باشە ئەبنە حەوت، ناتوانین وازیان لێبێنین ئەم منداڵانە وەك توتکە سەگ بمرن خۆ ئێمە ئینسانین! ئەمجار دەنگی هەڵبڕی و گوتی:

ژانی! ڕاکە بچۆ بیانهێنە! بێگومان زۆر ئەترسن! دایکیان لە سەرەمەرگا لای وابووە ئێمە نایەڵین تەنیا بن. من ڕایان ئەگرم! بەڵکو خوا سەبارەت بەوان نەچێری باشمان بداتێ! گەورە ئەبن و یارمەتیمان ئەدەن، ژانی کە لای جێگە و بانەکەوە هەڵتروشکابوو، وە فرمێسکی شادی لە چاوی هەڵئەوەری، بەتانییەکەی لەسەر لادان و گوتی: منداڵەکان دەمێکە لێرەن!..

*سەرچاوە: گۆڤاری "هیوا"، بەغدا، ژ 2و 3، ساڵ 3، کانونی یەکەمی 1959، ل 87-94.



# 2. دەستەی نوێنەرایەتی هەمیشەیی*

نووسینی: چودۆمیر

ناوی ڕاستەقینەی خاوەنی ئەم چیرۆکە (دیمیتر چۆرباجی بێسکی)یە (چودۆمێر)ی کردووە بە نازناوی خۆی، ساڵی 1880 لە گوندی (تووربیا) لە نزیک شاری (کازانلیك) لەدایکبووە. تا تەمەنی چل ساڵان مامۆستای وێنەکێشان بووە، کوتووپڕ لە ساڵەکانی سیی ئەم سەدەیەدا ڕووی کردووەتە ئەدەبیات. قانوونێکی چەوت و چەوێڵی ئەو سەردەمە کە دەیگوت (نابێ ژن و مێرد هەردووکیان مامۆستا بن) چارەنووسی ئەوی گۆڕی. چۆدۆمیر قوتابخانەی بەجێهێشت و بۆ بەڕێوەچوونی ژیان ناچار بوو ڕێگایەکی تر بگرێتە بەر. گەلێ جار خۆی دەیگوت: "هەوڵدان بۆ نان منی بۆ ئەم لایە ڕاکێشا". دیارە ئەمە گاڵتە بوو دەیکرد، چونکە ئەو لە زووەوە خەریکی کاری ئەدەبی بوو.

چۆدۆمیر لە ژیانی خەڵکەکە زۆر شارەزایە. قارەمانەکانی چیرۆکەکانی ئەو ئینسانی عادەتی و خەڵکی کۆڵان و بازاڕن. گاڵتە و گەپی ئەو لە شان سووك و بە تامە، کەس نارەنجێنێ و کەس تووڕە ناکا. چودۆمێر لەگەڵ خوێنەری چیرۆکەکانی، بە کار و کردەوەی قارەمانەکانی خۆی پێدەکەنێ.

چودۆمیر گەلێ کورتە چیرۆکی نووسیوە. ئەم نووسەرە بۆلگارییایییە ڕۆژی 26ی کانوونی یەکەمی ساڵی 1967 کۆچی دوایی کردووە.

*حەسەنی قزڵجی*

* * *

لەگەڵ براکەم بە جادەدا دەڕۆیشتین. هەرکامێکمان بیری بەلای کاروباری خۆیەوە بوو. لە ناکاو زرم.. یەکێ خۆی لە ورگم کوتا. کابرا وەستا. وەکو گوێدرێژێك بڕوانێتە ناڵبەندی خۆی، نەختێ لە من ڕاما. پاشان پشووی هاتەوە بەر خۆی. من گوتم:

-ببوورە.

کابرا پێکەنی. ددانە زێڕەکانی لەبەر خۆرەتاو وەکو قاوغە فیشەکی ڕاوکەر دەدرەوشانەوە.

-چی ببوورم؟ نامناسیتەوە؟

ناسیمەوە.

-ئاهای.. دیچکۆ! ئەوە خۆتی؟ پایزە برا، چەندە قەڵەو بووی!

-خۆمم! ئەی تۆ چۆنی؟ ڕوویکرد بە لای براکەمەوە و پرسی:

-ئەم.. ئەم.. ئاغایە.. لە ڕاستیدا کێ بێ؟

(دیچکۆ پاپۆنچێڤ)ی دۆستم نەختێ زمانی دەگیرا. لە هەر جێگایەك گیری دەخوارد بە (لە ڕاستیدا) -کە گەلێ وەخت وەڵامەکەشی دەجاوی- بۆشایی قسەکەی پڕدەکردەوە.

گوتم:

-برامە.. برا گەورەمە.. لە دێ کار دەکا. وەرزێرە.

دیچکۆ لە خۆشیاندا وەك گوڵ گەشایەوە.

-لە کاتێکی باشدا ئێوەم دەس کەوت. وەرە با بچینە ئەو چاخانەیە شتێك بخۆینەوە.

دەستی گرتم و گوتی:

-دەی، دەی ها، ل.. ل.. لە ڕاستیدا چاوەڕوانی چیی؟

دیچکۆ قۆڵی خۆم و براکەمی گرت و بردینیە چایخانەکە. دانیشتین. لە منی پرسی:

-باشە، ئێستا بڵێ بزانم چۆنی؟ چ دەکەی؟

-ئێی.. ئەوا ماوین. ئیشکەری دەوڵەت بووم. دەریان کردم.

-کەی؟ لـ.. لـ.. لە ڕاستیدا بۆچی؟ چیت کردبوو وا دەریان کردی؟

-چوزانم.. دەریانکردم ئیتر. گوتیان تۆمان پێویست نییە.

-باشە، تۆ.. تۆ.. لە ڕاستیدا بۆچی نەهاتیتە لای من؟ بۆچی بە منت نەگوت تا بە تاقە سەعاتێك کارەکەت بۆ جێبەجێ بکەم؟ تۆ لـ.. لـ.. لە ڕاستیدا نازانی ئێستا من چ کارەم؟

–چوزانم، دیچکۆ! لە کوێ دەزانم؟

سپاردی یەکی بیرەیەکمان بۆ بێنن. حیکایەتی کاری خۆیی بۆ کردم سپاردی یەکی بیرەیەکی دیکەشمان بۆ بێنن. پاشان دەستەسڕی دەرهێنا و ئارەقی تەوێڵی سڕی.

–گوێت لێبێ. لە بارەی کارەوە خاترجەم بە، من وەکو ئاو خواردنەوە کاری تۆ جێبەجێ دەکەم. تۆ لـ.. لـ.. لە ڕاستیدا وابزانە کارەکە جێبەجێ بووە. ئێستا دەبێ تۆ کۆمەك بکەی و ئیشەکان جێبەجێ ببێ. من و براکەم ڕوانیمانە یەکتر.. دیچکۆ گوتی:

–ئێستا پێت دەڵێم کام کار. لە شاری ئێمە، شاری من نییە. لەو جێگایەی قەرار وایە پایز ببمە نوێنەر، دەیانەوێ ڕێگەی ئاسن ڕابکێشن لەسەر ئێسگەیەك لە نێوان دوو دێدا کێشەیە. لە نێوان شگۆڤۆییەکان و کۆکۆڤییەکاندا، شگۆڤۆ سەنگەری منە.. لـ.. لـ.. لە ڕاستیدا من بەڵێنم داوە کەوا کارەکەیان جێبەجێ بکەم. ئەمان دەیانەوێ ئێسگەکە لەوێ دروست بکرێ. هەق و حیسابی خۆیشیان تا دوا فلس داوە. ئێستا ئەمڕۆ دەس بە کار دەکەم.. لـ.. لـ.. لە ڕاستیدا دەمەوێ بچمە لای وەزیر، بەڵام لام وایە یەك دوو کەسم لەگەڵ بێ خراپ نییە. ئەوا دەمەوێ دەستەیەکی نوێنەرایەتی دروست کەم. باش بوو چاوم بە ئێوە کەوت. براکەت پان و پۆڕ و چوارشانەیە و سمێڵیشی هەیە. کوێخای شگۆڤۆ بێت و تۆیش سەرۆکی مامۆستاکان. دەچینە لای وەزیر. من قسە دەکەم و ئێوەش سەر دەلەقێنن. هەرکاتێ گوتم بەڵێ، ئێوەش دەڵێن بەڵێ، هەرکاتێکیش گوتم نا، ئێوەیش لـ.. لـ.. لە ڕاستیدا دەڵێن نا. کار لەمە ئاسانتر نابێ. ئا ئەمەم لە ئێوە دەوێ.

گوتم:

–ئێمە چۆن ببینە دەمڕاست و سەروەسیەتی خەڵك! ئەم کارە بە کاری چەتوون دەزانم. ئێمە خەڵکی (کارابوونار)ین و (شگۆڤۆ) وا لە باکوور. ئێستا کاکم ببێتە کوێخا و من ببمە مامۆستا؟ نا، نا، دیچکۆ ئەم کارە کاری ئێمە نییە. مەترسیی تیایە. ئەگەر ئێمە ئەو گوندەمان دیبوایە ئەگەر ڕێگامان تێکەوتبووایە، دیسان شتێك بوو. بەڵام.. قسەکەی پێ بڕیم:

–گرنگ نییە.. هەر بۆ ڕواڵەتی کارە. کەس ئێوە ناخوا.

گوتم:

–ناتوانم. ویژدانم ڕێگام نادا ئەم کارە بکەم.

دیچکۆ لە دین دەرچوو:

–کابرایەکی زۆر سەیری.. بەم ویژدانەشەوە دەتەوێ کاری دەوڵەت بکەی! هەر لەبەر ئەمەیە لـ.. لـ.. لە ڕاستیدا دەریان کردووی.. هەستە. هەستە، ماتڵم مەکە. بە یەك دوو سەعات کارەکە تەواو دەکەین. ئێوە بە خێر و من بە سەلامەت. هەقی ماندووبوونەکەشتان دەدەم.

–وا نابێ دیچکۆ! من دیپلۆمم نییە. قوتابخانەم تەواو نەکردووە. هەروا لە خوت و خۆڕایی مامۆستا؟

–هیچ نییە. پاشان تێدەگەی چەندە سادە و ئاسانە. ئەگەر دەتەوێ یارمەتی من بدەی، ئەگەر دەتەوێ تا ئێوارە پێنج سەد (قۆشە)ت دەستکەوێ بشتگێڕمەوە سەر کارەکەت.. هەستە بکەوە ڕێ. لـ.. لـ.. لە ڕاستیدا درەنگە. وەختەکەمان دەڕوا.

من و براکەم ڕوانیمانە یەکتر. ئەو بناگوێی چەپی خوراند و من بناگوێی ڕاستم و کەوتینە ڕێ.

سواری تاکسییەك بووین. ڕاست ڕۆشتین تا لەبەردەرگای وەزارەتخانەدا دابەزین. هەرسێکمان چووینە ژوورەوە. من وەکو بیی ناو ئاو دەلەرزیم. خەڵکێکی زۆری لێبوو. دەرزیت هەڵاوێشتایە نەدەکەوتە زەوی. دیچکۆ دەستی منی گرتبوو. منیش دەستی کاکم. ئەو پێشمان کەوت و دەستی کرد بە ڕێگا کردنەوە. دیچکۆ دڕی بە خەڵکەکە دەدا و دەیگوت "ڕێگای دەستەی نوێنەرایەتی بدەن.. دڕدەن ڕێگای دەستەی نوێنەرایەتی بکەنەوە". ئاخرەکەی گەیشتینە بەردەرگای هۆدەی ئاغای وەزیر. دیچکۆ لە دەرگای داو پاڵی پێوە این بۆ ناو هۆدەکە. خۆیشی لە دوای ئێمەوە هاتە ژوورەوە. وەزیر کە چاوی بە دیچکۆ کەوت لە جێی خۆی ڕاستەوە بوو و بزەیەك کەوتە سەرلێوی و هەر لە دوورەوە بانگی کرد:

–ئێی.. پاپۆنچێڤ! بەخێرهاتی.. سەد ساڵت بە ئەم ساڵانە.

دیچکۆ سەری دانەواند و گوتی: مێرسی.. مێرسی جەنابی وەزیر. پاشان ئێمەی پیشان دا و گوتی:



–دەیانناسێنم.. لـ.. لـ. لە ڕاستیدا کوێخای شکۆڤۆ و ئاغای سەرۆکی مامۆستاکان. پیاوی خۆمانن، خوێندەوار، بە ئەمەگ، بەڕێز. تەواوی گوندەکەیان لـ.. لـ.. لە ڕاستیدا وەکو ئەنگووسەویلە لە دەستدایە. بۆ مەسەلەی ئەو ئێسگەیە هاتوون. نوێنەری خەڵکی شگۆڤۆن.

لەم کاتەدا دیچکۆ دەستی کرد بە قسەی قەڵەمی کردن:

–وەکو ئاگاتان لێیە چەند ئەندازیار بۆ ڕاگەیشتن بە کارەکە چوونە (کۆکۆڤ)ی خواروو. لەوێ خواردوویانە و خواردوویانەتەوە. تەنانەت بەرتیلیشیان وەرگرتووە. پاشان بەڵێنیان داوە گوایە ئێسگەکە لە کۆکۆڤ دروست دەکەن کە لـ.. لـ.. لە ڕاستیدا پێچەوانەی قانوونە. مەسەلەکە وەکو تەماشای دەفەرمووی زۆر گرنگە.

دیچکۆ دیسان هەوای دەمی خۆی گۆڕی:

–خەڵکی کۆکۆڤ پتریان لە دژی ئێمەن. بەڵام شگۆڤۆییەکان لە ڕاستیدا تەنانەت مریشك و کەڵەشێریشیان هیی خۆمانن. بەم پێیە وەکو تەماشا دەفەرمووی مەسەلەکە دەبێ بە جۆرێك چارە بکرێ، ئەگینا ئێمە لە پشتیوانی کۆمەڵێك خەڵکی باش و بە شەرەف بەشبڕاو دەبین.

وەزیر گەڵێ خۆمانە گوتی:

–ها، ئا بەم جۆرە.. بەڵام لە ڕاپۆرت وا دەردەکەوێ کە لە شگۆڤۆ هەورازێکی ئەوەندە لێژ هەیە ئەگەر کەریشی پێدا بڕوا خلار دەبێتەوە. چۆن دەگونجێ لەوێ ئێسگە دروست بکرێ.

–لـ.. لـ.. لە ڕاستیدا بەو جۆرەیە کە دەفەرمووی. ناڵێم وا نییە، بەڵام ئێمە ئەو جێگایە تەخت دەکەین. ئێمە خۆمان ئەم کارە دەکەین، ئەم کارە ئێمە خۆمان دەیکەین.

منیش گوتم:

–بەڵێ ئەم کارە خۆمان دەیکەین.

کاکیشم گوتی:

–بەڵێ ئەم کارە خۆمان دەیکەین.

پاشان دیچکۆ قۆڵی وەزیری گرت بردیە گۆشەیەکی هۆدەکە و دەستی کرد بە چپەکردن لەگەڵی. ئەوسا هەردووکیان پێکەنین. وەزیر دەستێکی دا لە شانی دیچکۆ. دیچکۆش دەستێکی دا لە شانی وەزیر و خوا حافیزیان لە یەکتر کرد. لە وەزارەتخانەکە هاتینە دەرەوە ئۆتومبیل چاوەڕوانمان بوو.

من پرسیم:

–ئێستا ئیتر بۆ کوێ؟

دیچکۆ گوتی:

–دەچینە لای وەزیری ئاوەدانی و سەکناندن. پاشان لای وەزیری زانیاری و هونەر. لەوێیشەوە سەرێك لە وەزیری بازرگانی دەدەین. بڕیاریان داوە وەزارەتخانەکەیان خاوێن کەنەوە. دەچین بە ناوی گەل پشتیوانییان لێ دەکەین. لـ.. لـ.. لە ڕاستیدا کارێکی گرنگ نییە.

گوتم:

–گوێت لێ بێ دیچکۆ. ئێستا کە هەوساری خۆمان داوەتە دەست تۆ، بۆ هەرکوێیەکمان دەبەیت بمانبە. بەڵام من نایەمە لای وەزیری بازرگانی. لەو وەزارەتخانەیە من دەناسن. باش نییە، ئابڕووم دەچێ. من هەموو ڕۆژێ لەوێم.

دیچکۆ گرژ بوو:

–تۆ لـ.. لـ.. لە ڕاستیدا پیاوێکی سەیری! ڕۆژی دوو سەد کەس دەچنە لای وەزیر. ئێستا بە تاقی تەنیا تۆ دەناسێتەوە؟!

چووینە لای هەموو وەزیرەکان. کوڕنشمان برد. لە خاکدا گەوزاین. لە کاتی پێویستدا گوتمان: بەڵێ. لە کاتی پێویستدا گوتمان: نا. چووینە لای وەزیری بازرگانیش. تا لە لای وەزیر وێستابووم وەکو بیی ناو ئاو دەلەرزیم. بەڵام بە خێر گەڕاو نەیناسیمەوە. شەو پاپۆنچێڤ بردینیە ڕیستۆران، نانی داینێ، عەرەقی داینێ، یەکی پاکەتێ سیگاری گەلاشی بۆ کڕین. پاشان لە جیاتیی پێنج سەد قۆشە، یەکی سەد قۆشەی نایە مشتمان و گوتی: خواحافیزتان بێ.

بەیانی چوومە لای تا کارەکەم بۆ جێبەجێ بکا. هەر کە دیمی یەخەی گرتم و بە ناوی دەستەی نوێنەرایەتی بردمییە شارەوانی. لەوێشەوە ناردمییە گومرگ تا چەند بەستە شتومەك ڕزگار کەم. دوای چەند ڕۆژ دیسان کردمییە دەستەی نوێنەرایەتی و بردمیە ئەنجومەنی کلیسەکان. ڕۆژێکیش بە کەتان سەری پێچام و بردمی بۆ وەزارەتی ناوخۆ لە دژی حیزبی نەیار (موعارەزە) شکاتی پێ کردم..

پرسیم: باشە، ئێستا ئیتر چ دەکەی؟ وەڵامی دامەوە:

–تۆ لەسەر کاری خۆت دەمێنیتەوە.. لـ.. لـ.. لە ڕاستیدا دەستەی نوێنەرایەتیی هەمیشە لە لایەن باکووری بوڵگاریاوە.

بە کورتی، ئێستا پاپۆنچێڤ بووەتە نوێنەری منیش بە دەوریدا هەڵدەخولێم. هەرکاتێ پێویست بێ بە ناوی دەستەی نوێنەرایەتی لەم دائیرەوە دەمباتە ئەو دائیرە. لە جێیەك بە ناوی کوێخا دەمناسێنێت و لە جێیەکیش بە ناوی ئەندامی پایەبەرزی دائیرەی خەرج و باج. لە جێیەك یارمەتیدەری پزیشکم و لە جێیەك دەفتەردار. خراپ نییە. شتێکی لێ پەیدا دەبێ. ڕازیم. ئەوانی تریش منیان ناسیوە. مەبەستم نوێنەرەکانی دیکەیە. ئەوانیش کەڵکم لێوەردەگرن. لەم ماوەیەدا بوومەتە هەرچییەکی دەتەوێ. تەنیا نەبوومەتە قەشە. وا بزانم دەبمە ئەویش. دەزانم دیچکۆ ڕۆژێك بە ناوی قەشەش کەڵکم لێوەردەگرێ. لەبەرئەوە هەر لە ئێستاوە ڕیشم بەرداوەتەوە، با بۆ ڕۆژی خۆی درێژ بێ.

*سەرچاوە: ڕۆژنامەی پاشکۆی "عیراق"، بەغدا، ژ 12 و 13، شوبات و ئاداری 1978دا.

# 3. پەنجەرەیەك بەرەو رۆژئاوا*

نووسینی: عەزیز نەسین

دەبێ بۆ تۆش ڕێکەوتبێ لە ئاهەنگێکی ڕەسمی یا کۆبوونەوەیەکی هەڵبژاردندا گوێت لە وتار و ئاخاوتنی یەکێ لە گەورە و مەزنەکان بووبێ؟! هێندێ لەمانە ئەوەندە باش دەدوێن کە ئینسان سەری سوڕدەمێنێ و، بەغیلی بە هێز و توانای ئاخاوتنیان دەبا، بەڵام ئەگەر تۆش سەرت لە تەقەڵ و تەریب دەرچێ، لەم جۆرە کاتانەدا زۆر زوو تێدەگەی کە ئاخێوەر و وتاردەر ئەم قسە نەرم و شل و جوان و پڕ کاکڵ و مانایانە لە خۆیەوە ناڵێ، وتار و ئاخاوتنەی ئەو لە پێشدا چەند کەس بە وردی ئامادەیان کردووە، چەند جاریش ڕێکوپێك کراوە و، ئاخێوەر دوای چەند حەوتو حەول دان و زمان ڕاهێنان، وشە بە وشە لەبەری کردووە. ئەگەر ئاوا نەبوایە ئاخاوتنەکانی ئەوان شتێکی بێمانای لێ دەردەچوو. لەبەرئەمەیە کە ئەمڕۆژانەش زۆربەی سیاسەتگێڕ و سەرلەقێنەکان لە سەفەرەکان و سەردانەکانی خۆیاندا یەك دوو کەسی خوێندەوار و زانا لەگەڵ خۆیان دەبەن.. سەرەڕای ئەمەش جاری وا هەیە شتی خەفەتاوی و گەپچاڕ لەم ئاهەنگانەدا ڕوودەدا. بیست ساڵ لەمەوپێش، هەوەڵین جار ئەم چارەڕەشییە تووشی خۆم هات. لەو ڕۆژەوە تا ئێستا خۆم بە هاوبەش لە تاوانی کوژرانی ئاخێوەرێکی بەستەزماندا دەزانم کە ئاخاوتنەکەی ئەوم ئامادە کردبوو. ئەوسا ئێمە لە شاری بچووکی (تاشرا) دەژیاین، من شاگردی قوتابخانەی ناوەنجی بووم و بەهرەی نووسەرایەتیم هەبوو. سەروتارەکانی ڕۆژنامە بچووکەکەی شارەکەمانم دەنووسی. لە جێگای بچووك خەڵك خێرا یەکتر دەناسن و هەمووان لەماڵی یەکتر ئاگادارن. منیش خێرا بە ناوی نووسەری باش لە هەموو جێگایەك ناسرام. دەچوومە هەر کوێیەك تاریفی قەڵەم و لێزانی منیان دەکرد. لەوکاتەدا کێشانی ڕێگەی ئاسن بە خێرایی بەرەو پێش دەچوو، بەم زوانە ڕێگەی ئاسن دەگەیشتە شارەکەی ئێمەش.. لەبەرئەمە تەواوی خەڵك، ژن و پیاو، ورد و درشت، باسی ئەم کارە بە کەڵکەی دەوڵەتیان دەکرد. منیش لەم بارەیەوە سەروتارێکی قایمم نووسی کە دەنگێکی عەجایبی داوە و، هەمووان بە ئافەرینەوە دەیانڕوانییە من. ڕۆژێك سەرۆکی ئەنجومەنی شار کە پیاوێکی سەنگین و مەند و لەسەرخۆ بوو، نزیکەی شەست ساڵ لە تەمەنی ڕادەبرد، منی بانگ کردە دایرەکەی خۆی. ڕاستەکەی ئەوەیە من لەم بانگکردنە سەرم سوڕما، هیچ بۆنە و پێوەندییەك لە نێوان من و ئەودا نەبوو، ئاغای سەرۆکی ئەنجومەنی شار لاوانی وەکو ئێمەی بە ئینسان نەدەژمارد! بەڵام بەهەر جۆر بە دەنگییەوە چووم.. کاتێ چوومە هۆدەکەی ئاغای سەرۆك، لەو ڕێزە زۆرەی لە منی گرت و لە تەنیشت خۆیەوە داینام پتر سەرم سوڕما و پەشێو بووم. ئاخرەکەی سەری قسەی دامەزراند و دەرکەوت من دەبێ ئاخاوتنێك کە قەرار وایە ئەوان لە ئاهەنگی گەیشتنی هەوەڵین قەتار بۆ شارەکەمان بیفەرموون ئامادەکەم. ئاغای سەرۆك هەڕەشەی لێکردم لەم بارەیەوە لای هیچ کەس قسە نەدرکێنم. بەڵێنیشی دامێ ڕێگام بۆ ناو کۆڕی گەورەکان بکاتەوە و هۆی پێگەیشتن و پێشکەوتنم ڕێکخا..

–"زۆر باشە، کوێر لە خوا چی دەخوازێ؟ دوو چاوی ساغ" بۆ منیش دەرفەت لەمە باشتر هەڵنەدەکەوت، بەڵام لەگەڵ کەموتاڵایی و سەردەرنەکردن لە ڕێوشوێنی پێویست و باو، ئەم کارە بۆ من کە تا ئەو ڕۆژە لە شارەکەی خۆمان دەرنەکەوتبووم و تەنانەت بچمی قەتاریشم نەدیبوو، لە ڕادەبەدەر قورس و گران بوو. بەهەر مەینەتێك بوو وتارێکی جوان و بە تینی وام ئامادەکرد کە شایانی ئاغای سەرۆکی ئەنجومەنی شاربێ.

ئەو ڕۆژەی هەوەڵ قەتار دەگەیشتە شارەکەمان جێژنێکی گەورەیان گرت، تەواوی خەڵکی شاریان لە مەیدانی وێستگە کۆکردەوە تا ئەم ماشینە گەورەیەی هۆی پێشکەوتنی ئەم سەنعەت و بازرگانیە لە نزیکەوە ببینن. من ئەم ئاهەنگەم لە هەمووان پێ خۆشتر بوو، ڕۆژ وەپەلە کەوتبووم تا وتارەکەی خۆم لە دەمی ئاغاوە ببیستم. لە پێشدا (حاکم) و سەرۆکی شارەوانی، هەرکامێکیان وتارێکی کورتی گوت. پاشان نۆرەی ئاغای سەرۆکی ئەنجومەن هات، بە سەنگین و ڕاشکاوییەکی تایبەتییەوە چووە پشت (تریبۆن)ەکە و زۆر بە ڕێکوپێکی و بزاوتنی سەرودەستەوە، نوسراوەکەی منی کە لەبەرکردبوو خوێندەوە: "هاونیشتمانەکان! ئەمڕۆ بە گەیشتنی هەوەڵ قەتار بۆ شارەکەمان پەنجەرەیەك بەرەو

ڕۆژاوا دەکرێتەوە. من باش دەزانم کە ئێوە چەندە ئارەزووی کردنەوەی ئەم ڕێگەیەتان هەیە! هەقتانە، ئەم جێژن و شادییە گەورەیە و ئەم سۆز و تامەزرۆییەی ئێوە خۆڕایی نییە. کرانەوەی ئەم ڕێگەیە دارایی و ڕێز و ماقووڵی بۆ ئێوە پێکدێنێ. دەبێ قەدری ئەم گەنجینە خواداوە بزانن، ئەگەر ئەم ڕێگەیەی کراوەتەوە باش بپارێزن و چاوەدێری بکەن بەم زووانە دەبنە خاوەنی هەموو شتێك. دیارە کردنەوەی ئەم ڕێگایە زۆر دژوار بوو، بەڵام ئێستا ئەوا لە سایەی خواوە و، بە یارمەتی پیاوانی ئازا و دلێر ئەم کارە کراوە! لە بیرتان نەچێ ئەم ڕێگەیە بۆ سوودی گشتییە و هەمووان دەبێ



کەڵکی لێوەرگرن. نابێ کەمتەرخەمی بکەن و خراپی کەن. بە تایبەتی لە کاتی سواربوون و دابەزیندا وریابن پیس و چەپەڵی نەکەن. هیوادارم بەم زووانە هەمووتان لەم ڕێگەیەوە سەفەر بکەن تا بزانن چەندە خۆشە و چ لەزەتێکی هەیە". دەنگی چەپڵە لێدان و دەربڕینی شادی و خۆشی خەڵکەکە، کە بە پەلە چاوەڕوانی گەیشتنی قەتاربوون، وتاری ئاغای سەرۆکی بڕی و ڕایانکرد بۆ لای واگۆنەکان. مانگێك دوای ئەوە دایرەی ڕێگەی ئاسن بۆئەوەی خەڵك هان بدا بۆ ئەوەی بە قەتار سەفەر بکەن و کاڵا و شتومەکی خۆیان بێنن و بەرن، کارێکی شایانی سەرنجی کرد. خەرجی زەماوەندی یەکێ لە پاڵەوانە خۆشەویستەکانی وڵاتی داو، بووك و زاوای بۆ ڕابواردنی هەنگوینە مانگ، بە قەتار ناردە شارەکەی ئێمە. بووکەکە بە ڕاستی جوان بوو. زاواش کە یەکێك لە پاڵەوانەکانی مست وەشێن بوو لەو نەدەمایەوە. ئەو بووك و زاوایە کە بەیانی خۆش و بەختەوەرییان بۆ خەڵکی شارەکە هێنابوو، زۆر بە ڕێزەوە برانە هۆڵە گەورەکەی وێستگەکە. وەکو باوە، داوا لە سەرۆکی ئەنجومەنی شار کرا کە لە وتارێکی کورتدا بە خێرهاتنیان بکا. ئاغای سەرۆك داوای لێبوردنی کرد، بەڵام خەڵکەکە وا تێگەیشتن لەبەرئەوە کە پیاوێکی بەڕێز و بە ئەدەبە وا دەڵێ، پتر شێلگیر بوون و ناچاریان کرد وتار بدا. ئاغای سەرۆك بە ناچاری قوبوڵی کرد. بەڵام لەبەرئەوە کە وتاری ئامادە کراوی نەبوو ئیشارەی بۆ لای بووك و زاوا کرد و وتارەکەی کرانەوەی ڕێگای ئاسنی کە لەبەر بوو، سەرلەنوێ دەستی پێکردەوە: "هاونیشتمانەکان! بە گەیشتنی قەتار بۆ شارەکەمان پەنجەرەیەك بەرەو ڕۆژاوا کراوە. من باش دەزانم ئێوە چەندە ئارەزووی کرانەوەی ئەم ڕێگەیەتان هەیە". قاقای پێکەنین لەملاو لەولاوە بەرز بووەوە، زاوا کە لە تووڕەییان سوورهەڵگەڕابوو، بە پەشێوی شانی هەڵدەتەکاند، ئاغای سەرۆك بێ ئەوەی سەرنجی وەزعی کۆڕەکە بدا ئیشارەی بۆ بووکەکە کرد و لەسەری ڕۆیشت:

"دەبێ بە قەدری ئەم گەنجینە خواداوە بزانن، ئەگەر ئەم ڕێگەیەی کە کراوەتەوە باش بیپارێزن و چاوەدێری بکەن بەم زووانە ئەبنە خاوەنی هەموو شتێك.

دیارە، کردنەوەی ئەم ڕێگایە زۆر دژوار بوو، بەڵام ئێستا ئەوا لە سایەی خواوە و بە یارمەتی پیاوانی ئازاد و دلێر ئەم کارە کراوە. لە بیرتان نەچێ ئەم ڕێگایە بۆ سوودی گشتیە و هەمووان دەبێ کەڵکی لێوەرگرن!".

پاشان ئیشارەی بۆ زاوا کرد:

"بە تایبەتی کاتی سواربوون و دابەزین وریا بن پیس و چەپەڵ نەبێ!".

دەنگی پێکەنین و ڕەخنەی خەڵکەکە لە هەموو لایەکەوە بەرزبۆوە، مستێکی قورس و قایم کە زاوا لە دەمی ئاغای سەرۆکی ئەنجومەنی دا، جگە لەوە کە پەکی وتارەکەی ئەوی خست، هەناسەشی لەو پرەمێردە بێچارەیە بڕی. من هەر بەو قەتارە ڕامکرد بۆ ئەستەمبوڵ، لێرە بیستم کە لە پرسە و سەرەخۆشیی ئەو ڕەحمەتیەدا، هێندێکیان بە شوێن مندا گەڕاون تا وتارێکی گەرم و گوڕ بۆ ڕێزگرتن لە ڕەحمەتییەکە ئامادەکەم.

*سەرچاوە: ڕۆژنامەی پاشکۆی "عیراق"، ژ 25، مارت و نیسانی 1979دا.

# 4. خۆکوشتن*

**نووسینی: ئەنتۆن چیخۆف**

**کەسەکان:**

**ئیڤان ئیڤانۆڤیچ تۆلکا خۆڤ: گەورەی ماڵ**

**ئەلکسی ئەلکسیمۆ ڤیچ موراشکین: دۆستی ئەو**

کارەساتەکە لە پێترسبوورگ، لە ماڵی موراشکین، ڕوودەدا.

(هۆدەی کاری موراشکین موبیلەی نەرم و ڕەحەتی لێ دانراوە، موراشکین لە پشت مێزی نووسینەوە دانیشتووە. تۆلکاخۆف دێتە ژوورەوە. لالەیەکی بلووری چرا، دوو چەرخەیەکی مندالان، سێ قوتوو کلاو، پریاسکەیەکی گەورە کە لە کلاوێکەوە پێچراوە، چەند بتڵ بیرە و چەند پریاسکەی بچووکیش بە دەستەوەیە، بە شپرزەیی و سەرلێشێواوی دەڕوانێتە ئەملاو ئەولا. لەسەر کورسییەکی نەرم و ڕەحەت لێی دەکەوێ).

**موراشکین:**

ئیڤان ئیڤانۆڤیچ حاڵتان چۆنە؟ حەزم کرد چاوم پێتان کەوت. چۆنە وا ڕێتان کەوتووەتە ئێرە؟

**تۆلکاخۆڤ** (بە هەناسەبڕکەوە).

دۆستی خۆشەویست و میهرەبانم! هاتووم شتێکت لێ داوا بکەم.. تکا دەکەم.. پیاوەتیم لەگەڵ بکەن.

دەمانچەیەکم بە خواستنەوە بدەرێ تا بەیانی!

**تۆلکاخۆڤ:**

دەمانچەت بۆچییە؟

**موراشکین:**

کارم پێیەتی.. ئاخ! باوەگیان، چۆڕی ئاوم بدەرێ.. خێراکە ئاوم بدەرێ!.. دەمانچەم پێ دەوێ.. ئەمشەو دەبێ بە لێرەوارێکی تاریکدا بڕۆم.. بەشکم کارەساتێك.. تکا دەکەم دەمانچەیەکم بە خواستنەوە بدەرێ.



**موراشكین:**

ئیڤانۆڤیچ! بۆچی درۆ دەكەی؟ كارت بە لێرەوار چییە؟ وا بزانم نیازێكی شوومت هەیە. لە ڕەنگ و ڕووت وا دەردەكەوێ نەخشەیەكت كێشاوە. چ قەوماوە؟ خۆ نەخۆش نیت؟

**تۆلكاخۆڤ:**

تاوێك مۆڵەتم بدە! وازم لێ بێنە پشووم بێتەوە بەرخۆم. ئاخ! دایە گیان، چەندە شەكەتم! وەزعێكی سەیرم بەسەرهاتووە. دەڵێی لە ناوەوە هەڵم دەكرزێنن. ئیتر لە وزەمدا نییە. وەرە پیاوەتی و دۆستایەتیم لەگەڵ بكە. لەوە زیاتر هیچم لێ مەپرسە. زۆری لەسەر مەڕۆ و ئەوەندەی لێ مەكۆڵەرەوە!

**موراشكین:**

ئیڤانۆڤیچ! بە ڕاستی بۆچی وا پەشۆكاوی؟ بۆچی ئەوەندە ترسنۆكی؟ گەورەی ماڵ، پیاوی دەوڵەت، لەسەر كاری گرنگ.. عەیبە. شوورەییە!

**تۆلكاخۆڤ:**

من گەورەی ماڵ نیم! دیل و داماوم! كەری باركێشان و كۆیلەی قولەڕەشم. كۆیلەم. كابرایەكی بێچارەم. بە هیوای ئەمە دەروویەك بكرێتەوە، ڕزگاربوونی خۆم لەم زنجیری دیلی و كۆیلەیی و، نەجات بوونم لەم دنیایە هەموو ڕۆژێ وەدوا دەخەم. من بێكارە و شێت و گەوجم. بۆچی دەژیم؟ ژیانی من كەڵكی چییە؟ (كوتوپڕ ڕادەچڵەكێ) باشە، پێم بڵی ژیانی من بۆچی چاكە؟ مەبەست لەم هەموو دەرد و مەینەتی بەدەنی و ڕەنج و ئازاری ڕۆحییە چییە؟ من زۆرم پێ خۆشە گیانی خۆم لە پێناوی ئامانجێكی بەرز و مەزن بەخت كەم! بەڵێ، ئامادەم، بەڵام بە هیچ جۆرێ حەزناكەم لە ڕێگەی شتی بێ نرخی وەكو: دامانی ژنەكەم، لالەی چرای ماڵەكەم، لە ڕێی —وەكو دەزانی– شتی تری هیچ و پووچ و بێكەڵكدا خۆم بفەوتێنم. نا! من ئامادەم خوێڕی و ترسنۆك بم، بەڵام كاری گەوجانە وەكو ئەمە نەكەم. نا! نا! بەسە! ئەوەندە ڕەنجەی كێشاومە بەسە!

**موراشكین:**

مەنەڕێنە! دراوسێكان گوێیان لە دەنگت دەبێ!

**تۆلكاخۆڤ:**

وازبێنە با دراوسێكانی تۆش گوێیان لە دەنگم بێ. فەرقی چییە بۆ من؟ ئەگەر تۆ دەمانچەم نەدەیەی، لە یەكێكی تر دەخوازمەوە، ئاخرەكەی ئەم ژیانە مەینەتبار و پڕ لە ئازارەی خۆم دەبڕێنمەوە. من ئیتر بە یەكجاری بڕیاری ئەم كارەم داوە و لێبوومەتەوە.

**موراشكین:**

ئارام بگرە! سەبرتر قسە بكە! من هێشتا تێنەگەیشتووم ژیانی تۆ چ كەموكورتییەكی هەیە؟

**تۆلكاخۆڤ:**

چ كەموكورتییەكی هەیە! زۆر باشە! ئێستا ژیانی خۆم كە لە ژیانی سەگ خراپترە، بۆ تۆ باس دەكەم. بەشكم گرێی دڵم بكرێتەوە. با دانیشین! جا ئێستا گوێت لێ بێ! ئاخ! دایەگیان! هەناسەم دەرنایە! بۆ نموونە وەزعی ئەمڕۆكەم سەرنج بدە. تەماشای وەزعی ئەمڕۆكەم بكە! خۆتان دەزانن من دەبێ لە سەعات دەی بەیانییەوە تا چواری پاش نیوەڕۆ لە خەزانەداریی گشتی قەڵەم ڕادەم سەتی بە پوولێك. هەوای دایرەكە ئەوەندە گەرمە وەختە پیاو بخنكێ. مێشیش ناهێڵێ پیاو هەدا بدات. دەڵێی جەهەننەمە ئەوەندە بێ سەرەوبەرە و ئاڵۆزە. سەرۆكی دایرەكەمان چۆتە حەسانەوە. (خراپۆف) یاریدەدەریشی خەریكە ژن دێنێ و زەماوەند دەكا، نایەتە دایرە. كاربەدەستە بچووكەكان لە وەختی كاری دایرەدا دەردەكەون، بە جادەكانی شارا دەخولێنەوە دوای كچۆڵان دەكەون. هەموویان ئەوەندە خەواڵوو، شەكەت و شپرێون، تاقە وتەیەكی دروستیان لە دەم دەرنایەت. كابرایەك كارەكانی سەرۆكی دایرە دەكا كە گوێچكەی كەڕە و ئاشقیش بووە. هەموویان سەریان لێشێواوە. تووڕە و جاڕزن بەملاو ئەولادا ڕادەكەن. قوولە و هەرایەكی سەیرە، پیاو گوێی لە قسەی خۆشی نابێ. هۆدەكان پڕن لە دووكەڵ. كارەكەی منیش لە وزە بەدەرە و پیاو پێوەی دەمرێ. هەمیشە دەبێ تاقە كارێك بكەم، هەمیشە كارێك.. دەبێ یا ئەو نامانەی ئەوانی تر نووسیویانە دروست و ڕێكوپێك بكەم، یا وەڵامی ئەو نامانە بنووسم كە گەیشتوون. دیسان نامەڕاست كەمەوە و وەڵامی نامە بنووسمەوە.. كاری من وەكو شەپۆلی دەریا یەك چەشنە. چاوی پیاو دەردێ. نەختێ ئاوم بدەرێ! ماندو و مردو لە دایرە دەردەكەوم. ئارەزوومە نانەكەم زەقنەمووت كەم و بخەوم، بەڵام بۆچی بۆم دەكرێ؟ كوتووپڕ بیرم دەكەوێتەوە ماڵم لە دەرەوەی شارە، یانی نۆكەر و كۆیلەی ئەم و ئەوم. تەنیا پلە گۆشتێكی شل و ومل.. شل و شەكەت تازە دەبێ بۆ جێبەجێكردنی ئەو كارانەی پێم سپێردراون بە ناو شاردا بگەڕێم. لەو گەڕەكەی كە ئێمە ماڵمان لێیەتی عادەتێكی باش هەیە. كاتێك پیاوێك دەچێتە شار، هەركامێك لە ژنە نەگبەتەكانی ئەوێ.. ئێستا پیاو ژنی خۆی قەیناكا، دەستەڵاتی هەیە، هەقی هەیە هێندێ وردە فەرمایشت بكا، (سۆنیا)ی بچكۆلەش جووتێ كەوشی دەوێ لەو نموونەیەی داویە پێم، نرخیشی نابێ لە بیست كەپێك زیاتر بێ.. سەبركە تا سیایی ئەو شتانەی كە ئەمڕۆ دەبێ بیانكڕم بۆت بخوێنمەوە! (سیاییەك لە گیرفان دەردێنێ و دەیخوێنێتەوە) لالەیەكی چرا، نیوكیلۆ گۆشتی بەراز، بایی پێنج كەپێك مێخەك و دارچینی، ڕۆن گەرچەك بۆ (میشا)، پێنج كیلۆشەكر، ئاسیدفنیك، بایی دە كەپێك تۆزی جانەوەر كوژ، بیست شووشە بیرە، سركە.. ئەم شتانەش دەبێ لە ماڵەوە بێنم بۆ شار: شەكردانی مس، خاچی خانم (شانسۆ) كە ژمارەی خانووەكەی هەشتا و دووە.. ئاخ! پاڵتۆی زستانی و

کاڵۆشی میشاش دەبێ بەرمە تا ئێرە ئەسپاردەی ژنەکەم بوو. دەبێ فەرمان دۆستان و دراوسێ خۆشەویستەکانیش جێبەجێ بکەم. مەرگیان بێ! سبەینێ ڕۆژی جێژنی لەدایکبوونی (ڤالۆدیا ڤلاسین)ە. دەبێ دوو چەرخەیەکی منداڵانە بکڕم. ژنی مێجەر (ڤیزۆخین) ئاوسە. دەبێ هەموو ڕۆژێ بچمە ماڵی مامان خەبەری ژنی مێجەری بۆ بەرم. پێنج سیایی درێژ و باڵابەرز لە گیرفانمدایە. دەستەسڕەکەم هەمووی گرێ دراوە. کاکی خۆم کە دایرە چۆڵ دەبێ، تا قەتار دەکەوێتە ڕێ وەکو سەگی دەرزی خواردوو دەهاژێم و بە ناو شاردا دەخولێمەوە و، هەمیشە لەعنەت لەم ژیانە دەکەم. لە دووکانی کوتاڵ فرۆشەوە بۆ دەرمانخانە، لە دەرمانخانەوە بۆ دووکانی بەرگدروو، لەلای بەرگدرووەوە بۆ دووکانی قەساب دەچم. دیسان دەگەڕێمەوە بۆ دەرمانخانە. لە جێیەك لاقم دەخلیسکێ و ڕەت دەبم. لە جێگایەکی دیکە پارەم لێ ون دەبێ. لە جێگایەکیش لە بیرم دەچێ بارەی ئەم شتومەکە بدەم کە کڕیومە، دووکاندار بە دوامدا ڕادەکا و لە ناوەڕاستی جادە دەیکاتە هەرا و هوریا. لە جێگایەکی تر پێی لە جلوبەرگی ئافرەتێك دەنێم.. ئاخ ئەوەندە ماندوو و شەکەت دەبم هەموو ئێسقانەکانم ژان دەکەن. شەو یا لەبەر ژان و ئێش خەوم لێ ناکەوێ، یا لە خەودا دێو و درنج و مێردزمە سوارم دەبن.. باشە! تەواوی ئەو کەلوپەلانە دەکڕم، بەڵام نازانم چۆنیان بپێچمەوە؟

بۆ نموونە: شەکردانی مسی قورس چۆن دەبێ لە تەنیشت لالەی چراوە دانرێ؟ یان ئاسیدفنیك و چای لەگەڵ یەك پێچرێنەوە؟ ئەم کارانە کاری حەزرەتی فیلن. هەموویان معەمما و مەتەڵن، پیاو گێژ و وڕ دەکەن. هەر فڕوفێڵێك بکەی و هەر کەڵەکێك لێدەی ئاخرەکەی لەم سەفەرە دوورەدا یەك دوویەك لەوانە دەشکێن یا ون دەبن. لە وێستگە و لە قەتاریشدا دەبێ ئەم شتومەکانە بە باوەشمەوە گرم و ڕاوەستێم. چەناگەم بنێمە سەریان تا هیچیان نەکەون. پریاسکەکان و قوتووە مقەباکان و خرت و پرتەکانی دیکەش هەموویان بە دەوری لەشما شۆڕدەبنەوە., قەتار دەکەوێتە ڕێ، ڕێبوارەکان بارگە و بنەی من فڕی دەدەنە ئەملاو ئەولا و دەڵێن: ئاغا بۆچی کەلوپەلەکەت کە بەم حاڵەوە لە قەتارەکە داتدەبەزێنین. منی چارەڕەشیش هیچم پێ ناکرێ. دۆش دادەبەم و بێدەنگ دەوێستم و، وەکو کەری بریندار لووت دادەژەنم. باشە ئێستا گوێت لە باقی بەسەرهاتەکە بێ! ئاخرەکەی بەهەر مەینەت و کولەمەرگییەك بێ خۆم دەگەیەنمە ماڵەوە. هەڵبەت ڕەوا دەبینی کە دوای جێبەجێکردنی ئەم کارە خێرانە پێویستم بە شەربەتێکی خۆش و خواردنێکی بەلەزەت هەیە، وانییە؟ بەڵام حەیف و داخ ئەم جۆرە شتە لە ئارادا نییە! ژنەکەم کە ماوەیەك چاوەڕوانی من بووە هێشتا من دەستم نەکردووە بە نانخواردن بەرۆکم دەگرێ، دوای ئەو هەموو ماندووییە دەبێ بیبەمە تیاتر یا کۆڕی دانس و سەما وە هیچ عوزر و بیانوویەکی بە گوێدا ناچێ. ئاخر من مێردم. لە قامووسی ژنیشدا مێرد بە مەعنای حەیوانێکی بەستەزمانە. لەبەرئەوەش کە کۆمەڵی پارێزگاریی حەیوانات لەسەری ناکاتەوە، گوێ ناداتە ئەو زوڵم و زۆرەی لێی دەکرێ، ئەوەندە حەزدەکا باری دەکا. کەوایە دەبێ بێ لامجوومی بچمە تیاترو، شانۆی (ڕیسوایی خێزانی) یا هەر شانۆیەکی بێتامی دیکە تەماشا بکەم. هەرکاتێ ژنەکەم فەرمانی دا دەبێ چەپڵە لێبدەم. ئیتر وردەوردە حاڵم خراپتر دەبێ و هەموو تاوێك مەرگی خۆم بە ئاوات دەخوازم. ئەگەر بچینە کۆڕی ڕەقس و سەما دەبێ هاوڕەقسێك، یا بە زاراوەی ئەمڕۆ (شوالیە)یەك، بۆ ژنەکەم پەیداکەم. ئەگەر کەس نەبوو لەگەڵی بڕەقسێ دەبێ خۆم لەگەڵی بڕەقسم. بەم جۆرە بەشێك لە شەو ڕادەبرێ، لە تیاتریا لە کۆڕی ڕەقس دەگەڕێینەوە ماڵەوە. ئیتر هێز و توانام تێدا نامێنی، وەکو پلەگۆشتێکی شل و ول و بێکەڵك لێی دەکەوم. ئاخری دوای چەند سەعات دەگەمە ئەو شتەی کە بە ئاواتییەوە بووم. جلەکانم دادەکەنم و لە جێگاکەمدا ڕادەکشێم. بە ڕاستی ئیتر وەزع زۆرباشە! ئیتر دەتوانم چاوم بنووقێنم و بخەوم.. هەموو شتێك جوان و گەرم و شاعیرانەیە. منداڵم نییە. لەودیوی دیوارەکەوە واقەواقی بێ، لە دەست ژنەکەم ڕزگار بووە. ویژدانم ئاسوودەیە. ئیتر چیم دەوێ.. چاوم دەچێتە خەو.. لە ناکاو وزەوز لە پەنا گوێم دەست پێدەکا!.. مێشوولە! (لە جێی ڕادەپەڕێ) مێشوولە! لەعنەتیان لێبێ! مێشوولە! (دەستی ڕادەوەشێنێ) مێشوولە! ئەمانە وەك تاعوون وان! لە جەزرەبە و ئازاری سەردەمی پشکنینی بیروڕا خراپترن! وزز.. وزز! دەنگیان ئەوەندە کزڵۆکەیە و بە جۆرێکی وا دەکڕووزێنەوە، دەڵێی دەپاڕێنەوە تا پیاو لێیان ببوورێ. بەڵام وا بە پیاوەوە دەدەن دەبێ سەعاتێك هەر خۆت بخورێنی. ناچار لە جێگاکەم هەڵدەستم، جگەرەیەك دادەگیرسێنم، مێشوولەکان لە خۆم دەردەکەم، سەرتاپای خۆم دادەپۆشم، بەڵام فایدەی نییە! ئاخرەکەی دەست لە کێش و مەکێش هەڵدەگرم و لەشم بۆ پێوەدانی مێشوولەکان بەرەڵڵا دەکەم. هێشتا لەشم بە پێوەدانی مێشوولەکان ڕانەهاتووە بەڵایەکی تازەم بۆ پەیدا دەبێ. ژنەکەم لە قاتی خوارەوە لەگەڵ هەڤاڵەکەی کە دەنگێکی ناخۆشی هەیە بە یەکەوە دەست دەکەن بە گۆرانی گوتنی دڵداری، بە ڕۆژ دەخەون و بە شەو خۆیان بۆ هاوبەشیکردن لە کۆنسێرتی ئاماتۆڕەکاندا ئامادە دەکەن. ئاخ! خودایە! دەنگە گڕەکەی ئەو کابرا زەبەللاح و چەمووشە، ڕەنج و ئازارێکە کە پێوەدانی هیچ مێشوولەیەکی سەرزەوی بە قەدرایی ئەوە ناخۆش نییە. (گۆرانی دەڵێ):

"بە من مەڵێ کە جوانیم تۆی چارەڕەش کردووە"

"لەبەرامبەر تۆدا وەکو جادوو لێکراو ڕاوێستاوم"

ئاخ! چ شیعرێکی گەوجانەیە! وەختە لە داخیان بمرم! دەستم بە گوێچکەوە دەگرم تا دەنگیان نەبیسم. ئەم وەزعە تا سەعات چوار

درێـژە دەکێشـێ. ئاخ! نـەختێ ئـاوم بـدەرێ.. ئـیتر نـاتوانم.. باشـە! دوای ئەوە کە بە درێـژایی شـەو نەخـەوتووم سـەعات شەشـی بـەیانی لە جێگاکەم ڕاست دەبمەوە و دەچم بۆ وێستگەی قەتار. بۆئەوەی لـە وەختی خۆیدا بگەمە قەتار، بە درێـژایی ڕێگا ڕادەکـەم. جادەکـە قوڕ و چڵپاوە. هـەوا سـاردە. تەمومـژ هـەموو جێگایـەکی داگرتـووە. کـە دەگەمـەوە شـار دیسـان سـەرلەنوێ دەسـت دەکەمـەوە بـەو وەزعـە لەعنەتییە. براله! ئەمە چ ژیانێکی تاڵ و نالەبارە! خودا ئەم ژیانـە بـە نسـیبی گـورگی کـەژ و کێـویش نـەکا! تێدەگـەی؟ ئـیتر نەخۆشـم. هەناسـەبڕکە و دڵەتەپـەم گرتـووە. هەمیشـە ترسـی شـتێکم لەدڵدایـە، خواردنم بۆ هەزم ناکرێ. سەرم لە گێژەوە دێ. بە تـەواوەتی خـەریکم شێت دەبم.. (دەڕوانێتە دەوروپشتی خۆی) بە ڕاستی لە ناو خۆمان دەرنەچێ دەمەوێ بچمە لای (چۆخۆنتی) یا (مژریڤسکی) حـەکیمی نەخۆشـی عـەقڵی: برالـە! دەڵێـی شـەیتان هاتووەتـە لەشمـەوە. کـاتی ڕەنج و ناهومێدی، کاتێ مێشوولەکان پێمەوە دەدەن، یا ئـەو ملهوڕە زەبەللاحە بەو دەنگە گڕەیەوە گۆرانی دەڵێ، بە جارێ تارمایی بـەری چاوم دەگرێ. لـە جێگـای خـۆم ڕادەپـەڕم و، وەکـو شێت بـە دەوری خانووەکـەدا ڕادەکـەم و دەنـەڕێنم: "مـن خـوێنم دەوێ! خـوێن!" ڕاستەکەشـی ئەوەیـە لـەو کاتـەدا ئـارەزوو دەکـەم کەسـێکم گیرکـەوێ چـەقۆیەك بکـەم بـە زگیـدا، یـا کورسـییەك هـەڵگرم و بیکێشـم بـە سەریدا. ژیان لە خانووی کوێستاندا ئەخرەکـەی دەگاتـە ئەمـە! هیچ کەس زگی پێم ناسووتێ. هەمووان لایان وایـە وەزع هـەر دەبـێ وابـێ کە هەیە. هەرکەسێ باسی ژیانی من دەبیسێ گاڵتەم پێدەکات و پێم پێدەکەنێ. ئاخر خۆ منیش شتێکی زیندووم و دەمەوێ بژیم. ژیـانی مـن تیتـاڵی و گـەپجار نییـە. دڵسـووتێن و تراژیدییـە. ئێـوە ئەگـەر دەمانچەم نادەنێ بە لانی کەمەوە هاودەردیم لەگەڵ بکەن!

**موراشکین:**

هاودەردی دەکەین

**تۆلکاخۆڤ:**

هـاودەردی ئێـوەم بـە بەرچـاوەوەیە. خواحـافیز. ئێسـتا دەبـێ لـە پێشـدا نـەختێ ماسـی و سۆسیسـۆن و.. تـۆزی ددان بکـڕم و پاشـان بڕۆم بۆ وێستگە.

**موراشکین:**

ماڵتان لە کوێیە؟

**تۆلکاخۆڤ:**

لە ڕۆخی چەمی (کاریۆن).

**موراشکین (بە شادییەوە):**

بـە ڕاسـتتە؟ کەواتـە دەبـێ (ئۆلگـا پاڤلۆڤنـاڤین) کـە مـاڵی لەوێیـە بیناسی!

**تۆلکاخۆڤ:**

دەیناسم تەنانەت هاتوچۆی ماڵیشمان دەکات.

**موراشکین:**

چـەند بـاش بـوو! چـەند چـاك و بەجێیـە! کەواتـە چـاکە و پیاوەتییەك بکە و..

**تۆلکاخۆڤ:**

چ بکەم؟

**موراشکین:**

دۆستی خۆشەویست! کارێکی بچووکم بۆ جێبەجێ بکە! بەڵام بەڵێنم بدەرێ کە ئەم کارەم هەر بۆ جێبەجێ دەکەی.

**تۆلکاخۆڤ: چ کارێکت بۆ بکەم؟**

موراشـکین: بـە ڕاسـتی بەجێبـەجێکردنی ئـەم کـارە پیاوەتیـەکی گـەورەم لەگـەڵ دەکـەی. براگیـان! تکـات لێ دەکـەم هـەوەڵ، سـڵاوی گـەرمی مـن بـە (ئۆلگاپاڤلۆڤنـا) بگەیەنـە. دووەم دەمـەوێ بـە تـۆدا بەسـتەیەکی بچـووکی بـۆ بنێـرم. داوای لـە مـن کـردووە ماشـێنێکی بەرگدروونی بۆ بکڕم، بەڵام کـەس نییـە بـۆی بـەرێ. براگیـان! تـۆ ئـەم کارەم بۆ بکە! لەگەڵ دەستی خۆت ئەم قەفەزە قەنارییەشـی بـۆ بـەرە، بەڵام وریابە دەرگاکەی نەشکێ.. بۆچی وا سوورهەڵگەڕاوی؟

تۆلکـاخۆڤ: چـەرخی خـەیاتی.. قەفـەزی قـەناری.. تـووتی.. بولبول..

موراشکین: ئیڤان ئیڤانۆڤیچ! ئەوە چییە؟ حاڵت تێکچووە؟ بۆچی سوورهەڵگەڕاوی؟

تۆلکـاخۆڤ (لەقـە لـە زەوی دەدا): چـەرخە خەیاتییەکـەم بـدەرێ! قەفـەزە قەنارییەکـە لـە کوێیـە؟ باشـە، ئێسـتا خۆشـت وەرە لەسـەر ئەوانە سواربە.. بمخۆ! لەتوپەتم کە! بمکوژە! (مستی ڕادەوەشێنێ) من خوێنم دەوێ، خوێن!

موراشکین: ئەوە شێت بووی؟

تۆلکاخۆڤ (لەقە لە زەوی دەدا): من خوێنم دەوێ.. خوێن!

موراشـکین (بـە تـرس و پەشـێوییەوە): ئـەوە شـێت بـووی؟ (هاواردەکا) پیتەر! مارییا! لە کوێن؟ فریام کەون!

تۆلکاخۆڤ (بە دەوری هۆدەکەدا ڕاوی دەنێ):

من خوێنم دەوێ.. خوێن!

(پەردە دادەدرێتەوە)

سەرچاوە: ڕۆژنامەی پاشکۆی "عێراق"، بەغدا، ژ 24، شوباتی 1979داح.

# لە بارەی هێندێ لە نهێنییەکانی ڕێزمانی کوردی*

مەسعود محەمەد

ماموٚستا مەسعود محەمەد ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری کورد و، دەمڕاستی لیژنەی زمان و زانستەکانی، کتێبێکی بە ناوی "چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی" بڵاوکردۆتەوە، لەم کتێبەدا گەلێ مەبەستی وردی هێناوەتە گۆڕێ. لە هێندێکیان بە درێژی دواوە، لە هێندێکیشیان بە دوودڵییەوە قسەی کردووە، بۆ هێندێکی دیکەشیان تەنیا ئیشارەتی کردووە. بە کورتی، دیارە ویستوویەتی ئەو مەبەستانە بخاتە پرس و ڕا و لێکۆڵینەوە، نەك هەروا ڕاستەوخۆ ڕای خۆی داسەپێنێ

ئەمەش ڕەوشت و کردەوەیەکی زۆر باش و پەسەندە.

لەم وتارەدا دەمەوێ لە چەند مەبەست، لە مەبەستەکانی ئەو کتێبە بدوێم و بنج و بناوانەکانیان پیشان بدەم. هیوادارم (کۆڕی زانیاری کورد) لە چاپەمەنی خۆیدا بیخاتە بەرچاوی لێزانان تا بە چەشنی پێویست باسیان لەسەر بکرێ و نەتیجەی دڵخواز دەسکەوێ، مەبەستەکان ئەمانەن:

-ناوگر.

-"ت" لە کۆتایی هێندێ فیعلدا.

-پاشگری (رە)، (وە)، (انێ).

-پاشگری (ك)، (ا).

-هاتنی (ڕاناوی لکاو) لە پێش فیعلەوە لە شێوەی کرمانجی سەروودا.

1-ناوگر

(بەهار)[1] لە باسی جیاوازی نێوان زمانی (پەهلەوی) و زمانی (دەرێ) کۆندا دەنووسێ: "هێندێ جار فیعلێکی تێنەپەڕیان بە هۆی هێنانی ئەلفێکەوە دەکردە تێپەڕ وەك لە "برگشت، برگاشت= یانێ گێڕانەوە"، لە "نشست، نشاست= یانێ دانیشاندن"، لە "کذشت، کذاشت و کذارد= یانێ تێپەڕاندن"دا و هی تریان دروست دەکرد"[2].

"هێندێ جاریش لە فیعلێك دوو تێپەڕ (متعدی)یان دروست دەکرد: یەکیان "عام" و یەکیان "خاص". وەك لە فیعلی "برگشتن" کە تێپەڕە عامەکەی "بر گردانیدن"ە. بۆ تێپەڕی "خاص"یش ئەلفێکیان لێ زیاد دەکرد و دەبووە "برگاشتن". ئەمەیان نەماوە"[3].

ماموٚستا مەسعود لە باسی ناوگردا باشی بۆ چووە. وەکو لەو قسانەی سەرەوە دەردەکەوێ ڕیشەی ئەم کارە زۆر کۆنە و ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ لای سەردەمی ساسانییەکان کە زمانی (دەرێ) زمانی دەرباری ئەوان بووە. لە زمانی کوردیشدا هێنانی ئەم ئەلفە لە هێندێ فیعلدا بووە و ئێستاش ماوە. بەڵام ئەمەمان لێ ڕوون نییە کە ئەم دوو زمانە، هێنانی ئەم ئەلفەیان لە زمانەکانی (پرثوی-شمالی و جنوبی) وەرگرتووە، یا لە زمانی کوردیدا لە ڕۆژگارانی زۆر کۆنەوە هەر بووە، یا لە زمانی (دەرێ)یەوە کەوتۆتە ناو زمانەکەمان. من خۆم لام وایە ئەم (ناوگرە) لە زمانی (دەرێ) وەرنەگیراوە و، لە ڕۆژگاری زۆر کۆنەوە لە زمانی کوردیدا هەبووە. چونکە ئەو فیعلانەی زمانەکەمان کە ئەم ناوگرەیان تێدایە خاوەنی شکڵی تایبەتی کوردیخۆیانن. بەهەر جۆر، هێنانی ئەم ئەلفە لە هێندێ فیعلی کوردیدا وەکو گوتمان ڕیشەیەکی مێژوویی کۆنی هەیە و وا دیارە گشتیتریشە لەوەی کە لە زمانی (دەرێ)دا بووە و کەم تا کورتێکیش ماوەتەوە. ئەوا لێرەدا چەند فیعل بە نموونە دەهێنینەوە وەك:

1-سۆن: سوم، سوت، سوی، سومان، سوتان، سویان. ئەلفێك هاتۆتە نێوان (س) و (و) بۆتە: ساوێن:

ساویم، ساویت، ساوی، ساویمان، ساویتان.

دەساوم، دەساوی، دەساوێ، دەساوین، دەساون.

(مەولەوی) دەڵێ: "بڵێسەم وەسای گەردوون سەر ساوا".

2-جۆن: جوم، جوت، جوی، جومان، جوتان، جویان. ئەلفێك هاتۆتە نێوان (ج) و (و) بۆتە: جاوین.

جاویم: جاویت، جاوی، جاویمان، جاویتان.

دەجاوم، دەجاوی، دەجاوین، دەجاون.

3-بووردن (بە مانای بەخشین و وازلێهێنان): بوردم، بوردی، بوردین، بوردن. ئەلفێك هاتۆتە نێوان (و) و (ر) بۆتە: بواردن:

بواردم، بواردت، بواردی، بواردمان، بواردتان، بواردیان.

دەبوێرم، دەبوێرێ، دەبوێرێ، دەبوێرین، دەبوێرن.

ئەم فیعلە پێشگری جۆربەجۆری پێش دەکەوێ و ماناکەی دەگۆڕێ.

(را) دەکەوێتە پێشی و ماناکەی دەبێتە وەخت و کات بەسەربردن:

رام بوارد، رات بوارد، رای بوارد.. تا دوایی.

پێشگری (هەڵ)ی دەکەوێتە پێش و مانای (استثناء) و جیاکردنەوە دەدات:

هەڵم بوارد، هەڵت بوارد، هەڵی بوارد.. تا دوایی.

(بوار) ناوی جێگایە، ئەسڵەکەی (بوارد) بووە، دالەکەی قرتاوە، یانی جێگای پەڕینەوە.

4–ئەنگۆتن (بە مانای پێکران، پێکیان، ئەنگێوران): ئەنگوتم، ئەنگوتی، ئەنگوت.. تا دوایی. ئەلفێك هاتۆتە نێوان (گ) و (و) بۆتە: ئەنگاوتن:

ئەنگاوتم، ئەنگاوتت، ئەنگاوتی، ئەنگاوتمان، ئەنگاوتیان، ئەنگاوتتان.

دەئەنگێوم، دەئەنگێوی، دەئەنگێوێ، دەئەنگێوین، دەئەنگێون.

ئەم فیعلە ئەگەر پێشگری (هەڵ)ی پێشکەوێ ئەلف زیاد ناکرێ.

(ئەنگێوە) صفتی فاعیلە، ئەو کەسەی باش دەپێکێ.

5–شردن– ئەلفێك هاتۆتە نێوان (ش) و (ر) بۆتە (شاردن)، پاشگری (وە)ی دواکەوتووە بۆتە (شاردنەوە):

شاردمەوە، شاردتەوە، شاردیەوە، شاردمانەوە، شاردیانەوە، شاردتانەوە.

دەشارمەوە، دەشاریەوە، دەشارێتەوە، دەشارینەوە، دەشارنەوە

لە هێندێ لەهجەدا ئەلفەکە دەبێتە (ی): دەشێرمەوە، دەشێریەوە.. تا دوایی.

(شارانەوە) مصدری (المبني للمجهول)ە: شارامەوە، شارایتەوە.. تا دوایی.

–(شرت) لە "شرت و گرم"دا لەم ڕیشەیەیە. ئەسڵەکەی (شرد– مصدری (مرخَّم)ە. دال بۆتە تێ.

بۆ نمونەی (شاردنەوە): مەولەوی دەڵێ: "تا فەلەك مەودای نەی تۆ شاردەوە".

6–پەستن– ئەسڵەکەی (پەستۆتن)ە. ئەلفێك هاتۆتە نێوان (ت) و (و) بووە بە پەستاوتن: پەستاوتم، پەستاوتت، پەستاوتی، پەستاوتمان، پەستاوتیان، پەستاوتتان.

دەپەستێوم، دەپەستێوی، دەپەستێوێ، دەپەستێوین، دەپەستێون.

لە پەستا: (بێپسانەوە). پەستاکردن (متراکم کردن). پەستاوتە (ادخار).

7–ژمردن (بە فارسی: شمردن. ئەوانیش هێندێ سیغەی لێ صرف دەکەن، بە تایبەتی لە مضارعدا). ئەلفێك هاتۆتە نێوان (م) و (ر) بۆتە ژماردن.

ژماردم، ژماردت، ژماردی، ژماردمان، ژماردتان، ژماردیان

دەژمێرم، دەژمێری، دەژمێرێ، دەژمێرین، دەژمێرن

ژمارە، ژماردە، ئەژمارە، ئەژماردە– هەموویان لەم ڕیشەیەن.

8–بژردن– ئەلفێك هاتۆتە نێوان (ژ) و (ر) بۆتە بژاردن:

بژاردم، بژاردت، بژاردی، بژاردمان، بژاردتان، بژاردیان

دەبژێرم، دەبژێرم، دەبژێرێ، دەبژێرین، دەبژێرن

–بژاردن، پێشگری (هەڵ)ی پێش دەکەوێ دەبێتە (هەڵبژاردن)بە مانای (انتخاب).

–ژماردن و بژاردن، پاشگری (وە) یان دوا دەکەوێ دەبنە (ژماردنەوە) و (بژاردنەوە) بە مانای (جبرانی خسارت). (بژار)یش لەم ڕیشەیەیە، ئەسڵەکەی (بژارد)ە، دالەکەی قرتاوە.

–مصدری (ژمردن) و (بژردن) بە بێ زیادکردنی ئەلف. وا بزانم لەکار کەتووە.

9–بزۆتن (بە مانای حەرەکەت): بزۆتم، بزۆتی، بزۆت.. تا دوایی. ئەلفێك دێتە نێوان (ز) و (و) دەبێتە بزاوتن:

بزاوتم، بزاوتت، بزاوتی، بزاوتمان، بزاوتتان، بزاوتیان

دەبزێوم، دەبزێوی، دەبزوێوێ، دەبزێون، دەبزێون

–بزێو – وەك (سەربزێو– دەست بزێو)، بزێوی– وەك (سەربزێوی– دەست بزێوی)، بزێوکە (بە هێندێ گۆرانی هەرزە دەڵێن– بن بزێوکە)، بزوێن (محرك)– هەموویان لەم ڕیشەیەن.

–بزوت (ئەو دارەی لە کوانودا نەختێکی سوتاوە) لەم ڕیشەیە نیە. ئەو ئەسڵەکەی (بسوت)ە، (س) بۆتە (ز).

10–نردن، یا نرتن– لە نردن وا بزانم تەنیا (نردۆ) ماوە. بە هێندێ نان دەڵێن کە دەیپێچنەوە و بۆ دەشتەوانی دەنێرن. یا کەسێك دەڕوا بۆ لایەك و لەگەڵ خۆی دەیبا: (نردۆیەك نان، دو نردو نان). بەڵام (المنبي للمجهول)ی ماوە: نراومەتە سەر کار، دەنرێمە سەر کار. مصدەرەکەی (نران)ە. لە (نرتن)یش کە دال بۆتە تێ وا بزانم تەنیا (نرت) ماوە کە لەگەڵ (نوێ) بەکارئەهێنرێ. وەك: "نرت و نوێ".

(نردن)– ئەلفێك هاتۆتە نێوان (ن) و (ر)– بۆتە ناردن:

ناردم، ناردت، ناردی، ناردمان، ناردتان، ناردیان

دەنێرم، دەنێری، دەنێرێ، دەنێرین، دەنێرن

–لە هێندێ لهجەدا فیعلی (ناردن) پێشگری (ئە)ی پێش دەکەوێ و (ئ) دەبێتە (ھ). پاشان ئاوای لێ دێ:

هەناردم، هەناردت، هەناردی.. تا دوایی.

11–قەڵشتن– ئەلفێك دێتە نێوان (ڵ) و (ش) دەبێتە قڵاشتن:

قڵاشتم، قڵاشتت، قڵاشتی، قڵاشتمان، قڵاشتتان، قڵاشتیان

دەقڵێشم، دەقڵێشی، دەقڵێشێ، دەقڵێشین، دەقڵێشن

12–نشت "هاتە جەم کانیکی ڕۆنشت و نانێ خوە خوەر.."– (کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری کوردی. پرۆفیسۆر کەناتی کوردۆ، لاپەڕە (96) ئەلفێك هاتۆتە نێوان (ن) و (ش) بۆتە ناشت:

ناشتم، ناشتت، ناشتی، ناشتمان، ناشتتان، ناشتیان

دەنێژم، دەنێژی، دەنێژێ، دەنێژین، دەنێژن

13–سپردن– ئەم فیعلە وەکو (بەهار) دەڵێ ئەسڵەکەی (آو سپردن)ە و (پر ثوی–پەهلەوی) خالصە. لە (آو– بەمانا لەسەر– علی) و (سپردن) دروست کراوە. فارسەکان کردوویانەتە (آسپردن). لە

کوردیدا ئەلفێك لە نێوان (پ) و (ڕ)دا زیاد کراوە بۆتە (ئەسپاردن). (سپاردن)یش دەگوترێ: ئەسپارم، ئەسپاردت، ئەسپاردی، ئەسپاردمان، ئەسپاردتان، ئەسپاردیان.

دەسپێرم، دەسپێری، دەسپێرێ، دەسپێرین، دەسپێرن

–(مبنی للمجهول)ەکەی (سپێران)ە: سپێرام، سپێرای، سپێرا.. تا دوایی.

–پێشگری (را)یان دەکەوێتە پێش و دەبنە (ڕسپاردن) و (ڕاسپێران). بە مانا (سفارش)ی فارسی یا (توصیە)ی عەرەبی: (رام سپارد)، ڕات سپارد.. تا دوایی. ڕاسپێرم، ڕاسپێری.. تا دوایی.

–جاری وا هەیە (پ) دەکەوێتە پێش (س) و دەبێتە (پەساردن). لەم کاتەدا تەنیا لەگەڵ (هەڵ) بە کاردێ و ماناکەشی دەگۆڕێ و دەبێتە دژی مانا پێشوەکەی:

هەڵم پەسارد، هەڵت پەسارد، هەڵی پەسارد.. تا دوایی.

14–خوەرن. (ئەوێ خوەرن تێر نەددا زاڕوا..)، "کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری کوردی، پرۆفیسۆر کوردۆ لاپەڕە 132" ئەسڵەکەی (خوردن) یا (خوەرتن)ە. بەشی هەوەڵ لەم وشەیە یانی (خوەر) بەهار دەڵێ زۆر کۆنە و لە ڕۆژگاری کۆندا تاقە پیتێك بووە، پاشان بە دوو پیت نووسراوە، شکڵی پەهلەوییەکەی (خو) بووە، وەکو: (خورد) و (خوەتای). دەشڵێ: چەند سەدەیە (تلفظ)ی ئەوە لەبیر چۆتەوە و تەنیا کوردەکان بە دروستی دەیڵێن.

لە خوەردندا، لە جیاتی سەر (فتحة)کە ئێمە بە (ە)ی دەنووسین، ئەلفێك خراوەتە نێوان (و) و (ر) بۆتە (خواردن): خواردم، خواردت، خواردی، خواردمان، خواردتان، خواردیان. لە (مضارع)دا کە (ر)ەکە دەقرتێ، ئەلفەکەشی لەگەڵ دەڕوا:

دەخۆم، دەخۆی، دەخوا، دەخۆین، دەخۆن

وا بزانم ئەوەندە نمونەیە، لەگەڵ بنج و بناوانە مێژوویەکەی، بەسە بۆ سەلماندنی بوونی (ناوگر) لە فیعلی کوردیدا.

بەڵام لە بارەی چەند وشە کە مامۆستا مەسعود وەکو نموونە بۆ بوونی (ناوگر) هێناونی ڕام لەسەر ڕای[4] ئەو نییە و وا لە هێندێکیان دەدوێم:

1–برێشکە. ئەم وشەیە وشەیەکی کۆنی پەهلەوییە. لە ئەسڵدا (وریژیتك)ە. فارسەکان کردوویانەتە (برشتە). لە کوردیدا (یت)ی لێ فڕی دراوە بۆتە (وریژك). (و) کراوە بە (ب)، (ژ)یش کراوە بە (ش) بۆتە (بریشك). هێیەکی وەدوا خراوە بۆتە (برێشکە).

صیغەیەك لەو ڕیشەیە لە نامیلکەیەکی پەهلەوی ئەشکانیدا بە ناوی (درخت آسوریك) هاتووە، کە لە بارەی کێشەی نێوان دارخورما و بزنە.

دار بە بزن دەڵێ:

"هیزم ام آتوران کی توسیچ بریژند" یانێ: دارم بۆ ئاگرەکانی تۆی پێ دەبرژێنن. ئەمەش دەتوانێ بەڵگە بێ بۆ ئەوە کە (ی) لە برێشکەدا لە ڕیشەی وشەکەیە و لەلاوە نەهاتووە.

2–برنج– (ر) لەم وشەیەدا لە ڕیشەی وشەکە دەژمێردرێ. ئەمیش هەر بەو شکڵە لە (درخت آسوریك)دا هاتووە. دار لە شانازی خۆیدا بە بزن دەڵێ: "گوازم هچ از کرند کی کوپند شی و برنج" یانێ دنگ لە من دروست دەکەن کە جۆ و برنج بکوتن.

3–ئاسەوار، لام وایە لە (آثار)ی عەرەبییەوە نەهاتووە. ئەم وشەیە ئەسڵەکەی (ئاستەوار)ە. کاتێ (ت) بە دوای (س)دا دێ، (ت) دەقرتێ و (س) قەڵەو دەکرێ وەکو: (ئێستە) کە دەکوترێ (ئیسە). ئەمیش لە (ئاستەوار)ەوە بۆتە (ئاسەوار) و پاشان (ئاسەوار). مەولەوی دەڵێ:

"ساقی ئاوەردە و گرد کیاسیتێنێن"

"وریا بەردێن و، کردە ئاستێنێن"

(ئاستێن) ئەو کەسەیە کە (مخلفات) و شوێنەوار لە دوای خۆی بە جێ دەهێڵێ. (ئاستە) مخلفات و شتی جێهێڵراوە. ئەم وشەیە وا بزانم زۆر جوانە لە جیاتی (تۆمار)ی قورس و لە زمان ناخۆش بە مانای (ابقاء وتثبیت وتسجیل) بەکاربهێنرێ، وەك بگوترێ "لە مێژوودا ئاستەکراوە" یا "گۆرانییەکی ئاستە کردووە".

4–خارشت، وشەیەکی فارسیە، ئەسڵەکەی (خارش)ە، اسمی مصدرە. فارسەکان خۆیان جاری وا هەیە (ت) لە دوای اسمی مصدرەوە دەهێنن، یان ئەم (ت)یە لە کوردیدا ڕەگەڵی خراوە. ئەم وشەیە و هی دیکەی لەم چەشنە لە کوردیدا ناتوانن ببنە بەڵگەی هیچ شتێك. لە کوردیدا لە جیاتی ئەم وشەیە دەڵێن (خورۆ). ئەگەر مەبەست نەخۆشی پێست بێ، بە پێی چەشنی نەخۆشییەکە ناوی هەیە وەك: بیرۆ، گەڕێ، گەڕۆڵی.

5–شەبەق، هەر شەبەقی بە مانای ئەسڵی خۆیەتی کە ڕوناکایی دانە وەك دەڵێن: "شەبەقی بەیانی" یا "شەبەقی داوە". کاتێ بە مانای (قەڵەشت) بەکاردەهێنرێ، مەبەست ئەوەیە کە ڕوناکایی لێوە دیارە. زەمانی زوو شتێکی کۆن کۆنیان دەچنی پێیان دەگوت: (مام شەبەقە). شەوەك، شەوەکێ، شەبەکە، لەگەڵ شەبەقە هەموویان لە ڕیشەیەکن.

6–ڕێژە لە (ڕێژان)ەوە هاتووە. مامۆستا خۆشی دەڵێ: "لە هێندێ لهجەی کوردیدا لە جیاتی (ڕشتن)، (ڕێشتن) دەڵێن". ئەمە وەکو (گێڕە) لە (گێڕان) و (کێشە) لە (کێشان) وایە.

–(بێژە)ش لە (پێژان)ە نەك لە (پژان). لە موکریان دەڵێن: "خشت پێژ"، "تەپاڵەپێژ". بەو کەسەش کە بە بەش نەك بە کرێ تەپاڵە دەپێژێ دەڵێن "لاپێژ".

7–ئاراو، ڕەنگە لە (ئارا) بە مانای ئەوە بێ لە گۆڕێدایە و (ئاو)ی تێکخرابێ و بوبێتە (ئارائاو) پاشان یەکێ لە ئەلفەکان قرتابێ.

8–کۆمەڵ– (کۆم) بە مانای کۆوەبوون و گردەوەبوونە، وەك دەڵێن: "ئەم پیاوە کۆم بۆتەوە" یانێ چەمیوەتەوە و گردەوە بوە، یان کۆمایەك خۆڵ، ئەوەندەی گردکراوەتەوە. لامەکەشی وەکو لامی گردەڵ، زەردەڵ، ڕۆشەڵ، گەندەڵ، ڕوتەڵ وایە. پاشگرێکە بۆ مانای (اتصاف و خاوەنداری) بەکاردەهێنرێ.

9–درویّنه، له (دروان)ەوه هاتووه. ئەلفەکەی بۆتە (ی) وەك: سوان و سوین، دران و درین، بران و برین. دروان بۆتە درویّن، پاشان (ە)ی کەوتۆتە دواوه و کردوویەتە اسمی مصدر یا صفتی مصدری و بۆتە (درویّنه).

10–لامێژ– له موکریان (لامژ) دەڵێن، له جیاتی (گوێرەمێژ)یش، (گوێرەمژ) دەڵێن. بەڵام لێرەدا هەق بە لای مامۆستادایه. (مژین) ئەلفی (ناوگر)ی لیّ زیاد کراوه بۆتە (مازین). پاشان ئەلفەکە بۆتە (ی) و (ماژ) بۆتە (مێژ). له ناوچوونی (ماژ) نابێتە هۆی ئەوه کە (مێژ)ی لێوەرنەگیرابیّ.

11–ڕەمانه، ڕەنگه له پێشگری (ڕە) و (میانه) تێکخرابیّ و پاشان (ی)ی میانه قرتابیّ.

(ڕە) پێشگرێکه له هێندیّ لهجەدا له پێش وشەوە دیّ و مانای (له) و (معیت) دەدا وەك: ڕەگەڵی کەوه، ڕەدو کەوتووه، ڕەسەر کەوت، ڕەبن کەوت..

یا له (ڕەمیا–نه)یه و (ی) قرتاوه، (ڕەمیا) یانیّ: هەڵاتوو، ڕۆییو جولاّو. مەولەوی دەڵیّ: "ڕەمیای بۆی باروت هەردە وە هەردە".

2–"ت" له کۆتایی هێندیّ فیعلدا:

"ت" له کۆتایی فیعلەکانی وەکو: "دەکات، دەچێت، دەخۆیت، دەکەیت، دەکەوێت"دا، وەك مامۆستا مەسعود دەڵیّ گومانی تێدا نییه که (ڕاناو) نییه. له پێش هەموو شتێکدا سەبارەت بەمە کە خەڵکێکی زۆر له کوردستان دەڵێن: "دەکا، دەچیّ، دەخۆی، دەکەی، دەکەویّ". شتی واش ناتوانریّ بگوتریّ کە ئەم هەموو خەڵکە بە هەڵە چوون. هەروەها ئەمەش ناتوانریّ بگوتریّ کە لە شێوە ئاخاوتنەکەی ئەواندا (ڕاناو) نییه.

ئەم دوو شێوه ئاخاوتنه هەردووکیان دروستن و تەنیا جیاوازی لەهجەییان له نێواندا هەیه. دەتوانین ئەوەش بە ڕاشکاوی بڵێین کە له لەهجەی دووەمیشدا له ڕۆژگارانی کۆندا "ت" هەبووه و بە هۆی (تطور)ەوه سواوه. چونکه قانونێکی گشتییه وشه بەرەو کورتبوون و سووکبوون دەڕوا نەك بەرەو درێژبوون و قورسبوون.

بۆ نموونه، (تطور)ی چەند وشه له ئەوێستائیەوه بۆ کوردی پیشان دەدەین:

| ئەوێستایی | پەهلەوی | کوردی |
|---|---|---|
| آئیویانگهنه | همیان | هەمانه |
| دروج | دروچ | درۆ |
| دخیو | دهیوك | دیّ |
| دسه | ده | ده |
| ماونگه | ماس | مانگ |
| تیگر | تیگ | تیخ |
| تیگری | تیر | تیژ |
| اینگه | آسن | ئاسن |

دەمێنێتەوه ئەوه کە بزانین بنج و بناوانی ئەم "ت"یه له کوێوەیه. "بەهار" دەڵیّ: "جۆرە (ت)ی یەك لە ئەوێستادا خاصی کۆتایی وشەکانه[5]". لێرەدا نموونەیەکی هێناوه و دەڵیّ چ جۆرە وشەییك.

بەڵام ئەگەر تەنیا له کۆتایی فیعلەکاندا هاتبیّ ئەوا بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستەکەی ئێمە بەسە. ئەگەر له کۆتایی هەموو وشەیەکدا هاتبیّ دیسان ئاشکرایه کە فیعلیش وەبەر دەکەویّ. ئەما وا دیارە زیاتر لە کۆتایی فیعلدا هاتبیّ. چونکه لەو هەشت وشەیەی ئەوێستائیدا ئەگەر (ە)ش بە (ت)ی سوك کراو بژمێرین تەنیا لە کۆتایی سیّ وشەیاندا هاتووه.

شتێکی دیکەش ئەمە پتەو دەکا. "بەهار" لە پەراوێزی لاپەڕە (30)دا دەڵیّ: (لە زمانی کۆنی دەرێدا لە دووەم کەسی کۆی (مضارع)دا کە دەبیّ "ید" بیّ، لە جیاتیان "یت"یان دەهێنا، لە جیاتی "کنید" و "روید" دیان گوت "کنیت" و "رویت".

بەهەر جۆر وا دیارە لە ئەوێستائی و پەهلەوی کۆندا، لە کۆتایی فیعلەکاندا دوای (ا) و (ی)، (ت) هاتووه. هەر ئەمەشە کە لە دوایی هێندیّ فیعلی کوردیدا وەك: "دەڕوات" و "دەچێت" ماوەتەوه. لە زمانی دەریّ کۆنیشدا ئەمە جاروبار بە گۆڕینی (د) بە (ت) ڕەچاوکراوه. بەڵام لە پەهلەویدا لەبەرئەوه کە "هیچ کاتیّ لە پێش (ن)ی مصدریەوه دال نەهاتووه[6] و هەمیشە (ت) بووه، (ت)ەکە خۆی هاتۆتەوه، وەك ئەم دوو نموونەیە لە (درخت آسوريك):

1–"بوژ او ام نپردت کواز هچ تو اور ترا ام پت وس گونك هیر".

یانیّ بزن دێتە سەرم، بە گژمدا دیّ کە من لە تۆ لە سەرەوەترم بە گەلیّ چەشنە شت.

–(نپردت) لە (نپردیتن)ەوه هاتووه، یانی بەگژداچوون.

2–"دت هم برت آویختند کذش آن گفته بوت درخت آسوريك".

یانی دوو هاوکێشە بە یەکدا هەڵبرژان کاتیّ (درخت آسوريك) ئەوەی گوتبوو.

–(بوت) لە (بوتن)ەوه هاتووه، یانیّ بوو.

3–پاشگری (ڕە)، (وە)، (انیّ).

1–پێشگری (ڕە) وەکو لە سەرەوە باسکرا بە مانای (لە)یە. هەروەکو دەبێتە پێشگر دەشبێتە پاشگر و لە دوای فیعلی (فەرمان–أمر)ەوه دیّ. لەم کاتەدا ماناکەی دەگۆڕیّ و بۆ (تەئکید)ە، وەك: بیلێرەوه، قەرزەکەم بدەرەوه، دەرگاکەم لیّ بکەرەوه، بیفرۆشەرەوه".

ئەم پێشگری (ڕە)یە، نە لە پەهلەویدا هەیە و، نە لە دەرێدا. لە پەهلەویدا (رای) هەیە بە مانای (بۆ). ئەمە لە ئەردەڵان ماوه و دەگوتریّ، لە دەرێشدا (را) هەیە کە نیشانەی (مفعول له –وه مفعولی بە واسطه)یە و بە دەگمەن بۆ (تەئکید)یش دیّ. (ڕە) وەکو پێشگر و پاشگر وا دیارە لە ڕۆژگاری گەلیّ کۆنەوه لە زمانی کوردیدا هەیە.

2–پاشگری (وە) لە فیعلەکانی وەك: بچۆرەوه، بلێرەوه، بمدەرەوه، بکەرەوه و هی دیکەدا بۆ چەندپاتە کردنەوەیە. ئەمە لە پەهلەویدا بە شکڵی (وا) هەیە و پێشگرە و (اداتی اعادەیە) وەك: (واگویە) و (واگیر)

و (وارسی). مانایەکی دیکەشی هەیە کە (اپاچ–باز)ە و (نفی معیت) دەگەیەنێ وەك: (مهر از ما وا مگیر). هێندێ جاریش لە جیاتی (وا)، (فا) هاتووە[7]. لە کوردیشدا (وە) دەبێتە پێشگر وەك: "وەکە، وەخۆ، وەنوسە". لە کرمانجی سەروشدا بە شکڵی (ڤە) هاتووە.

گوتمان (وە)ی پاشگر بۆ (اعادە) و دووپاتکردنەوەیە، لێرەدا پێویستە زۆر بە وردی سەرنج بدرێ. چونکە بە کابرایەك کەدەڵێی: "ئەو کتێبە بنووسەرەوە، یان، قەرزەکەم بدەرەوە، یان، ئەو گایەی کڕیوتە کە جوت ناکا بیفرۆشەرەوە". کابرا لەوە پێش کتێبەکەی نەنووسیوە، قەرزەکەی نەداوەتەوە و گاکەی نەفرۆشتووە و بە ڕواڵەت وا دیارە (اعادە) و دووپاتەکردنەوەیان تێدا نەبێ، وەك لە: بیلێرەوە و، بچۆرەوەدا هەیە. بەڵام کە لێی ورد دەبیەوە مەبەستەکە بەرفراوانە. ڕوی فەرمانەکە لە (اعادە) و دوپاتەکردنەوەی فیعلەکەیە، جا هەر ئەو کارا و (فاعل)ەو کردبێتی وەك لە: بیلێرەوە و بچۆرەوەدا، یا فیعلێکی تر وەك لە: بنووسەرەوە و بدەرەوە و بفرۆشەرەوەی نموونەکانی سەرەوەدا. تەنانەت بەرکار (مفعول)ەکانیش یەك بن وەك کتێب و وەرز و گا لە نموونە پیشان دراوەکاندا یان یەك نەبن وەك کەسێك بە کابرایەك دەڵێ: "ئەم کاوڕەم بۆ بکوژەرەوە". نە کابرا لەوەپێش ئەو کاوڕەی کوشتووە، نە کاوڕەکەش لەوەپێش کوژراوە. بەڵام فیعلی کوشتن لەوەپێش بە دەست فاعیلی تر لەمەڕ مفعولی تر کراوە.

–پاشگری (وە) لە فیعلی (بخۆرەوە)دا جگە لە مەبەستی (اعادە)، بۆ جیاوازی نێوان (اکل) و (شرب)ە.

3–پاشگری (انێ) کە لە هێندێ فیعلی وەك: "دەچەمەوانێ، دەچێتەوانێ" و هی دیکەدا کە لە سلێمانی و بانە و سەردەشت و مەریوان دەیڵێن، بنج و بناوانێکی تا ڕادەیەك دووری هەیە. "بەهار" دەنووسێ:

("کردتانی" و "کردمانی" و "کردشانی" صیغەی زۆر کۆنی زمانی دەرێن کە لە جیاتی هەوەڵ کەس و دووەم کەس و سێیەم کەسی کۆی ڕابردوو "جمع ماضی"[8] کە دەبوو "کردیمی"، "کردیتی" و "کردندی" بڵێن– "کردمانی" و "کردتانی" و "کردشانی" یان دەگوت). لە "دەچمەوانێ" و "دەچێتەوانێ"دا ئەمە پەیدا بووە. بەڵام فەرقیان تەنیا ئەوەیە لە کوردیدا پاشگری (وە) –کە لە فارسیدا نییە– کەوتۆتە نێوان (م) و (ت)وە و بۆتە: "دەچمە(ەو)انێ و "دەچێت(ەو)نێ".

لێرەدا پێویستە ئەوەش بڵێین تەنیا بوونی (انێ) لە دوو زمانی کوردی و دەرێدا ناتوانێ ببێتە بەڵگەی ئەوە کە زمانی کوردی لە زمانی دەرێ وەرگرتووە. بۆ ئیسپاتی ئەوە بەڵگەی پتەوتر پێویستە. شتی دیکەی وەك ئەمەش هەروایە. هەڵدەگرێ هەردوو زمانی کوردی و دەرێ، (انێ) و شتی دیکەی وەك ئەوەیان ڕاستەوخۆ لە زمانان و لە لەهجەکانی پێشووتر وەرگرتبێ. ڕونکردنەوەی ئەم جۆرە شتانە لێکۆڵینەوەی هەراوتر و قوڵتری دەوێ.

4–پاشگری (ك)، (ا):

مامۆستا مەسعود زۆر باشی بۆ چووە کە دەڵێ: "ك" پاشگرە. ئەم مەسەلەیە لە زمانە ئێرانییە کۆنەکاندا ڕیشەیەکی قوڵی هەیە. لە زمانی پەهلەویدا، لە کۆتایی هێندێ وشەی "مصغر و نا مصغر"دا کە ئەمڕۆ "هایەکی غەیرە ملفوظ" دەبینرێ کافێك لە نێوان کافی عەرەبی و فارسیدا هەبووە. وەك: "بندك"، "دستك" کە بۆتە: "بندە" و "دستە" و جاروبار ئەو کافە ماوەتەوە، وەك: "مردك" و "کۆدك[9]".

لە زمانی کوردیدا پاشگری (ك) هەیە، مەیدانیشی زۆر فراوانە و بۆ گەلێ مەبەست دێ:

1–بۆ (تصغیر) و بچوککردنەوە، وەك: دار– دارك (دارکەتۆتن).

لان– لانك (بێشکە). قۆڵ– قۆڵك. دڕ– دڕك. شۆڵ و تۆڵ– شوڵك و توڵك.

2–بۆ (عهد وتعریف) وەك: میوانەکەم بەڕێ کرد، شتەکەم دایە، ماڵی چووە خانووەکەوە.

3–بۆ (اتصاف و خاوەنایەتی) وەك: شل– شلك. تەڕ– تەڕك. ڕوخ– ڕوخەك. سەر– سەلك، سەرەك. بن– بنك. لاو– لاوك. ڕەو– ڕەوەك.

4–بۆ (ئالەت و هۆ) وەك: زەرد– زەرتك (هۆی زەردکردن) بە "گێنۆ" دەڵێن کە گیایەکە بەنی پێ ڕەنگ دەکەن. (کوت– کوتەك (هۆی کوتان).

5–بۆ میهرەبانی، وەك: ژن– ژنەکە. پیاو– پیاوەکە. کوڕ– کوڕەکە. کچ– کچەکە.

6–بۆ دیاریکردنی کات و زەمان، وەك: بەیان– بەیانەکێ. شەو– شەوەکی.

7–بۆ دیاریکردنی لاو "جهة" وەك: لا– لاوەکێ. ڕاست– ڕاستەکی. چەپ– چەپەکی.

8–بۆ دیاریکردنی "محل" و جێگا، وەك: ناو، نێو– ناوك، نێوك. خلیس– خلیسك.

9–بۆ دیاریکردنی "حاڵەت، وەك: بزر– بزڕك. دامرد– دامرك. ئالۆز– ئالۆزك، ئالۆسك. هەڵتروش– هەڵتروشك.

هی دیکە و بۆ مەبەستی دیکەش وەك: ملوانك، بەروانك، رانك، جلك، بان بانك، ئاوماڵك (ئەو پل و پوشەی ئاو ڕایدەماڵێ و دەیهێنێ)، شۆرتك (لە موکریان بە جێی خۆشۆردن دەڵێن) لۆرك، نێرك و نێرتك. گرتك (پارچە ئێسکی بە گۆشتەوە).

هەر بەو جۆرە کە لە هێندێ وشەی وەك: نەخش، ڕەنگ، ڕەخس و هی دیکە فیعل دروست دەکرێ و دەڵێن: ڕەنگاندومە، دەیڕەنگێنم، نەخشاندومە، دەینەخێشنم، ڕەخسا، دەڕەخسێ، لە هێندێ لەمانەش فیعل دروست دەکرێ، وەك:

لە خلیسك– خلسکام، خلیسکای، خلیسکا

لە بزڕك– بزڕکام، بزڕکای، بزڕکا

لە هەڵتروشك– هەڵتروشکام، هەڵتروشکای، هەڵتروشکا.

هی دیکەش. لە هەموو ئەمانەدا "ك" پاشگرە و (ا) وەکو (ا)ی خورا، کرا، برا.. پاشماوەی (ان)ی مصدرییە، دوای قرتانی (ن)ەکە.

5–هاتنی ڕاناوی لکاو لە پێش فیعلەوە لە شێوەی کرمانجی سەرودا

مامۆستا مەسعود دەڵێ: "باسی ناوگر وەکو هەموو باسێکی دیکەی ڕێزمانی کوردی لە شێوە ئاخاوتنی ئێستاکەمان سەرهەڵدەدات، نەك لە بنج و بناوان و سەرچاوەی چەند سەد و چەند هەزار ساڵ لەمەوپێش. گریمان بە تۆژینەوەیەکی مێژوویی و ورد و قوڵ بۆمان دەرکەوت فلانە پاشگر و پێشگر و ناوگر لە کۆندا نەبوون یا جۆرێکی تر بوون، ئێمە هەر دەبێ وەك ئێستایان سەیربکەین و بیاننرخێنین".

قسەیەکی دروست و ڕەوایە و گومانی تێدا نییە کە ئێمە دەبێ هەروەك ئێستا بڕوانینە زمانەکەمان و تایبەتیەکانی بنرخێنین و بە ناوی ئەوەوە کە فلانە شت لە فلانە کاتدا هەبووە و ئێستا نەماوە ناتوانین و ناشبێ بەسەر زمانەکەمانیدا بسەپێنین. هەروەها ئەو شتەش کە ئێستا هەیە و لە زەمانی کۆندا نەبووە ناتوانین و نابێ بە ناوی ئەوەوە کە ئەوسا نەبووە لە زمانەکەمانی دەرهاوێژین. بەڵام وەکو دەزانین زمانەکانی پەهلەوی، دەری، کوردی و چەند زمانی تریش هەموویان لە ڕەگەزێکن. پەهلەوی و دەرێش وەکو کوردی لە چەند لەهجەی جیاواز پێك هاتوون و تەئسیریان لە یەکتردا کردووە. زمانی کوردیش لەبەر خزمایەتی لەگەڵ ئەوان و نزیکی لەو زمانانە شتی هاوبەشی لەگەڵ ئەوان کەم نییە. شتی واش لە زمانی کوردیدا هەیە سەرچاوەکەی دەگاتەوە زمانی ئەوێستایی یا پەهلەوی بەڵام لە زمانی فارسی ئێستادا نەماوە. لەبەرئەمە داخستنی دەرگای تۆژینەوەی تایبەتییەکان و تێکستەکانی ئەو زمانە کۆنانە، لە سنوری پێویستدا، بۆ دۆزینەوەی بنج و بناوانی مەسەلەیێکی ڕێزمانی کوردی، یا چەشنی (تطور)ی وشە.. ڕەوا نییە. بەڵام ئەگەر ئەم تۆژینەوەیە هەر بۆ چەنەلێدان و فڕوفیشاڵ و خۆهەڵکێشان یا لەمەڕ شتی لاوەکی و ناپێویست بێ، بێگومان نابێ گوێی بدرێتێ. جا ئێستا ئەوا دەگەڕێینەوە سەر ئەسڵی مەبەستەکە.

هاتنی ڕاناوی لکاو لە پێش فیعلەوە لە شێوەی کرمانجی سەرودا، وەك:

وی گرت، وان گرت، من گرت، مەگرت، تەگرت، وەگرت.

یا لە شێوەی کرمانجی خواروودا لە کاتی نەفیدا وەك:

نەمگرت، نەتگرت، نەمانگرت، نەتانگرت، نەیانگرت، ڕیشەیەکی قوڵ و کۆنی هەیە و لە زمانی پەهلەویشدا هەبووە. "لە زمانی پەهلەویدا ڕاناوی فاعلی لە پێش فیعلەوە هاتووە. ئەم ڕاناوە یا بە نیشانەی اضافە، یا بە (آف) بە مانا واوی عاطفە، یا بە واوی عاطفە، یا بە ڕاناوی ئیشارەی (ان)ەوە.. لکاوە و لە پێش فیعلەوە هاتووە[10]".

ئەوا دوو جۆر لەو نموونانەی "بەهار" هێناونی پیشان دەدەین:

افم– وم　　　　افمان– ومان

افت–وت　　　　افتان– وتان

افش–وش　　　　افشان– وشان

ڕاناوی جۆری یەکەم ئاوا صرف کراوە.

افم گپت– من گوتم　　　　افمان گپت–ئێمە گوتمان

افم گپت– ئەو گوتی　　　　افتان گپت– ئێوە گوتتان

افت گپت– تۆ گوتت　　　　افشان گپت– ئەوان گوتیان

ڕاناوی جۆری دووەم، یانێ: وێم، وێت، وێش، وێمان، وێتان وێشان هەر بە شکڵی خۆیان لە شێوەی هەورامیدا ماون:

وێم– وەرنە شێتە وێم دڵ وەشێ دڵەن
گیان جە تەن بەرشی ئاماش موشکوڵەن

(مەولەوی)

وێت– پەرسا بێت چۆنی؟ وێت غەڵەت کەردەن
مەر نمەزانی دوریت چ دەردەن؟

(مەولەوی)

وێش– هەنارەکەی دڵ پڕ جە دانەی ئێش
پیشیای کورەی نار عەشق وێش

(مەولەوی)

وێمان– سەوزەی خاك پاك یاران هام فەرد
فرەمان وە فەرش بەزم وێمان کەرد

(مەولەوی)

وێتان– شەرح حاڵ وێم مواچو پێتان
ئێوە مزاندێ بە بەخت وێتان

(خانای قوبادی)

ڕێشان– چونکە بەی دەستور شا بێ صلاحش
بە ڕەسم وێشان بەستن نیکاحش

(خانای قوبادی)

پەراوێزەکان:

1–(بەهار) نازناوی شیعرییەتی، لەقەبی (ملك الشعرا)یە، ناوی خۆی محەمەد تەقییە، شاعیرێکی پایەرزی ئێرانی و زمانناسێکی ناسراو بووە.لای پرۆفیسۆر (هێرتسفێڵد)ی ئەڵمانی پسپۆڕی زمانەکانی ئەوێستایی و پەهلەوی نهێنیەیکانی ئەو زمانانەی بە دەرس خوێندوە و لێیان شارەزا بووە. کتێبەکەی ئەو (سبك شناسی) بۆ خوێندنە لە زانستگای تاران، ئەوانەی دەیانەوێ پایەی دوکتۆرا لە ئەدەبی فارسیدا وەرگرن دەبێ ئەو کتێبە بخوێنن.

2–سبك شناسی لاپەڕە .319

3–سبك شناسی لاپەڕە .327

4–ڕەنگە نەمتوانیبێ مەبەستەکە بە ڕوونی دەربڕم. چونکە مامۆستا مەسعود ئەو وشانەی بە تەردیدەوە هێناوە نەك لە سەریان سوور بێ.

5–سبك شناسی لاپەڕە .191

6–سبك شناسی لاپەڕە .309

7–سبك شناسی لاپەڕە 391.

سەرچاوە: "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد"، بەغدا، بەرگی پێنجەم، 1977، ل 113–34دا بڵاوبۆتەوە.

# بەسەرداچوونەوە*

مەسعود محەمەد

ئەم گوتارەی مامۆستا قزڵجی کە بە عینوانی "لە بارەی هێندێ لە نهێنییەکانی ڕێزمانی کوردی" بۆ گۆڤاری کۆڕ هاتووە، دەنگدانەوەیەکی نرخدار و دڵسۆزانەیە لەوەوە بەرانبەر یەکێك لە بەرهەمە ڕێزمانییەکانی کۆڕی زانیاری کورد، ڕێگە ڕووناك کەرەوەی ڕێبازێکی زمانی کوردیشە. گوتارەکە لەو ڕووپەڕانەی ژورا، بێ دەسکاری و لێپرسینەوە و لێگۆڕین، بڵاوکرایەوە، ناوناوەیەك نەبێ کە بە ناچاری شێوەی ڕێنووسەکەی لەگەڵ شێوە ڕێنووسی کۆڕ گونجێندرا بۆ ئەوەی تا ڕادەی لوان، لەگەڵ چاپکراوەکانی تری کۆڕدا لە ڕووی ڕێنووسەوە یەك ئاهەنگ بێت.

بە عادەت گوتار لە لایەن نرخێنەرەوە تەماشا دەکرێت و ئەو تێبینییانەی هەیبێت بۆ خاوەنی گوتار دەچێتەوە تاکو سەرلەنوێ لەبەر تیشکی ئەو تێبینییانەدا بە گوتارەکەیدا بێتەوە و چی بە ڕاستیان دەزانێت بە هەندیان هەڵبگرێت و لە دووبارە پێداچوونەوەدا جێگەیان بۆ بکاتەوە. ئەوەی ڕێك کەوتنیشی لەسەر نەبێت دەخرێتە بەرچاوی ئەنجومەنی کۆڕ و ئەو بڕیار لە بارەیەوە دەدات.

ئەم جارەیان لەبەر دووری نشیمەنی خاوەن گوتار و بە نیازی کورتکردنەوەی کاتی پێویست بۆ ئەم شێوە "دوو بارخانە"یەی[*] درێژخاییێن، ئەنجومەنی کۆڕ لێمی سەلماند ئەوا تێبینییەکانم لە شێوەی گوتاردا یەکسەر بەدوا ئەو گوتارەدا چاپ بکرێن بێ ئەوەی لە پێشەوە بخرێنە بەر نیگای خاوەن گوتارەوە، لەمەشدا نە زیانێك پەیدا دەبێت، نە ڕاستی و زانستیش وەتەنگ دێن.

مامۆستا قزڵجی، وەك لە بەر فرەوانی لێکۆڵینەوەکانی و سەرەژوور تێهەڵکشانی بەرەو مێژووەوە دەردەکەوێت، لە گەلێك جێگە و گوتەدا بۆی ڕێك کەوتووە پارێز بباتە ڕایەکانم و بە تیری ڕەخنە بیانپێکێت، بەڵام ویستوویەتی جوانمەردی خۆیان لێ بەکاربهێنێت و بەشی زۆریان جەب بدات. من هەرچەند هەست بە چاکەکردنیشم تیژیش بێت و بە چاوی خێلەوە[**] سەیری چاکە بکەم، دەشی کەم، هەرگیز وەتەنگ نایەم لەوەی نشتەری پسپۆڕی دۆست و دڵسۆز لەشی هەموو بەرهەمێکم کوناش کوناش بکات. حاجی قادر گوتەنی:

"پێم خۆشە غەزەل فەرشی قدوومی غوقەلا بێ"

هەر ئەم تێبینیکردنەی باخەڵ فەڕاحی دۆستێکی زانای وەك مامۆستا قزڵجییە وا ڕێگەم پێدەدا لە وەرامی ڕەخنەدا، وەیا لە تەك دەرنەزەر خستنی ئەوەی بە "پوختتر"ی دەزانم پەرەوای دوودڵی کردن و زمان گرتن لەبیر خۆم ببەمەوە و بێ خوتخوتەی دڵ شکستە کردن و کۆمەی دۆست ڕەنجاندن مەشقی خامەڕانی بکەم.

بە دوا گوتارەکەی مامۆستادا، ئێستا پێ بە پێ و جێ بە جێی تێبینی تێدا کردن، چی لام هەبێت، لەوانەی خزمەتی باسەکە دەکەن، بە زنجیرە دەخرێنە بەرچاوی خوێنەرانەوە. واش بووە ترسی درێژەی لە حەد بەدەر قسەی لێ کورت کردوومەتەوە، وەیا هەر بە جارێ بێ قسەی کردووم. وەك بزانم تازەیی ئەو باسانە داخوازی شیکردنەوەی نەفەس درێژ دەکات.

-1-

بە پێی ئەوەی لە لاپەڕە (113، 114)ی گۆڤاردا نووسراوە وا دەفامرێتەوە کە لە نووسینەکەی ناو "چەند حەشارگەییێکی ڕێزمانی کوردی"دا لەو مەبەستانە دواوم کە لە کۆتایی لاپەڕە (113) و سەرەتای لاپەڕەی دواتردا ڕیزیان بەستووە. لێرەدا ناوی ئەو سەرەباسانە دەنووسم کە لە (حەشارگە..)دا لێیان کۆڵراوەتەوە:

1-حەشارگەی "ڕاناوی".

2-حەشارگەی پاشگرەکان "کار" کە بریتین لە (1، کا، را).

---

[*] دووبارخانە: کاروانچی کاتێك ژمارەی بارەکانی لە ژمارەی وڵاغەکانی پتر بوو هەموو وڵاغەکانی باردەکات و بارەکان تا نیوەی ڕێگەی قۆناغ دەبات و دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو بارانەی بەجێمابوون، ئەوانیش دەباتە لای بارەکانی تر. هەر بەوپێیەش بەشەکەی تری ڕێگا بە شێوەی "دووبارخانەیی" دەبڕێت.

[**] مەشوورە، دەگوترێ خێل یەك بە دوو دەبینێ.

3–حەشارگەی "فیعلی انتقالی و انتقالی پێچەوانە".

4–حەشارگەی "ناوگر".

دوای ئەمانە، بە زیادەوە و بێ ئەوەی ژمارەی بۆ دابندرێت، لە ڕاناوبوون و ڕاناونەبوونی ئەو "ت"ە دواوم کە لە کاری ئایندەدا دەکەوێتە کۆتایی ڕێژەی لەمەڕ کەسی سێیەمی تاکەوە، وەك: دەڕوات، دەچێت.. لەمەوە دەردەکەوێت من لە (حەشارگە..)دا باسی پاشگری "رە، وە، انیٚ"م نەکردووە کە لە گوتارەکەدا لێیان کۆڵراوەتەوە. ئەم ئیشارەتەش بە هیچ جۆرێك دەخلی بەسەر نرخ و ناوەڕۆکی گوتارەکەوە نییە چونکە نەدوانی من لەو شتانە نرخان لە گوتارەکە داناشکێنێت، لە سەنگیشی کەم ناکاتەوە.

–3–

لە لاپەڕە "115"دا فیعلی "سون، جون" هاتوون، گوایا لەوانەوە دوو فیعلی "ساوین، جاوین" بە لێ زیادکردنی ئەلفێك لەهەر یەکێکیان پەیدا بوون.

لە پێشەوە دەبێ بڵێین ئەگەر سەلماندمان "ساوین، جاوین" لە "سون، جون"ەوە هاتوون پێویستە بیسەلمێنین کە نەك تەنها ئەلف، بەڵکو یێش بە زیادەوە هاتووە، بەوپێیە ئەلفێك لە دەرەوە هاتۆتە بەرایی واوەکە و پێیەکیش هاتۆتە دوایەوە، کە ئەمە شێوەیەکی نەدیتراوە لە پەیدابوونی ناوگر لە فیعلی کوردیدا.

من وا دەزانم فیعلەکان لە بنەڕەتدا "ساوین، جاوین" بوون و بە



تێپەڕینی کات و گۆڕانی ئاخاوتن بەرەو سووکی و کورتی شێوەی کورتتر و سوکتریان لێکەوتۆتەوە. ئەوەی لە ئاخاوتنی ناوچە جوداکانی کوردستاندا دێتە بەرگوێ ئەم سێ شێوەیەیە:

ساوین: ساویم، دەساوم

سوین: سویم، دەسووم

سوون: سووم، دەسووم

فیعلی "جاوین"یش دوو شێوەی "جوین، جوون"ی لێ دەبیسرێ و هەر سێ شێوەش لە باودان.

دیارە ئەم فیعلانە هەوەڵ جار ئەلفەکەیان قرتاوە و بوونەتە "سوین، جووین" دواتر کورتتر کراونەتەوە بۆ "سوون، جوون".

–2–

لە لاپەڕە "114"ی گۆڤاردا کە لە دەسنووسی مامۆستا قزڵجییەوە بە چاپ گەیشتووە نووسراوە فیعلی "برگشتن" تێپەڕە. نەمویست نووسینەکەی مامۆستا دەست لێبدەم هەرچەند دەزانم مەبەستی ئەوە بووە بڵێ "تێنەپەڕە"، کە ئەمەش ڕاستی فیعلەکەیە، چونکە لە قسەکانی دواتریدا کە دەڵێ "برگردانیدن" تێپەڕی عام و "برگاشتن" تێپەڕی خاص بووە دیارە دەبێ بە لای ئەویشەوە "برگشتن" تێنەپەڕ بێت.

من لە گوتاری ترمدا نووسیومە چۆن وشەی "دژنێو- بە واتای دشنامی ڤفارسی" ئەم گۆڕانەی بەسەردا هاتووە.

دژنێو- جنێو- جوێن- جوون.

ساوین و جاوینیش نەختێکی ڕێگەی "دژنێو- جوون"یان کوتاوەتەوە و بوونەتە "سوون، جوون". ئەم باوەڕە لە ڕێگەیەکی تریشەوە پتەو دەبێت، ئەویش ئەو ڕاستییەیە کە هاتنی ناوگر بۆ ناو وشە گۆڕان بەسەر واتایدا دەهێنێت کەچی دەزانین "جاوین- جوون" "ساوین- سوون" واتایان نەگۆڕاوە، کەواتە دەبێ وشەکانی لە ڕێی لێسوان و لێقرتانەوە شێوەیان گۆڕابێت چونکە بەمەدا واتای وشە ناگۆڕێت وەك کە وشەی "هەستام، هەڵستام" و چەندین وشەی تری کورتکراوەی کوردی واتا گۆڕانیان تێدا پەیدا نەبووە. ئەم لێکدانەوەیە تەنها لە حاڵێکدا هەڵدەوەشێتەوە کە بە توێژینەوەی مێژوویی بسەلمێندرێ، لە کۆندا وشەکان "سوون، جوون" بوون دوایی لێیان زیادکراو بوون بە "ساوین، جاوین".

-4-

لە لاپەڕە "116"دا وشەی "بوردن، بواردن" هاتووە: من لە "حەشارگە.."دا باسی ئەمەم کردووە، بەڵام لێرەدا دەبێ بڵێم "بوردن" کە کارێکی تێنەپەڕە بە واتای "بەخشین"ی پاتەوپات نایەت چونکە "بەخشین" کارێکی تێپەڕە، دیارە تێپەڕ و تێنەپەڕیش پێکەڵ نابن. ئەوەی بە واتای "بەخشین"ی تەواو دێت وشەی "لێبوردن"ە کە تێپەڕی بە واسیتەیە. دەبێ بگوترێ "من لە تۆ بوردم" ناشێ بگوترێ "من ئەتۆم بورد". ئەوەی بەسەر زارانەوەیە و دەگوترێ "بمبورە" تەواوێك لە دەستووری لاداوە و ڕاستییەکەی "لێم ببوورە"یە. دەگوترێ "دارام بوارد، دارا منی بوارد، بمبوێرە.." چونکە "بواردن" کارێکی تێپەڕە و جێی خۆیەتی بەرکاری بێ واسیتەی هەبێت..

بە دوا "بوردن- بواردن"دا من لەگەڵ ڕای مامۆستا قزڵجیدام کە دەڵی دوو وشەی "ئەنگوتن- ئەنگاوتن" تێنەپەڕ و تێپەڕی یەك کارن هەرچەند لە گەلێك شێوە ئاخاوتندا ئەنگوتن بە واتای "بزوتن [گەلاوێژ ئەنگوت]، هەڵکردن [نەسیم ئەنگوت].." و واتای ئەوتۆیی تریش بە زۆری لەکار دێت. من لە "حەشارگە.."دا ئەم دوو وشەیەم هەڵبوارد چونکە هەندێ برادەری زمانزان لێیان نەسەلماندم واتای تێپەڕ و تێنەپەڕی یەك کار هێندەی "ئەنگوتن، ئەنگاوتن" لە یەکتر دوور بکەوێتەوە، ئەو برادەرانەش نەیانبیستبوو کارەکان بەو واتایە دێن کە مامۆستا قزڵجی باسی کردووە [بە واتای پێکران، ئەنگێوران].

بە پێچەوانەی ئەوەی مامۆستا لە بارەی "هەڵئەنگاوتن"ی گوتووە کە گوایا ئەم کارە وجودی نییە، لە زۆر ناوچەی کوردەواری دیوی کوردستانی عێراقدا دەگوترێ "لولەی تفەنگەکەم هەڵئەنگاوت دەنا کابرام دەکوشت- جۆگاکەم نەختێك هەڵئەنگاوت و ئاوەکەم سەرئەرز کرد..".

-5-

لە بارەی کارەکانی "شردن [بووبێتە شاردن]، ژمردن [بووبێتە ژماردن]، بژردن [بووبێتە بژاردن]".. من وا دەزانم ئەسڵی ئەم فیعلانە "شران، ژمران، بژران"ە کە لە جۆری فیعلی مطاوعی وەك "سوتان، رمان، پاشان"ن. ئەمانە بە هۆی ناوگر دەبنە "شاردن [ەوە]، ژماردن، بژاردن" ڕێژەی "مبنی للمجهول"یشیان تا ئێستا بە پێی دەستووری گشتی لە ئاخاوتندا هەر ماوە و دەگوترێ "دەژمێردرێ، دەشاردرێتەوە، دەبژێردرێ" کەواتە دەشێ بڵێین لە ڕووی بەراورد کردنەوە ئەم لیستەیە پێکدێت:

| تێنەپەڕ | تێپەڕ | مبنی للمجهول |
|---|---|---|
| رما | رماندی | رماندرا [رمێندرا] |
| سوتا | سوتاندی | سوتاندرا [سوتێندرا] |
| پسا | پساندی | پساندرا [پسێندرا] |
| شرایەوە | شاردییەوە | شاردرایەوە |
| ژمرا | ژماردی | ژماردرا [ژمێردرا] |
| بژرا | بژاردی | بژاردرا [بژێردرا] |

لێرەدا ئەو ڕەخنەیەم لێ ناگیرێ کە بگوترێ "سوتا، رما، پسا" بە هۆی "اند"ەوە بوونەتە تێپەڕ کەچی "شرا، ژمرا، بژرا" لە ڕێگەیەکی ترەوە بوونەتێ، چونکە مەرج نییە هەموو فیعلەکان بە یەك ڕێگەدا بەرەو تێپەڕی بڕۆن: بە نمونە، فیعلی "ئەنگوا- بە واتای پێکرا" بە هۆی "اند" ناکرێتە تێپەڕ و نابێتە "ئەنگواندی" بەڵکو دەبێتە "ئەنگاوتی" کە هەر خۆی ڕێژە تێپەڕی "ئەنگوت"یشە.

ئەگەر ئەم بۆچوونەم ڕاست بێ کاری (سپاردن)یش هەمان جۆر هاتنی لە "سپران"ەوە جێی باوەڕپێکردن دەبێ. وەك لە "حەشارگە.."دا گوتوومە "سپرا، دەسپرێ" لە نێوان خێڵەکانی بەشێکی هەرێمی ڕانیە و قەڵادزە و کۆیەدا دەبیسترێ. ئەگەر بشڵێین "ژمرا، شرایەوە، بژرا، سپرا" ڕژەی مبنی للمجهولن دەبێ بسەلمێنین کورتکراوەی "ژماردرا، شاردرایەوە، بژاردرا، سپاردرا"ن. ڕەنگە توێژینەوەی مێژوویی بەلایەکیاندا ساغ بکاتەوە. ئەوەی مامۆستا قزڵجی لە بارەی "ژماردن"ی گوتووە کە گوایا لە "شمردن"ەوە بە ئەلفێکی زیادەوە هاتووە [کۆتایی لاپەڕە "117"] ناوگرمان بە دەستەوە نادات چونکە "ژماردن"ی کوردی بەرامبەر و پێکەڵپێکی "شمردن"ی فارسییە و هەردوویان تێپەڕن. وا بزانم نابێ بڵێین "ژماردن" لە "شمردن"ەوە هاتووە بەڵکو هەر ئەوەندە ڕێگەیەمان هەیە کە بڵێین لە کوردیدا ژماردن بە واتای "شمردن"ی فارسییە هەر وەك "پێ"ی کوردی بەرانبەر "پا"ی فارسییە.

-6-

منـیش وەك مامۆسـتا قزڵجـی [لاپـەڕە "118"]، لـە "حەشارگە.."دا گوتوومە "بزوتن" بە هۆی ناوگرەوە لە تێنەپەڕەوە بۆتـە "بـزاوتن" کـە تێپـەڕە.. لێرەدا هـەر ئەوەنـدە دەڵـێم لـە هەنـدێ شـوێنی کوردسـتانی عێراقـدا لـە جیـاتی "بزوێـو" وشـەی "بـزۆز" بەکاردەهێنن، واش پـێ دەچێ ڕێژەیەك بێت لەوانەی تا ئێستا بەر حیسـابان نەکـەوتوون، هەڤاڵیشـی هـەن وەك لـەم نموونانـەوە دەردەکەوێت:

بزۆز

کلۆڵ

گلۆڵ

فسۆس

-7-

ڕۆنشـتن و دانشـتن [وەیـا دانیشـتن] لـە یـەك واتـادان و زۆریـش باون، بەلاَم کـە بـە هـۆی "انـد" بکرێتـە تێپـەڕ دەبێتـە "دانیشـاندن- ڕۆنیشـاندن"، دیـارە کـە بـە هـۆی نـاوگری "ا" بکرێتـە تێپـەڕ دەبێتـە "ناشـتن" و تـەواوێك لـە واتاکـەی دەگۆڕێـت، ئەمـەش مـافی بـێ دەمەتەقـەی نـاوگرە: پاشـگری "انـد" هـەر ئەوەنـدە دەکـات کـە لـە تێنەپەڕەوە تێپەڕ دروست دەکات بێ ئەوەی واتای بگۆڕێت.

-8-

لـە لاپـەڕە "120"دا وا ڕاگەیەنـدراوە کـە وشـەی "پەسـاردن- هەڵپەساردن" لە "سپاردن"ەوە هاتووە و واتاکەی گۆڕاوە. وا دەزانم بەڵگەیـەك نییـە ئەمـە بسـەپێنێ، پتریـش لەگـەڵ بـاوەڕدا دەگونجـێ بگوترێ هەردوویان وشەی سەربەخۆن و لە بنەڕەتدا لە یەکتر جودان وەکو هـەموو دوو وشـەی تری لـە یـەکتر جودا. گـەلێك وشـە هـەن لـە کوردیـدا وەك ئـەم دوو وشـەیە حەرفـەکانیان [دەنگـەکانیان] هاوچەشـن بـەلاَم لەدوایـەکترداهاتنی دەنگـەکان و واتـای وشـەکان جودان وەك: گەرم، مەرگ- دەرز، زەرد- زێڕ، ڕێز.. چ بەڵگەیەکیشم بە دەست کەسەوە نەدیتووە ئیسپاتی ئەوە بکات کە یەکێکیان لەوی ترەوە وەرگیراوە.

-9-

لـە بابـەت وشـەی "خـوردن، خـورتن، خـو.."ەوە کـە لـە لاپـەڕە "121" باس کراوە دوو تێبینیم هەیە:

یەکـەم: لـەم وشـانەوە کـە سەرچـاوەی "خـواردن"ی ئێسـتاکەی کوردی بە دەستەوە دەدەن دەزانرێ بۆچی ئەم وشـەیە لـە تەصریفدا وەك ئەو کۆمەڵە وشانە نییە کە هاوکێشن و بەریـەك دەستووری بـێ کەلەبەر و بێ ڕیزپەڕی تصریف دەکەون وەك:

| | |
|---|---|
| بواردم | دەبوێرم |
| هەناردم | دەهەنێرم |
| ژماردم | دەژمێرم |
| بژاردم | دەبژێرم |
| سپاردم | دەسپێرم |

فیعلی "خواردم" دەبوو بە پێی ئەم دەستوورە لە ئایندەدا ببێتە "دەخـوێرم" کەچـی دەبێتـە "دەخـۆم" ناوناوەیـەکیش لێـرە و لـەوێ دەگوترێ "دەخۆرم". بەلاَم کە زانرا بە ئەصل "خواردن" نەبووە چ گلەیی لەوەدا نامێنێ کە ڕێژەی ئایندەی بچێتەوە بەرەو ڕێـژەی ئەو سەرچاوەیەی کە لێیەوە هەڵقوڵیوە.

دووەم: کە زانیمان دەنگی "ا"ی ناو وشەی "خواردن" لـە دەنگی فەتحـە "ە"وە هـاتووە نابـێ بڵـێین نـاوگرە و لـەلاوە هـاتووە بـۆ نـاو وشـەکە بـەڵکو ئاشـکرایە کـە لـە ئاکـامی گۆڕانـەوە پەیـدا بـووە، گۆڕانیش باسێکە زۆر جودا لە باسی "ناوگر".

-10-

لـە بـارەی وشـەی "برێشکە"وە کە ئـەویش لـە لاپـەڕە "121"دا بـاس کـراوە مـن هـەر وا دەزانم بـە هـۆی نـاوگری "ێ" لـە "بـرژان"ی کوردییـەوە پەیـدا بـووە نـەك لـە "وریـژیتك"ەوە، بەڵگەشم وشـەیەکی تـرە کـە ئـەویش، هـەمان جـۆر، ئـەم دەنگـەی "ێ" تێـدا بـە نـاوگر هــاتووە، وشــەکەش "نــان برێشــك"ە کــە خــەڵق کردوویانەتــە "ناوبرێشـك". وا دەزانم زۆر زەحمەتـە زمـانی کـوردی لـە وشـەی "وریــژیتك"ەوە ڕێــژەی "برێشـك"ی بـۆ وشـەی "نـان برێشـك- ناوبرێشك" خواستبێتەوە بە تایبەتی کە لە کۆنەوە وشەیەکی وەك "نـان بریـژیتك" نـەبووبێت بیکـەین بـە بنـەمای وشـەکەی ئێسـتای کوردی.

-11-

لـە وشـەکانی "برنج، ئاسـەوار [لاپـەڕە "122"]، کۆمـەڵ [لاپـەڕە "123"]، دروێنـە" بـێ سـێ و دوو لێکـردن هاتمـە سـەر ڕایەکـەی مامۆسـتا قزڵجـی، لـە دوو وشـەی "ئاسـەوار، کۆمـەڵ"یش وێـڕای قەناعـەت هێنـان، ڕوون بوونەوەیـەکی زمان ناسانەشم پێگەیشت بـە تایبەتی لە وشەی "ئاسەوار"ەوە. بەلاَم وا دەزانم دەنگی "ێ"ی ناو وشەی "دروێنە" لە "دروین"ەوە گۆڕاوە نەك "دروان" چونکە ئەمەی دوایـی تێنەپـەڕە "دروون، دروین"یـش تێپـەڕە. "سـوان، بـران"یش هەردوویان تێنەپەڕن "سوین، برین"یش تێپەڕن..

-12-

وشەی "پێژە" ناشێ لە "پێژان"ی "خشت پێژان"ەوە هاتبێت کەوا لە لاپەڕە "123" باس کراوە چونکە واتای "پێژە" لە وشەی




"ڕێژە و پێژە"دا بڵاوبوونەوەیە نەك کەوتنەوە سەریەك و ڕێك کەوتن. بڵاوبوونەوەش بۆ "پژان" دەچێتەوە.

بە داخەوە لە دەستنووسەکەی مامۆستا قزڵجی دوو وشە هاتوون، نیشانەیەك بەسەر پیتێکی هەریەکێك لەو دوو وشانەوە هەیە بەڵام نازانرێ هی کام پیتە. وشەکان "گیرە، گیران"ن، لە چاپ کردندا بوون بە "گێڕە، گێڕان" دیاریشە نابێ وا بن.

-13-

وشەکانی "خارشت، شەبەق، ئاراو [لاپەڕە "123"]، ڕەمانە [لاپەڕە "124"] دەمەتەقە هەڵدەگرن، ڕەنگە لێشیان بە کۆتایی نەگەین، ئەوەندەش گرنگ نین زۆریان پێوە ماندوو بین، لەبەرئەمە بەسەریاندا نەڕۆیشتمەوە.

-14-

لە بارەی خاڵی دووەم کە لە کۆتایی لاپەڕە "124" و بەرەو دواوە باسی "ت"ی کۆتایی هێندێ فیعل دەکات، مامۆستا لەوەدا لەگەڵم گونجاوە کە دەڵێم ئەو تێیانەی کۆتایی فیعلی کەسی دووەم و سێیەمی تاك، وەك "دەخۆیت، دەکەیت– دەبات، دەچێت.." ڕاناو نین نمونەی وشەی کۆنی دەرێ و ئاوێستاشی هێناوە کە لەواندا، وەك لە پەهلەویدا، [بە پێی نوسینی ناو گوتارەکە] ئەم تێیانە بەکارهاتوون. بەڵام لە گۆشەنیگای ڕێزمانەوە، وا دەزانم، ئەو بەڵگانەی من لە "حەشارگە.."دا هێنابووم بۆ ڕاناو نەبوونی ئەو تێانە [بە تایبەتی هی کەسی سێیەمی تاك] پتر ئیسپاتی مەبەست دەکەن لەوەی کە بزاندرێ لە کۆنەوە تێ لەوە شوێنانەدا بەکارهاتوون چونکە ئەو کەسەی بڵێ تێیەکانی ئیمڕۆ ڕاناون دەتوانێ بڵێ لە کۆنیشەوە ڕاناو بوون، بگرە پتریش بەردەوام دەبێ لەسەر بیروڕای خۆی کە دەزانێ بەر لە دوو هەزار ساڵ زیاتر ئەم جۆرە تێیە بەکارهاتوون، بەڵام کە بەڵگەی پتەو ئیسپاتی ڕأناو نەبوونیانی کرد چ بایەخێك نامێنێ لەوەدا ئایا کۆنن یا تازە. من لە حەشارگەدا دوو بەڵگەم هێنابۆوە [بڕوانە لاپەڕەکانی 88-91ی "حەشارگە.."] بۆ ڕاناو نەبوونی تێیەکەی کەسی سێەمی تاك یەکێکیان لەوەدا کە ئەگەر ڕاناو بوویایە دەبوو وەك ئەوانی تر مومکین بێ لە ڕستەدا ببێتە مەفعول. ڕاناوەکانی ڕێژەی ئایندە ئەمانەن:

| | |
|---|---|
| دەڕۆم | (م) |
| دەڕۆین | (ین) |
| دەڕۆیت | (یت، ی) |
| دەڕۆن | (ن) |
| دەڕوات | (گۆیا "ت" یاخود "ات" ڕاناوە) |
| دەڕۆن | (ن) |

ئێستا ئەم ڕاناوانە –ئەگەر ڕاناوبن– دەخەینە ڕستەی ئەوتۆوە تێیدا بن بە مەفعول:

| | |
|---|---|
| دەیانبردم | (م) |
| دەیانبردین | (ین) |
| دەیانبردیت | (یت، ی) |
| دەیانبرد | ( ) |
| دەیانبردن | (ن) |

ئەگەر (ات) وەیا (ت) لە کۆتایی (دەڕوات)دا ڕاناو بوویایە دەبوو ئەویش وەك ئەوانی تر ببوویایە مەفعول و بگوترابایە:

دەیانبردت

وەیا دەیانبردات

وەیا دەیانبردێت (ئەگەر نمونەکە لە "کوشتن"ەوە هاتبا دەبووز بگوترێ "دەیانکوشتێت").

بەڵگەی دووەم، کە بەهێزتریشە لە هی یەکەم، لەوەدایە کە وا بە پێی باوەڕی ئەم زمان شناسانەی تێیەکەی کەسی سێیەمی تاك بە ڕاناو دادەنێن دەبێ ئەم تێیەی کۆتایی فیعلی وەك "بووبێت، چووبێت.." ڕاناو بێ. جا ئەگەر ئەمە ڕاست بێ کە تێیەکە ڕاناوە دەبێ بسەلمێنین لە فیعلەکانی وەك "چووبێتم، چووبێتین، چووبێتیت.."دا دوو ڕاناو هەبێت یەکێکیان هی کەسی سێیەمی تاك و ئەوی تریشیان هی کەسەکانی تر. لە فیعلی تێپەڕدا وەك "گوتبێتمان، کێلابێتیان، کردبێتت.." کەوا هەمیسان دوو ڕاناوی فاعیل لە یەك فیعلدا کۆدەبنەوە یەکێکیان هی کەسی سێیەمی تاك و ئەوی تریان هی کەسەکانی تر، دەبێ لە "گوتبێتی، کێلابێتی، کردبێتی"دا دوو ڕاناوی کەسی سێیەمی تاك هەبێ "ت،ی" ئەمەش شتێك نییە هیچ لێکدانەوەیەکی بەڕێ و جێ مەرحەبای لێ بکات.

لەبەرئەمە وا دەزانم مامۆستا قزڵجی لە پێویست کەمتر سەرنجی کێشاوە بۆ ئەم باسە و بە چاوی کڕیاریش سەیری هەموو بەڵگەکانی ناو "حەشارگە.."ی نەکردووە. بۆ نموونە، ئەگەر ڕێی هەبا پتر خۆی بەو باسانە و بەڵگەکانی ناو "حەشارگە.."وە خەریك کردبا دەبوو هەڵوەستێکی لە ئاست لێکدانەوە دەربارەی ڕاناوی لکاوی بەهێز و بێهێز [لاپەڕە 13–17] بکردبایە وەیا ناوێکی فیعلی "انتقالی و انتقالی پێچەوانە [لاپەڕە 51–77]"ی بهێنابایە..

-15-

لە بارەی وشەی (نپردت، نپردیتن) کە لە سەرەتای لاپەڕە "127"دا هاتوون چ زیانێك پەیدا نابێ لەوەدا کە بڵێم ڕەنگ بێ وشەی (نبرد–نەبەرد) لەوانەوە کەوتبێتەوە.

هەر لەو لاپەڕەیەدا مامۆستا قزڵجی وشەی "رە"ی بە پێشگری داناوە و دەڵێ بە واتای "لە"یە. لێرەدا تێبینیم هەیە:

ناشێ "رە" بە پێشگر دابندرێت چونکە خۆی وشەیەکە لەو بەشە ئاخاوتنەی پێی دەڵێن "preposition" و لە عەرەبیدا پێی دەڵێن "حرف جر". دەوری "پێشگر" لە پێکهێنانی وشەدایە، دەوری پرێپۆزیشنیش لە ڕستەدایە. پێشگر و پاشگر و ناوگر خۆیان هەمیشە دەبنە کەرتێکی وشە، هەر ئەم تایبەتییەشە لە وشەی دیکەیان جودا دەکاتەوە، بەڵام ئەم ڕاستییە مەنعی ئەوە ناکات پرێپۆزیشن وەك هەموو وشەیەکی تر ناوناوە وشەی لێکدراو وەیا داڕژاو دروست بکات وەك کە بڵێین (پیاوی "بێ دین" چ پەروای نییە..) وەیا (پیاوی "بەدین" دەست دەپارێزێ..). لەم نمونانەدا "بەدین، بێدین" بوونەتە وشەی فەرهەنگی هەروەك دەشێ وشەی "دەست کورت"یش بە واتای هەژاری بخرێتە ناو فەرهەنگەوە، بەڵام کە گوتمان "ئەم دنیایە بێ دین ڕاناوەستێ– کابرا بە پارە چارەی کارەکەی کرد.." دوو وشەی "بێ، بە" لە ڕستەدا دەوریان دێت و وشەی فەرهەنگییان دروست نەکرد چونکە نەبوون بە کەرتی وشەیەکی تر وەك کە "هەڵن دا، تێ، را.." لە وشەکانی "هەڵگرتن، داگرتن، تێسرەواندن، ڕاهاتن.." هەمیشە کەرتێکیانن و ناتوانن لیان بپچڕێنەوە بۆئەوەی سەربەخۆ لە ناو ڕستەدا دەور ببینن. لە شێوەی وەك "هەڵمگرت، داتانشکاند، تێیانهەڵسوو، ڕایدەپەڕێنن.."دا پێشگرەکان هەر پێشگرن و بەشێکی فیعلەکانن هەرچەند ڕاناوێك کەوتۆتە نێوانیانەوە.

لە وشەی وەك "ڕەدوکەوتن"دا ئەم "رە"یە پێوەندی بە وشەی "دوو" وە هەیە وەك پرێپۆزیشن نەك پێشگر، چونکە لەوێدا "دوو" زەرفە نەك فیعل.

لە بارەی "رای" پەهلەوی و "را"ی دەریشدا [لاپەڕە "127"] هەرچەند نەشتوانم ببم بە بەرەوان لەو دوو زمانەدا بەڵام جوداوازی نێوان واتاکەیان هێندە ئاشکرایە ڕێ بە خۆم دەدەم بڵێم ئەم دوو وشەیە دەخڵیان بەسەر یەکترەوە نییە چونکە "رای" پەهلەوی پرێپۆزیشنە "را"ی دەریش نیشانەی "مفعولیە"ە چ بە واسیتە و چ بێ واسیتە. هەروەك "رای" ناشێ پێشگر بێت هەروەها "را"ش ناشێ پاشگر بێت هەرچەند لە دوای وشەوە بێت چونکە نابێتە کەرتێکی وشە و چ مەعنایان لە ناوەڕۆکی وشاندا زیاد و کەم ناکات.

لە بارەی پاشگری "وە"وە [لاپەڕە "127"] قسە زۆرن، من بەوپەڕی لێ کورتکردنەوەوە خۆمی لێ ڕزگار دەکەم:

أ–نمونەکانی مامۆستا قزڵجی "بچۆرەوە، بڵێرەوە، بمدەرەوە، بکەرەوە" هەموویان لە ڕێژەی فەرمان هاتوون، باشتر ئەوەیە "چۆوە [چۆوەوە]، گوتیەوە، دایەوە، کردییەوە" بە سادەیی و بێ لێ زیادکردنی ئەم "ر"ەی ڕێژە فەرمانی بەشێك لە لەهجەکانی کوردی بخرێنە بەر سەرنجەوە.

ب–وەك بۆ سەرنجی بینەر دەردەکەوێت پاشگری "وە" کە لە هەندێ لەهجەی کوردیدا دەبێتە پێشگری "وە،ڤە" نەك تەنها بۆ دووپاتکردنەوە بەڵکو بۆ گەلێك مەبەستی تر لەگەڵ فیعلدا بەکاردەهێندرێ، لەوانە:

–دوپاتکردنەوە.

–خۆی بەشێکی بنجییە لە فیعلدا کە بێ ئەو فیعلە کە واتای دروست نادات وەك "ڕازانەوە، گواستنەوە، شاردنەوە.." لەم فیعلانەدا پاشگری "وە–ەوە" نە واتای دووبارەکردنەوەی تێدایە نەبێ ئەو فیعلەکان واتایان دروست دەبێ.

–خۆی بەشێکی بنجییە لە فیعلدا بەڵام کە لێی قرتا فیعلەکە واتایەکی تر دەدات و لە هیچیشیان دووپاتکردنەوە پەیدا نییە وەك "ئاوخواردنەوە، پارەبردنەوە، دەرگا کردنەوە، مەڕ کوشتنەوە..".

ئەم فیعلانە ئەگەر بە واتای "شرب، کسب، تح، ذبح" بن لە دووپاتکردنەوەدا دەبێ بگوترێ "جارێکی تر وە یاخود دووبارە خواردنەوە، دووبارە بردنەوە، دووبارە کردنەوە- جارێکی تر بردمەوە، دووبارە دەرگەکەم کردەوە، سەرلەنوێ خواردمەوە.. هتد".
مامۆستا قزڵجیش لە بەرەو کۆتایی لاپەڕە "128"دا گوتویەتی "پاشگری (وە) لە فیعلی (بخۆرەوە)دا جگە لە مەبەستی (اعادە)، بۆ جیاوازی نێوان (اکل) و (شرب)ە." بەڵام دەبوو بڵی فیعلی تریش لەم جۆرەی "خواردن" زۆرن.

-لە فیعلەکانی ئەو نمونانەی مامۆستا قزڵجی لە لاپەڕە "128"دا هێناونیەوە "ئەو کتێبە بنووسەرەوە، قەرزەکەم بدەرەوە، ئەو گایەی کڕیوتە کە جووت ناکا بیفرۆشەرەوە.." وەك مامۆستا خۆی دەڵێت سەرنج گرتنێکی ورد پێویستە: چ لەم نمونانە بێت و چ لە نمونەی تری وەك "کەوتم و هەڵستامەوە، چووم و هاتمەوە، کەپرم کرد و تێکم دایەوە.." بێت، دیاردەیەکی گشتی لە هەمووان‌دا هەیە هەرچەند دیاردەکە بە پێی سروشتی "فیعل" جلوەگۆڕیش بکات. لە بەشێکی زۆری ئەم فیعلانەدا فیعلەکەی دوایی کە پاشگری "وە-وە"ی پێوەیە بەردەوام بوون وەیا دووبارە کردنەوەیەکی پێچەوانەیی فیعلی یەکەم ڕادەگەیەنێت لە هەموانیشدا ئەگەر فیعلی یەکەم نەبێت هی دووەم نابێت:

چووم و هاتمەوە- هاتنەوەکە بەردەوام بوونێکی پێچەوانەیی چوونە.

کەوتم و هەڵستامەوە- هەڵستانەوەکە پێچەوانەی کەوتنە و لەوەوە پەیدا بۆتەوە.

کردم و تێکم دایەوە- تێکدانەوە پێچەوانەکردنی کردنەکەیە و لەوەوە هاتووە.

گایەکە دەفرۆشمەوە- دیارە لەمەوپێش کڕیومە دەنا دەمگوت "دەفرۆشم"، ئەم فرۆشتنەوەیە پێچەوانەکردنی کڕینەکەیە.

لە فیعلی "کوشتنەوە"دا وەك گوتم پاشگری "وە-وە" بۆ دووبارەکردنەوە نییە بەڵکو خۆی دەوری بنجی واتاگۆڕی دیتووە وەك کە لە "پارەبردنەوە، دەرگە کردنەوە.."دا دەوری بنجی دیتووە بێ "اعادە". ئەگەر ئێمەش وەك مامۆستا قزڵجی بڵێین کوژرانی بەرخ لە لایەن خەلقی ترەوە سەبەبە بۆ ئەوەی واتای دووبارەکردنەوەی تێدا "تصور" بکرێت، ڕووبەڕووی دوو بەرهەڵستی گەورە دەبین: یەکێکیان ئەوەیە کە دەبوو یەکەم "کوشتنەوە" پێی بگوترێ "کوشتن" تاکو دووەم و سێیەم و.. هەزارەم دووبارەکراوەی ئەو بن. بەرهەڵستی دووەم ئەوەیە کە ئەگەر لە کوشتنەوەدا ڕێ هەبێ کاری لێرە بە پێشەوەی خەلق ببێتە "مبرر" بۆئەوەی هی من و تۆ بە شکڵی دووبارەکراو دەربڕرێت، ئەوسا دەبوو هەموو کارێکی تێپەڕ نەك هەر "کوشتن، کوشتنەوە" هەمان شکڵی دووبارەکراو وەرگرن چونکە هەروەك بەر لە بەرخەکەی من و تۆ بەرخی تر سەربڕاون بەر لە جگەرەی من و تۆش جگەرەی تر داگیرسێنراون، ئەوساش دەبوو بڵێم "جگەرەیەکم داگیرساندەوە.." هەروەهاش بڵێم دەموچاو شووشتەوە، زەویەکەم کێڵایەوە [بە واتای کێڵام]، سەگەکە پشیلەکەی خنکاندەوە.. هتد" چونکە لێرە بە پێشەوە دەموچاویش شۆراون و زەویش کێڵراون و پشیلەش خنکێنراون. [باسەکە پتر بەدواکەوتن هەڵدەگرێت].

-17-

لە بارەی ئەوەی مامۆستا قزڵجی لە کۆتایی لاپەڕە "128"دا پێی دەڵێ پاشگری "انیٚ": ڕاستکردنەوەیەکی بچوك لە سەرەتای لاپەڕە "129"دا پێویستە بکرێت. نووسراوە ("کردتانی" و "کردمانی" و "کردشانی" صیغەی زۆر کۆنی زمانی دەرین کە لە جیاتی هەوەڵ کەس و دووەم کەس و سێیەم کەسی کۆی ڕابردوو..) وا دەزانم دەبێ وشەی "کردمانی" لە پێشەوە بێت بۆئەوەی لە خوردکردنەوەکەی دواتردا بەرانبەر کەسی یەکەم ڕاوەستێت، ئەوساش "کردتانی" دەکەوێتە بەرانبەر کەسی دووەمەوە.. کە سەرنج ڕاگریت دەبینیت دواتر لە دێڕی چوارەمی لاپەڕەکەدا فیعلەکان ڕیزی ڕاست و دروستیان بەستووە.. بەدوا ئەمەدا کە مامۆستا دەڵێ "دەچمەوانێ، دەچێتەوانێ" لەمەوە پەیدا بووە باشتر ئەوەبوو بیگوتایە "چوومەوانێ، چویتەوانێ" تاکو ئەوانیش وەك نمونەکانی ناو کتێبەکەی "بەهار" ڕێژەی ڕابردوویان هەبوایە.

ئێستا دەبێ سەرنج بۆ شتێکی گرنگ ڕابکێشم لە مەسەلەی "انیٚ-ەوانیٚ"دا:

لە شێوە ئاخاوتنی سلێمانی ئەم پاشکۆیە وە نییە هەر لەگەڵ فیعلدا بێت بەڵکو بە دوای ناویشدا دێت و دەگوترێ "لە ماڵەوانێ..". ڕەنگە بگوترێ ئەم "ەوانێ"ەش هەر هی دوای فیعلە پەڕیوەتەوە بۆ کۆتایی ناو، بەڵام ئەم هێندە گوتەیە ڕاستی دیاردەکەمان بۆ ڕوون ناکاتەوە چونکە دەبێ لە پەڕینەوەی وشە وەیا کەرتیوشە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، هەر نەبێ، بۆرە دەستورێك ڕەچاو بکرێت وەك ئەوەی کە من خۆم لە کۆتایی لاپەڕە "229" و لە لاپەڕە "230"ی کتێبی "چەپکێك لە گوڵزاری نالی"دا گوێزانەوەی هەندێ دەنگ و ئامرازم لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر لە نمونەکانی ناو ئەو لاپەڕانەدا داوەتەوە بە داخوازی کێش وەیا قافیەی شیعر[*]. لێرەدا دەبێ ئەو تێبینییەش بکرێت، هاتنی ئەم "ەوانێ"یە بەدوا غەیری فیعلدا لە شوێنی تایبەتیدا دەبێ، ژمارەی ئەو شوێنانەش زۆر نین، وشەکەش دەبێ لە حاڵەتی غەیری "فاعلیە

---

[*] وا دەزانم ئەوەی لەو جێگایەی "چەپك"دا گوتراوە یەکەم ئیشارەیە بۆ ئەو تەرزە جێگۆڕکێیە لە ئاخاوتنی کوردی، ئەم جارەشیان دووەم ئیشارەیە.

و وصفیه"دا بێت، بە کورتی دەبێ لەو حاڵەتەدا بێت کە عەرەب پێی دەڵێن "معمول" ئیتر مفعول بێ وەیا زەرف وەیا هەر شتێکی تری وەك ئەوان. بە نمونە دەڵێم کەس نەیبیستووە بگوترێ "مەحمودەوانێ کوڕێکی زیرەکە، ئەم ڕوبارەوانێ ئاوەکەی خوڕە، خانوەکەم خۆشەوانێیە، مەلێکی جوانەوانێم گرت..".

بەهەرحاڵ ئەم باسە گەلێك پتر لێوردبوونەوەی دەوێت لەوەی مامۆستا قزڵجی کردوویەتی وەیا من لێرەدا کردومە. بەلای باوەڕی منیشەوە بەکارهێنانی ئەم شێوە "ڕستە سازییە" بابەتی "زمانی ئەدەبی یەکگرتوو" نییە بەڵکو بەکارهێنانێکی ناوچەییە، تەنانەت هێنانی ئەو "ر"ە نەرمەش لە ڕێژەی فەرماندا وەك "بنوسەرەوە، بڵێرەوە، بچۆرەوە.." کە هەندێك لە نووسەران بە شتێکی وەك "نون الوقایە"ی[شم] دادەنێن بۆ پاراستنی بزوێنی سەرەتای "ەوە" ئەویش

[شم] بەلای هەندێ زمانەوانانەوە ئە پاشگرە "ەوە"یە نەك "وە" چونکە لەهەر جێگایەکی مومکین بێت بزوێنەکەی پێشەوەی بپارێزرێت پارێزراوە، بەڵگەیەکیش بۆ ئەم باوەڕە لەوەدا دەهێننەوە کە لە ڕێژەی فەرمان "فعل امر"ی کوردیدا لەبەرئەوەی کۆتایی ئەو ڕیبژەیە هەمیشە هەر بزوێنە، بەشێك لە کوردەکان ئەم "ر"ە لاوازە بە نیازی پاراستنی بزوێنەکەی سەرەتای "ەوە" دەهێننە ناو ڕێژەی فەرمان چونکە دیارە بزوێن بە بزوێنەوە نالکێ: تۆ ناتوانی تلفظ بکەی "وەرە ەوە- بکە ەوە – بخۆ ەوە- بێ ەوە.." تا کۆنسانتێك دێت و بزوێنەکە بە خۆیەوە دەگرێت.. ئەوەی ڕاستی بێ من تا ئێستا نەمگوتووە "وە" یاهود "ەوە" پاشگرە هەرچەند لە بیروڕا و لێکدانەوەدا بەلای "ەوە)دا دەچمەوە چونکە ئەم بزوێنە لێرەو لە شوێنی تریشدا زۆر بەرچاوە و دەورێکی گەورەی هەیە لە ئاخاوتنی کوردیدا، دیارە نابێ ئەم هەموو سەرەتاتکەیە لەلایەن بزوێنی "ە"ەوە خۆرشایی بێت، دەرنەکەوتنیشی لە هەندێ حاڵ و باردا نابیچتە ڕەسەن نەبوونی چونکە بەشێکی زۆر لە دەنگەکانی ناو وشەی زمانی کوردی تێدەبردرێن و دیچنەوە کەسیش ڕێی نییە بڵێ تێبردنەکە بەڵگەی ناڕەسەنییە:

| | |
|---|---|
| چووم | دەچم- لێرەدا واوەکە تێبردرا |
| هاتم | دێم – هێ نەما |
| شوشتم | دەشۆم- "شت" ون بوو |
| خواردت | دەخۆی- "ارد" ڕۆیی |
| بەرڵلا | لە بەرهەڵدراوەوە هاتووە.. |

هەر بەو جۆرەش بزوێنی پێش نیشانەی تەعریف "ەکە" لە زۆر شێوە ئاخاوتندا کە کەوتە دوای بزوێنەرە تێدەبردرێت وەك:

| | |
|---|---|
| پەنجەرە | پەنجەرەکە- نەگوترا و ناگوترێ "پەنجەرەکە" |
| برا | براکە- نەگوتراو ناگوترێ "براەکە". |

واش دەبێت کۆنسنانت دێت و ئەم بزوێنە دەپارێزێت و دەگوترێ "برایەکە".

لە هەندێ لەهجەدا پاشکۆی "اسم الاشارە" کە بزوێنی "ە"یە، کاتێك بە دوای وشەی وەهادا هات کە بە "ە" کۆتایی دێت تێدەچێت

ڕەفتارێکی ناوچەییە و ناشێ بەسەر هەموو نووسینی کوردیدا بهێندرێ.

-18-

لە بارەی پاشگری "ك"ەوە:

ئەوەی لە لاپەڕە "129" و "130" و "131"دا نووسراوە لەژێر عینوانی [4-پاشگری (ك)، (ئا)دا تەواوێك لە مەبەستی ناو "حەشارگە.."ی لاداوە، چونکە لەوێدا باسی پاشگری "کا" کراوە کە بە دوا فیعلدا دێت و لە ئایندەدا دەبێتە "کێ- بزڕکا، دەبزڕکێ"

کەچی لە گوتارەکەدا کۆمەڵێك مەبەستی لە یەکتر جودا لەژێر ئەو عینوانەدا کۆکراونەتەوە کە زۆر تێبینی هەڵدەگرن من لەم چەند خاڵەی ژێرەوەدا کورتەییێکیان دەنووسم:

1-کافی "بندك، دستك- کە بوونەتە بەندە، دەستە" لە هیچ ڕوویەکەوە لەگەڵ باسەکەی مندا یەکتر ناگرنەوە، تەنانەت وشەیەکی وەك "کوتك- کوتەك" کە لە فیعلی "کوتان"ەوە هاتووە ئەویش لە

پەنجەرە ئەم پەنجەرە. لە شێوەی تردا دەگوترێ "ئەم پەنجەرەیە..".

دەرنەکەوتنی بزوێنی "ە" لە بەرایی "ەوە" کە دەبێتە پێشگر، شتێکی ناچارییە چونکە لەو حاڵەتەدا چ کۆنسنات لە پێشییەوە نییە خۆی پێوە بگرێت، لەبەرەئمە نابێە بەڵگەی ناڕەسەنی بزوێنەکە. کورتەی قسەم لەمەدا ئەوەیە کەوا بە ئاسانی ناتوانین بڵێین ئەم پاشگرەن کە دەشبێتەوە بپێشگر "وە"یە نەك "ەوە". ئەو نووسەرانەی دەڵێن هاتنی ئەو بزوێنە لە بەرایی "وە" وەیا لە کۆتایی وشەکاندا بۆ ئاسان کردنی دەربڕینی بێژەکانە قسەیەکی بێجی دەکەن چونکە چ قورسایی لەوەدا پەیدا نییە کە ەل جیاتی "چۆمەوە" بگوترێ" چوومەوە" لە حاڵێکدا ناوی جێگە و ئاوایی هەیە لە کوردستاندا وەك "پەسوە، بێژووە.." کۆتایان بە "وە" دێت و کەس لێیان وەتەنگ نەهاتووە: بەڵی مومکینە بگوترێ "پەسوێ، بێژوێ" بەلاّم زۆریش بە جۆرەکەی تری دەردەبڕن بە تایبەتی بە ڕستەدا کە دەڵێن "فلانەکەس خەڵقی بێژوەیەو و خەڵقی پەسوەیە..". لەمەش بترازێ، یەکێك لە ڕێژەکانی ڕابدرووی کوردی هەمیشە کۆتایی بە "وە" دێت وەك: دار نووستووە، ئەمەم بردووە، کێت دیتووە؟ چەندین ڕستەش هەن وەك: ناوم برزوە، دایکی ژن خەسووە، دوای ژمارە یەم ژمارە دووە.. کە هەمووان کۆتاییان بە "وە" دێت.

لێرەدا پێویستە بڵێم، مادەم مامۆستا قزڵجی لە مادەی پێشگری "م"دا بە زۆر لایاندا قسەڕانی کردووە، دەبوو لە بارەی "وە، ەوە" ئەوەش بخاتە سەر قسەکانی کە بێژەی "ەوە" دەبێە پاشکۆی بەشێك لە پرێپۆزیشنەکان و بەدوا ئەو ناوانەدا دێت کە لەبەر ئتاوی پرێپۆزیشنەکەدان وەك:

لە هەولێرەو بۆ سنە.

بە باب و باپیریشیەوە ڕای ناکەوێ.

لەمن و تۆوە خەڵق فێربون.

لە من و تۆوەڕا خەڵق فێربوون.

پەراوێزی قسەکانی من بەدەرە چونکە "کوتك" و کافەکەی گەردان ناکرێن وەك ئەو فیعلانەی لە "حەشارگە"دا بە نموونە هاتوونەتەوە. ئەگەر گوترابایە "کوتکا، دەکوتکێ، دەتکوتکێنم، دەیکوتکاند.." ئەوسا دەمانگوت ئەم کافە کە بۆ پەیداکردنی ناوی "ئامێر"ە پاشگرێکی فیعلە.

پ-کافی "بچوك کردنەوە" کە ئەویش لە باسی ناو "حەشارگە.." بەدەرە، دەشێ پێی بگوترێ "پاشگر" چونکە گۆڕینێك لە واتای وشە بچوك کراوەکە پەیدا دەکات، بەڵام دیارە پێوەندی بە فیعلەوە نییە.

ج-نیشانەی (عهد و تعریف- لاپەڕە "130"ی گۆڤار) کە مامۆستا خستویەتیە ژێر سەرەباسی پاشگری "ك"، لە هیچ ڕویەکەوە بەر ئەو سەرەباسە ناکەوێت:

پاشگری "ك" لە وشەی وەك "کۆتك، کۆچك، کوتك، لانك.."دا بۆ هەر مەبەستێك بێت تەنها دەنگی کافە، کەچی نیشانەی "تعریف" سێ دەنگی سەرلەبەری "ەکە"یە. ئەگەر جایەز بێت "ەکە" بە پاشگری "ك" بژمێردرێت دەبێ "ۆکە"ش لە وشەی وەك "جلۆکە، مەڕۆکە، بزنۆکە.." بە پاشگری "ك" لە قەڵەم بدرێت، هەروەهاش هەموو پاشگرێکی تری دەنگی "ك"ی تێدابێت.

گوتم نیشانەی "عهد و تعریف" و نەمگوت پاشگری "عهد و تعریف"، لەمەشدا بە ئانقەست ئەم "ەکە-الف لام التعریف"ەم لە مەفهومی ناو گوتارەکە دزییەوە چونکە هەر وەك نەشیا بخرێتە ژێر عینوانی پاشگری "ك" هەروەهاش ناشێ پێی بگوترێ پاشگر: واتای پاشگر هەر ئەوە ناگەیەنێ کە لە کۆتایی وشەوە بێت. هەڵکەوتنی وشە و کەرتی وشە لە پێشەوە و لە دواوە شتێکی ڕواڵەتییە و خۆی بە تەنها نابێتە هۆی بەشداربوون لە پێکهێنانی وشەی تازەدا. پێشگر و پاشگر و ناوگر وشەی تازە دادەهێنن، واتە "تدخل" لە شیرازەی وشە دەکەن و دەبن بە کەرتێکی پێکهێنەر و واتا بەخشی وشە تازەکە. هەر بۆیەیە کە کوردەواری ناوی "عمر" دەکات بە "عومبەر" و دەنگێکی "ب" دەخاتە ناو کلێشەی وشەکەوە چ ناوگری لەوەدا بەکارنەهێناوە چونکە "عمر" و "عومبەر" یەك شتن و جواداوازییان لە نێواندا نییە: ئەم "بە"ەی ناو "عومبەر" زیادییێکی فۆنەتیکییە دەم و ڕاوێژی بەشێکی کوردەواری لەو شوێنەدا حەزی لێدەکات هەروەك "کەمەر" دەکەن بە "کەمبەر" وەیا بە مەکینەی "کسارە" دەڵێن "کەستارە" وەیا وشەی "تسویە" دەکەن بە "تەوسییە". لە وشەی "عومبەر"دا دەنگی "ب" چۆتە ناو کلێشەی وشەکەوە بەمەشدا بەشێکی ڕێگەی بڕیوە بەرەو ناوگری، بەڵام چونکە هیچ واتای نەگۆڕیوە و چ وشەی تازەی دانەهێناوە لە ناوگری دەشۆرێت و دەبێتە زیادییەکی فۆنەتیکی. هەروەهاش "کەمبەر" لەتەك "کەمەر"دا.

لە بابەتی "ەکە"ی تەعریف نیشانەی تر هەن وەك "ان"ی کۆ [پیاوان، درەختان] و پاشکۆی ناوی ئیشارەت [ئەم پیاوە- ئەم پیاوانە] کە ئەوانیش نابن بە کەرتی وشە و ناشێ پێیان بگوترێ پاشگر. بۆ ئەم تەرزە بێژانە زاراوەی "نیشانە" بەکاردێت کە مامڵەتێکی پەسەندە لەگەڵ وشە و ڕێزماندا. هەندێك زمانەوان هەن "دە"ی "دەڕۆم، دەخۆین.." و "ب"ی "بڕۆ، بخۆ.." و "نە"ی "نەڕۆی، نەخۆین.." و "مە"ی "مەڕۆن، مەخۆن.."یش بە نیشانە دادەنێن. ئەو لیژنەیەی "زمان و زانستەکانی" کە من تێیدا ئەندام و دەمڕاستم تا ئێستا لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا نەگەیشتۆتە باسی ئەو وشانەی لە زیمنی "وشەی بەستراو"دا بەر تاقمی "نیشانە" دەکەون، بەڵام هەر جارە کە پێویستی توێژینەوە ڕووبەڕووی ناوهێنانی تاك تاکەی وشەکانمان بکات زاراوەی "نیشانە"یان بۆ بەکاردەهێنین.

دەنگی "ك" لە ئاخاوتنی کوردیدا یەکێکە لە دەنگە هەرە چالاکەکان کە دەوری جۆراوجۆر دەبینن لە دروستکردنی وشە و لە پێکەوە بەستنەوەی ڕستان. مامۆستا قزڵجی لە بەشێکیان دواوە، خۆشم لێرە بە پێشەوە باسی گرنگی دەوری "ك"م کردووە، نووسەری دیکەش بە گشتی (نەك بە تایبەتی) لە نمونانەدا ئەم "ك"ەیان باس کردووە، بەڵام تێکڕای ئەو بۆچوونانە بخرێنەوە سەریەك هەر بایی سەرەتاییێکی باسەکە دەکەن. لێرەدا دوو نموونەی عەنتیکە لە بەکارهێنانی دەنگی "ك" دەخەمە بەرچاوی خوێنەر. یەکێك لەو دوانە، بەر لە ئێستا، کەوتۆتە ناو نووسینمەوە، ئەوی دیکەیان یەکەم جارە لێرەدا باس دەکرێت.

نمونە باسکراوە ناوی یاری "دایە مەمدۆڕەکێنە"یە کە لە کۆیێ و شوێنی نزیك بەو پێیی دەڵێن (دونگ لە مەڕێ-ڕەنگە "گورگ لە مەڕێ" بوو بێت و گۆڕابێت چونکە یەکێك لەو گەمەیەدا دەوری گورگ دەبینێت و خۆی لەمەڕ دەدات).دیارە وشەکە بە پێی دەستووری زمان و ڕێزمانی کوردی "دایە مەمدۆڕێنە" بووە و ناوگری "ەك" خراوەتە ناو کلێشەی پاشگری "اند" کە لە ڕێژەی فەرماندا دەبێتە "ێنە-دۆڕاندت، دەدۆڕێنیت، بدۆڕێنە". بۆیەش پێی دەڵێم ناوگری "ەك" چونکە:

1-چۆتە ناو کلێشەی بەشێکی وشەوە.

2-ناوێکی تازەی داهێناوە بۆ جۆرێك لە یاری و گەپ.

نموونە باس نەکراوەکە فیعلی "ڕاوەستەکێ"یە کە لە دەوروبەری خۆمم بە زۆری بیستووە. لەم فیعلەدا دوو ڕەفتاری بەرچاو کراوە:

1-فیعلی "ڕاوەستە" گێڕدراوەتەوە بۆ سەر بنجی خۆی کە لە بنەڕەتدا "وەستا، دەوەستێ، بوەستێ"یە.

2-ناوگری "ەك" خراوەتە نێوان دوو دەنگی کۆتایی وشەکە.

دیاره گۆڕانێکیش لەو بەکارهێنانەدا بەسەر واتای "ڕاوەستە، ڕاوەستێ"ی عادەتیدا هاتووە چونکە کە دەگوترێ "ڕاوەستەکێ" مەبەست هەر "ڕاوەستان"ی عادەتی نیە بەڵکو ئەو ڕاوەستانەیە کە وردبوونەوە و یا گلەیی کردن وەیا مەبەستێکی تایبەتی بەدوادا دێت.

لە وشەی "دایە مەمدۆڕەکێنە" بیر بۆ وشەکانی وەك "شلکێنە، نیسکێنە، زەردێنە، ماشێنە، ترخێنە، جگێنە، قرتێنە، وەردێنە.." دەڕوات، بەڵام لە ڕووی ڕێزمان و وشەسازییەوە قیاسی ئەو لەوان ناکرێ چونکە "ێنە"ی کۆتایی "مەمدۆڕێنە" شێوەی پاشگری "اند"ە لە ڕێژەی فەرماندا و پاشگرێکی لەمەڕ فیعلە، کەچی "ێنە"ی دوای وشەکانی تر پاشگری بەرەی ناوە و سەربەخۆیشە چونکە لە



شتێکی دیکەوە نەهاتووە وەك "ێنە"کەی تر کە لە "اند"ەوە هاتبوو.

د-لە بارەی "شەوەکی، بەیانەکی، ڕاستەکی، چەپەکی، لاوەکی.."یەوە:

لە گوتارەکەدا (لاپەڕە "130"، خاڵی 6-7) ئەم پاشگرەی "ەکی"ش هەر لەژێر عینوانی پاشگری "ك"دا باسکراوە. دیارە لە شکڵدا "ك" و "ەکی" هەر هێندە یەکدی دەگرنەوە کە لە هەردوویاندا دەنگی کاف هەیە، لەوە بەولاوە نە بە شکڵ و نە بە واتا و نە بە جۆری لەکارهێنان خزمایەتییان لە نێواندا پەیدا نابێ. لێرە بە پێشەوە ئەم "ەکی"یە لە لایەن لیژنەی زاراوە و زانستییەکانی سەر بە کۆڕی زانیاری کورد، کە خۆم دەمڕاستی بووم، نەختێك بە پێی پێویستی فەرمانی زاراوە دانان لێی کۆڵراوەتەوە [لاپەڕە 439- بەرگی چوارەکی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد 1976] و لە داهێنانی زاراوەدا بەکاریش هاتووە [لە نێوان لاپەڕە 442-475ی هەمان گۆڤاردا].

لەو شوێنانەدا لیژنە ئەم پاشگرەی "ەکی" بە ئەداتی نیسبەت داناوە وەك کە "ی" لە کۆتایی بەشێکی وشەی کوردیدا دەوری نیسبەت دەبینێت. ئەمەی خوارەوە سەرەتای قسەکانی لیژنەیە لە بارەی ئەم پاشگرە و بەکارهێنانی لە داڕشتنی وشە و زاراوەی تازەدا:

"لەم کارەی داهێنانی زاراوە کەوا گەلێك جار ڕێژەی نیسبەتی تێدا بەکاردێت لیژنە خۆی لە (ی) تەقلیدی دزییەوە بۆ پاشگرێکی تر کە ئەویش هەر بۆ نیسبەتە و زۆریش لە تاکە دەنگی (ی) لەبارترە بۆ هاتن لە دوای زۆربەی وشانەوە. لە کوردیدا دەگوترێ (لاوەکی، دەرەکی، ناوەکی، سەرزارەکی، شەوەکی، بەیانەکی، ڕۆژەکی، پێشەکی، پاشەکی، ڕەمەکی..) کە هەموویان ڕێژەی نیسبەتن و گونجاوتریشن لەوەی بە هۆی (ی) پێکهاتبان. ئەوەی

ڕاستی بێ پاشگری (ی) نیسبەت لە بنەڕەتدا بۆ دەربڕینی نیسبەت لەگەڵ شار و وڵات و عەشرەت و گەل و شتی ئەوتۆییدا بەکارهاتووە، ئێستا نووسەران خەریکن لەگەڵ وشەی وەهای بەکاربێنن کە هەرگیز کورد لەگەڵیاندا بەکاری نەهێناوە وەك وشەی ئاوەڵناوی عادەتی (جوان، ئازا، سوور، زەرد، تێر.. هتاد). ئەم وشانە کە پاشگری (ی)یان چووە دواوە دەبنە ئەبستراکت هەرچەند پاشگرەکە لە هەمان کاتدا بۆ نیسبەتیش بەکاردێت. لیژنە وای پەسەند کرد لە جیاتی پاشگری (ی) لەم شوێنانە و شوێنی وەك ئەواندا پاشگری "ەکی" بەکاربێنێت".

"(جوانەکی، ئازایەکی، سوورەکی، زەردەکی..) بە واتای (جمالیّ، اقدامیّ، احمریّ، اصفریّ..)، ناوە ئەبستراکتەکەشیان دەبێتە (جوانەکییەتی– الجمالیة، ئازایەکیەتی– الاقدامیة، سورەکیەتی– الاحمریة، زەردەکیەتی– الاصفریة..)" [بنواڕە لاپەڕە 439ی گۆڤارەکە، دواتریش لە لیستەی زاروەکاندا ئەو وشانە دەبینیت کە بە تازەیی پاشگری "ەکی" لەگەڵیاندا بەکارهاتووە]".

ئەم بۆچوونەی لیژنە، وا دەزانم، بۆچوونێکی ڕاست و دروستە، تەنانەت ئەگەر پێشنیارەکەشی وەر نەگیرێ لە داهێنانی وشەی تازەدا لەوەدا نیشانی پێکاوە کە دەڵی پاشگری "ەکی" بۆ نیسبەتە.

بە پێی بیروباوەڕی ناو گوتارەکەی مامۆستا قزڵجی پاشگری "ەکی" بۆ دیاریکردنی:

1–کات و زەمان [بەیان–بەیانەکی. شەو–شەوەکی]

2–لا "جهة" [لا–لاوەکی. ڕاست– ڕاستەکی. چەپ– چەپەکی].

نەختێك وردبوونەوە بە چاوی مامڵەت دەریدەخات کە پەیدابوونی واتای "کات، لا" لەم وشانەدا شتێك نییە پاشگرەکە پێکی هێنابێت چونکە ئاشکرایە واتای کات لە وشەکانی "بەیان، شەو"دایە واتای "جهە"یش لە وشەکانی "لا، ڕاست، چەپ"دایە. ئەگەر هاتبا پاشگرەکە لە وشەی وەك "بەرد، دار، ئاو، هەنجیر، کراس، چوێلەکە.." واتای "کات" وەیا "لا"ی پەیداکردبا دەمانگوت دیاەر ئەم پاشگرە بۆ داهێنانی "کات، لا" لە وشاندا بەکاردێت. فەرموو سەیری وشەی "سەرزارەکی، سێ جرتەکی، ڕەمەکی.." بکە، کوا واتای "کات، لا"؟ ڕاستی مەسەلەکە ئەوەیە کە لیژنە بۆی چووە: ئەم پاشگرە لە کوردیدا بەدوا کۆمەڵێك وشەدا هاتووە بۆ دەربڕینی واتای نیسبەت لەو وشانەدا ئیتر کاتیان تێدا بێت یا شتێکی تر، هێندە هەیە هەست بەوە دەکرێت کە وشەکان بە زۆری واتایەکی "ظرفیة" دەدەن بەڵام وەنییە پاشگری "ەکی" "ظریفة"ەکەی پەیداکردبێت. واتای "کات، لا"ش لەو وشانەدا لەوەوە دێت کە "ظرف" بە واتای تەقلیدی یا "ظرف زمان"ە یا "ظرف مکان"ە. بە پێی دەستوورەکانی ڕێزمانی کوردی چ گرفت لەوەدا نییە بگوترێ "سەرەوژێرەکی تێنیشتین".

لە بارەی خاڵی نۆیەم کە لە لاپەڕە "131" باسکراوە:

مامۆستا قزڵجی بۆئەوە چووە کە دەنگی "ك" لە فیعلەکانی وەك بزڕکان، دامرکان، نوسکانەوە، هەڵتروشکان.."دا پاشگرە و ئەو "ا"یەش کە لە دوایەوە دێت نیشانەی "مصدرية"ە وەك کە لە وشەکانی "خورا، کرا، برا.."دا نیشانەی "مصدرية"ە.

لە پێشەوە دەبێ ئەوە بڵێم فیعلەکانی "خورا، برا، کرا" ڕێژەی "مبنی للمجهول"ن کە لەوێدا پاشگری "را" هەیە نەك تەنها "ا". من لە کتێبۆلکەی "حەشارگە.."دا بە درێژی باسی ئەم پاشگرەم کردووە و نابێ لێرەدا پێیدا بێمەوە. بەڵام هەلێکم بۆ هەڵکەوتووە کە قسەیەکی خۆم لە بارەیەوە ڕاست بکەمەوە: لە سەرەتای لاپەڕە "29"ی ئەو کتێبۆلکەدا گوتوومە، لەمەوبەر هیچ کەس لە زمان شناسان باسی ئەم پاشگرەی نەکردووە کەچی دواتر کتێبی ڕێزمانی یەکێك لە پۆلەکانی قوتبخانەی ناوەندیم کەوتە بەرچاو کە لەوێدا لە نێوان پاشگرەکاندا باسی "را" کراوە. من ئەگەر زووتر ئەمەم دیتبا هەرگیز پشتگوێم نەدەخست بەڵگەشم ئەوەیە کە ئێستا لە خۆمەوە ئەو سەهوەم ڕاست دەکەمەوە. بەڵام لەو کتێبەدا لە بارەی "را"وە هەڵەیەکی بەرچاو کراوە کە دێت و دەڵێت بۆ فیعلی ئایندەی "مبنی للمجهول" پاشگری "رێ" بەکاردێت کەچی زۆر ئاشکرایە هەر پاشگری "را"ی ڕابردووە لە ئایندەدا دەبێتەوە "رێ" ئەمەش مامڵەتێکی "تصریفی"یە وەك چەندین مامڵەتی تر کە لەگەڵ فیعلی کوردیدا دەکرێت. بە نموونە دەڵێم ئەم دەنگەی "ا" لە کۆتایی سێ جۆرە فیعلدا دەبن بە "ێ" کاتێك کە ڕێژەی ئایندەیان پێدەدرێت:

| | | |
|---|---|---|
| 1–ترس | ترسام | دەترسێم |
| 2–بڕزکان | بزڕکام | دەبزڕکێم |
| 3–دیتران | دیترام | دەدیترێم |

جگە لەمانە فیعلی دیکەش هەن کە دەنگی ئەلفیان لە ئایندەدا دەبێتە "ێ" هەرچەند ئەلفەکەشان لە کۆتایی وشەکانیانەوە نایەت:

| | | |
|---|---|---|
| ڕماندن: | ڕماندم | دەڕمێنم |
| بزاوتن: | بزاوتم | دەبزێوم |
| سپاردن: | سپاردم | دەسپێرم |
| قەڵاشتن: | قەڵاشتم | دەقەڵێشم |
| پاراستن: | پاراستم | دەپارێزم |

هەموو ئەم فیعلانەش لە "تصریف"دا بە پێی دەستوور لە ڕابردووەوە بۆ ئایندە و بۆ فەرمان دەگۆڕێن، کە ئێرە جێگەی کوتانەوەی ئەم باسە بەربڵاوەی تێدا نابێتەوە.

دەگەڕێمەوە سەر گوتارەکەی مامۆستا قزڵجی.

بـەلای منـەوە لـە فیعلـی "بزڕکـان، هەڵتروشـکان، ئاڵۆزکـان، پەشـۆکان.." و هـی تـری وەك ئەوانـدا سـەرلەبەری "کـا" نـەك تـەنها دەنگـی "ك" پاشـگرە. بەشـێك لـەو فیعلانـە هەڵـدەگرن تـەنها "ا"یـان بەدوادا بێت وەك "ئاڵۆز– ئاڵۆزا– ئاڵۆزکا" کـە ئەمـە ڕاستییەکە زۆر بـە ڕوونـی و ئاشـکرایی بەڵگـەی ئـەوە بـە دەسـتەوە دەدات کـەوا جارێکیـان پاشـگری "ا" فیعلەکـەی دروسـتکردووە جارێکیشـیان پاشگری "کا". بۆ ڕەواندنەوەی ئەو بۆچوونەی کە دەشڵێ ئەلفی ئەو فیعلانە نیشانەی "مصدرية"ن بەڵگەی زۆر بەهێز هەن:

1–وشـەی وەك "تـرس، نـەخش، قـەڵش، سوور، خـول.." خۆیـان "اسم مصدر"ن و واتای تەواویان هەیە، دیارە ئەلفێکی پاشگر دێت و دەیانکاتـە فیعـل "ترسـا، نەخشـا، قەڵشـا، سـووڕا، خولایـەوە..". سـەلیقەی زمانشناسـانە پێمـان دەڵـێ دەوری پێکهێنـانی فیعلیشـی دیتـووە. ئـەم ڕاسـتییە جـارێکی تـریش لـە خـاڵی دووەمـدا دەردەکەوێتەوە.

ئـەلفی فیعلـی "ترسـا، سـووتا، ئـاڵۆزا" جـارێکی تـریش بـەوەدا مـەعلوم دەبـێ کـە بەشـێکی بنجـی فیعلەکانـە نـەك تـەنها نیشـانەی "مصدر"ە کە لە ئایندەدا بە شکڵی "ێ" دێتەوە و تێناچێت. [پێش ماوەیـەکی کـەم نموونـەم لـێ هێنانـەوە]. فیعلـی دیکـە هـەن کۆتاییەکەیان بە "ا" دێت بەڵام لە ئایندەدا تێدەچێت لەبەرئەمە دەبێ جـودایی نێـوان ئەمانـە لەگـەڵ ئـەوانی تـردا دەربخسـترێ وەك لـەم نموونانەدا ڕوون دەبێتەوە:

| | | |
|---|---|---|
| کێڵان | کێڵام | دەکێڵم |
| وێران | وێرام | دەوێرم |
| هەڵستان | هەڵستام | هەڵدەستم |
| ڕاوەستان | ڕاوەستام | ڕادەوەستم |

وشەی "هەڵستان–هەڵوەستان–ڕاوەستان" کە تێنەپەڕە ئەگەر بە واتای پەککەوتن بوویایە دەبوو بگوترێ: وەستام، دەوەستێم چونکە یـەکێك لـە تایبەتییـەکانی ئـەم فیعلانـەی کـە ئەلفەکـەی کۆتاییـان لـە ئایندەدا دەبێتـە "ێ" ئەوەیـە کە لـەو جۆرە فیعلانـەن لەچاو غـەیری خۆیانـدا بێهێـزن چـونکە فاعیلـەکانیان خوایشـت و ئیرادەیـان نییـە لەوەی ڕوودەدات هەر بۆیەش بوو من لە سالی "1973" لـە گوتاری (دەوری "ی" لـە ڕێزمـانی کـوردی)دا بـەو فیعلانـەی وەك "سـووتام، برژام، ڕمام– دەسووتێم، دەبرژێم، دەڕمێم" کە ئەلفەکەیان لە ئایندەدا دەبێتـەوە "ێ" گـوتم "فیعلـی ڕوودان– اعـال الوقـوع". لـە ڕووی هێزەوە فیعلی کوردی "3" جۆرە:

1–تێپەڕ.

2–تێنەپەڕی عادەتی.

3–تێنەپەڕی بێهێز.

ئەم بەشە بێهێزە "3" لکی لێدەبێتەوە.

1–لکی فیعلی وەك: سوان، ڕژان، برژان.

2–لکی فیعلی وەك: ئاڵۆزکان، بزڕکان، پەشۆکان.

3–لکی فیعلی "مبنی للمجهول" وەك: کوژران، دیتران، خوران.

ئەم قسانە زۆریان بە بەرەوەیە، من لێیان دەبڕمەوە.

کە دەڵێم لە "بزڕکا، پەشۆکا.."دا سەرلەبەری "کا" پاشـگرە نـەك تەنها "ك" ئەو ڕاستییەم ڕەچاو کردووە کە وشەکان بەر لـەوەی ببن بە فیعل، دەنگـی "ك"یـان لـە کۆتاییـەوە نـەهاتووە تـاکو لـە حاڵـەتی فیعلیەتیشـدا هـەر بـۆ وشـە ئەصـڵییەکەی حیسـاب بکـەین: کـەس نەیبیسـتووە گوترابـێ "بـزڕك، پەشـۆك، تروشـك.." تـاکو فیعلـەکانی "بڕزکـا، پەشـۆکا، تروشـکا.." بـە تاکـە دەنگـی "ا" بووبێتـە فیعـل. وشەی "ئاڵۆز" کە هیچ کافی تێدا نییـە، جارێکیان بە پاشگری "ا" دەبێتـە "ئاڵۆزا" جارێکیشیان بە پاشگری "کا" دەبێتـە "ئاڵۆزکا". دوو فیعلـی "تووزایـەوە، تووسکایەوە" ئـەوانیش کە لـە "تـووزە"وە وەرگیراون بە پاشگری "ا.کا" بوونەتـە فیعل". بەلای باوەڕی منـەوە ئیشکال کە هەبێ لە فیعلی وەك "داچڵەکین"دا هەیە، کە بە دوو جۆر تصریف دەکرێ بۆ ڕێژەی ئاینده:

| | | | |
|---|---|---|---|
| داچڵەکین | داچڵەکیم | دەدەچڵەکم | دادەچڵەکێم |

لـە شـێوەی یەکەمـدا ئـەو (ی)ەی دوای کافەکـە لـە ئاینـدەدا تێدەچێت "دادەچڵەکم"، لە شێوەی دووەمدا تێناچێت و هـەر دەڵێـی لـە فیعلـی "داچـڵەکان"ەوە هـاتووە ، کـە بـە پێـی دەسـتوور دەبێتـە "دادەچڵەکێم". ئەگەر بسـەلمێنین "دادەچڵەکێم" لـە "داچڵەکێم"ەوە هـاتووە، دەبـێ بسـەلمێنین کـە "ی" لـە وشـەی "داچـڵەکێن"دا بۆتـە "ی" لە "دادەچڵەکێم"دا:

| | |
|---|---|
| داچڵەکێم | دادەچڵەکێم |

کەچـی وەك دەزانـین هـەموو ئـەو فیعلانـەی لـە پـێش نـوونی چاوگیانەوە "ی" هەیە لە ئایندەدا لێیان دەقرتێت:

| | | |
|---|---|---|
| خزین | خزیم | دەخزم |
| نووسین | نووسیم | دەفڕم |

من لە نووسینی لێرە بە پێشەوەمدا گوتوومە، ئەو دەنگەی "ی" کە گەلێك جاران فیعلی لە وشەی ترەوە دروست کـردووە وەك "لـەرز، لـەرزی.." بۆیـە پێـی نـاڵێم پاشـگر چـونکە لـە ڕێـژەی ئاینـدەدا تێدەچێـت: لـەرزیم، دەلـەرزم. ئەگـەر تێنەچووبایە جێـی خـۆی بـوو بەویش گوترابایە پاشگر چونکە دیاەر بەدوا "اسم المصدر"دا هات و کردییـە فیعـل. وا دەزانم تێچـوونی دەنگەکـە بەسـە بۆئـەوەی لـە "پاشـگری" بکـەوێت، هـەروەك لـە شـوێنی تـردا گـوتم، مامۆسـتا قزڵجیش وای گوت، کە قرتـان و سوانی دەنگـی "ت" لە فیعلـەکانی کەسی دووەم و سێیەمی تاکدا وەك "دەڕۆی [لـە جیاتی دەڕۆیت]،

دەخوا [لە جیاتی دەخوات]" بەڵگەیە بۆ ڕاناو نەبوونی دەنگەکەی "ت" لەو شوێنانەدا.

-20-

لە لاپەڕە "131"، لەژێر عینوانی "ە-هاتنی ڕاناوی لکاو.."دا ماموّستا قزڵجی چەند بیروڕایەکی دەربڕیوە هەندێك تێبینی هەڵدەگرن:

أ-لە لاپەڕە بیست گوتەیەکی ماموّستا وا ڕادەگەیەنێ کە من گوتبێتم نابێ توّژینەوەی مێژوویی بکرێت بۆ دۆزینەوەی بنەمای وشەی کوردی.. ئەوەی ڕاستی بێ من لە کتێبۆلکەی "حەشارگە."دا هەر ئەوەندەم گوتووە کە دەبێ نرخاندنی وشەی کوردی لە شێوەی ئێستاکەیدا بێت نەك لە شێوەی کۆنیدا بەو مانایە کە ناشێ ئاخاوتنی ئێستاکەمان بە هی کۆنی بەر لە هەزاران ساڵ بگۆڕینەوە هەرچەند بشتوانین شێوەی ئەو کۆنە ئاخاوتنە لە هەناوی مێژوو دەرکێشینەوە. وا دەزانم لەمەدا چ گرفتێك پەیدا نابێ ماموّستا قزڵجیش هەر لەو باوەڕەدایە بەڵام وا دیارە قسەکانم ئەوەندە ڕوون نەبوون کە گومانی داخوازی مەنعکردنی توّژینەوەی مێژوویی لێ نەکرێ. بە لای منەوە ئەم جۆرە توّژینەوەیە نەك هەر ڕەوایە بەڵکو لە پێویست پێویستترە چ لە زمان بێت چ لە مێژوو بێت چ لەهەر شتێکی تری سەر بە کۆمەڵایەتی کوردەوارییەوە بێت چونکە ئێمە هیچ گۆشەیەکی بوونمان ڕووناك نییە، ڕووناکیش نابێ بە توّژینەوەی مێژووی نەبێت. من لەم لایەنەوە هێندە بە پەرۆشم تاکو جارێکیان نووسیم، ئەوەی پێوەندی زمانی ئێستاکەمان بە هی سەردەمی ئاوێستا و کۆنترەوە دەربخات دەبێ پەیکەری زێڕی بۆ دروست بکرێت و بە قارەمانی کوردایەتی بژمێررێت..

ب-لە شێوە ئاخاوتنی کرمانجی سەروودا ئەوەی لە پێش فیعلی تێپەڕەوە دێت "ڕاناوی لکاو" نییە هەروەك لە ئینگلیزیدا کە دەگوترێ:

**I came**
**He said**
**You go**

ئەم "**he, you,I**"ە ڕاناوی لکاو نین.

وەك من بۆی دەچم لە کرمانجی سەروودا لە فیعلی ڕابردووی تێنەپەڕ و لە هەموو ئایندەیەکدا ڕاناوی نەلکاو و لکاو دێن. بەڵگەی ئەم بۆچوونە، جگە لە سەلیقە، لەوەوەش دێت کە ڕاناوی "من" لە هەموو کرمانجی خوارووداا ڕاناوێکی نەلکاوە. هەروەها ڕاناوی "ئێمە، مە- ئەوان، وان- تۆ، تە- ئێوە، وە" هەموویان نەلکاون و لەیەك سەرچاوەشەوە هاتوون. لەگەڵ ئەمەشدا بۆچوونەکەی ماموّستا قزڵجی سەرنج ڕادەکێشێت لێکدانەوەش هەڵدەگرێت.

ج-پێشکەوتنی ڕاناوی لکاو لە فیعل، وەك کە ماموّستا قزڵجی نموونەکانی "نەمگرت، نەتگرت، نەمانگرت.."ی لە تاکە وێنەی نەفیەوە بۆ هێناوەتەوە دیاردەیەکە لە زمانی کوردیدا دەگەڕێتەوە بۆ طەبیعەتی ڕاناوی لکاو کە جێگۆڕکێ دەکات لە ڕستەدا. ئەم دیاردەیە هەر لە نەفیدا بەدی ناکرێت بەڵکو لە زۆر باری تردا بەرچاو دەکەوێت. ئەو فیعلە تێپەڕانەی کە پێشگریان پێوەیە هەمیشە لە ڕابردوودا ڕاناوە لکاوەکانیان دەکەوێتە پێشەوە:

هەڵمانگرت

دامکرد

وەرتانگرت

چەندێکش بەرکار دیاربێت لە ڕێژەی ڕابردوودا ڕاناوی لکاوی بەدوادا دێت و ڕاناوەکە دەکەوێتە بەرایی فیعلەکە:

گۆشتم خوارد

ماڵمان ماشت

ماستی فرۆشت

دارتان سووتاند

تا مومکین بێت ڕاناوی لکاو بە یەکەم کەرتی فیعلەکەوە دەنووسیت:

دەمکرد

نەمدەکرد

هەڵمنەدەکرد

ڕۆژێکم هەڵنەدەکرد

هەر ئەم جۆرە بزۆزییە و چالاکییەی ڕاناوی لکاو بوو وای کرد من پێشنیار بکەم پێی بگوترێ "ڕاناوی چالاك".

کەواتە پێش کەوتنەوەی "ڕاناوی چالاك" لە فیعل، بە پێی ئەو دەستوورانەی کە ئێستا شێوە ئاخاوتنی کرمانجی خواروو دەخەنە گەڕ دیاردەیەکە لەمەڕ ڕاناوی چالاك و خاسیەتەکانی.

د-وا دەزانم نموونەکانی لاپەڕە "133"ی گۆڤار کە دواتر بە نموونەی شیعری شێوەی هەورامی دەرخستراون "وێم، وێت، وێش، وێمان، وێتان، وێشان" بریتین لە ڕاناو و وشەیەکی تری بە واتای "خۆ" بەوپێیە دەبنە "خۆم، خۆت..". کە ئەمە وابێ، بەلای منەوە، وشەکان لەوە دەشۆڕێن پێیان بگوترێ "ڕاناو" چونکە وشەیەکی داڕژراو دروست دەکەن کە بە پێی واتاکەی داخوازی دەستووری لە کارهێنان دەکات. لە گوتارێکی خۆم "سووڕێکی خامە بە دەوری ڕاناودا" نەختێك بە درێژی لەم "خۆ"یە دواوم.

*    *    *

لە کۆتایی ئەم بەسەرچوونەوەیەدا هەر ئەوەندە دەڵێم، چەندێکی بە ناوی وەرامدانەوە وەیا ڕوونکردنەوەی وەیا لێنەسەلماندن خەریکی گوتارەکەی ماموّستا قزڵجی بم، نرخی گوتارەکە گەلێك

لەوەی پتر بە بەرەوە دەمێنێتەوە کە ئەو تەرزە پێوە خەریك بوونە لە منەوە یا لە یەکێکی ترەوە بە گوتارەکەوە دیاربێت.

سەرچاوە: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، بەرگی پێنجەم، 1977، ل 135-175.

# حەسەن قزڵجی و
# بیرەوەری و هەڵوێستێك بەرامبەر چیرۆكی كوردی*

ئەوە بوو دەستەی نووسەران لە ژمارەی (7)ی گۆڤارەكەماندا بڕیاری دابوو، كە هەر جارە لە بارەی پەلێك لە پەلەكانی ئەدەبەوە، چەند پرسیارێك بخاتە بەردەم نووسەرەكانمان، چ تاك تاك و چ بە كۆمەڵ.. تاكو بیرەوەری و كرد و كۆشیان لە مەیدانی ئەدەبدا تۆماربكەین و دەربارەی جوڵانەوەی ئەدەبیی ئەمڕۆمان ئاگاداری هەموو چەشنە لێكدانەوە و تێڕوانینێك بین و ڕێگەی لێكۆڵینەوە و لێدوانی هونەرەكانی ئەدەب بە هۆی گۆڤارەكەمانەوە تەخت بكەین تا بێتە كەرەستەیەكی بەكەڵك و ئەو بیرەوەرییانەش تۆماربكەین كە دەوری پێشڕەوی لە ئەدەبەكەماندا دیاری دەكەن. وا ئەمجارەش دیسانەوە دەربارەی چیرۆكی كوردی ئەم وتارە بڵاو دەكەینەوە، كە بریتییە لە وەڵامی مامۆستای چیرۆكنووس حەسەن قزڵجەیی دەربارەی ئەو پرسیارانەی كە گۆڤارەكەمان ئاراستەی كردبوو سوپاسی هەستی خاوێن و بەرزی مامۆستاش ئەكەین.

**نووسەری كورد**

### نامەكەی مامۆستا حەسەن قزڵجی

برایانی بەڕێز، دەستەی نووسەرانی گۆڤاری "نووسەری كورد" دووای ڕۆژباش و سڵاوی گەرموگوڕ.

نامەكەتانم لە كاتێكدا پێگەیشت كە نەخۆش بووم و لەناو جێوباندا كەوتبووم. پرسیارەكانتان تەواوی بیرەوەری ڕابوردوومی هێناوە بەرچاوم. بە تایبەتی بیرەوەری ئەو سەردەمەی كە وەكو شاعیری عەرەب دەڵێ:

وكنا باجتماع كالثريا    فصيرنا الزمان بنات نعش

ئەو ڕۆژگارانەی كە لەناو خزمەكان و كەسوكارمدا دەژیام و دەمخوێند و ئەدەبی عەرەبی و فارسی فێردەبووم، وە ئێستا یەكدویەكیان نەبێ هەموویان لە ژێر خاكدان. ئەو زەمانەم بۆیە وەبیركەوتەوە، چونكە پێوەندی بە یەكێ لە پرسیارەكانەوە هەیە.

لەگەڵ سڵاو و ڕۆژباشی گەرم، وە ڕێزی زۆر و زەوەند، سەركەوتنتان لە وەپێشخستنی ئەدەبی كوردیدا بە ئاوات دەخوازم.

**براتان- حسن قزڵجی**

پرسیاری یەكەم:

"لە بارەی سەرەتای نووسینی كورتە چیرۆك لە ئەدەبی كوردیدا یادگارتان چییە، وە ئەوەی پاڵی پێوەنان بۆئەوە سەر بەم دەرگایەدا بكەن، وە ئەو چیرۆكانەش هەوەڵ جار دەتخوێندەوە و چێژت لێ ئەدین كامانەن؟!".

ئەم پرسیارە لە سێ بەش پێكهاتووە:

1–لە بارەی سەرەتای نووسینی كورتەچیرۆك لە ئەدەبی كوردیدا.

2–ئەوەی پاڵی پێوەنام سەر بكەم بەم دەرگەیەدا.

3–ئەو چیرۆكانەی هەوەڵ جار دەمخوێندنەوە.

بەشی دووەمی پرسیارەكە لە تویێی پرسیاری سێیەمیشدا هاتووە. لەبەرئەوە ئێستا وەڵامی بەشی یەكەم و سێیەم دەدەمەوە.

بەشی یەكەم.. لەو پرسیارە لە بارەی سەرەتای نووسینی كورتەچیرۆك لە ئەدەبی كوردیدا:

نووسینی كورتەچیرۆك كە بە هێندێ لە زمانەكانی ئۆروپایی "نۆڤیلێ– novella" و "وە بە ڕووسی ڕاسكاز– Pacckaz"ی پێ دەڵێن بە مانای ڕاستەقینەی وشە و لە سەدا سەد، لە زمانەكانی دیكەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، یانی عەرەبی و فارسی و توركیشدا. لە مێژ نییە، وە مێژووی ئەوە مەگەر تاك و تەراك، ئەگینا لە شەڕی هەوەڵی جیهانی كۆنتر نییە، چونكە كورتەچیرۆك بەو مانا تایبەتییەی كە هەیەتی لەناو ئەواندا باو نەبووە، وە لە ئەدەبی ئۆروپایی وەرگیراوە.

نووسینی كورتەچیرۆك لەناو گەلەكانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەستەبووە بە ئاشنایەتی ئەو گەلانە لەگەڵ ئەدەبیاتی ئوروپایی، وە هەروەها بەستەش بووە، بە دامەزران و پەرەسەندنی چاپ و

چاپەمەنی لەناو ئەو گەلانەدا. هەرکامێکیان زۆرتر ئاشنایەتییان لەگەڵ ئەدەبیاتی ئوروپایی پەیدا کردووە، وە زووتر چاپ و چاپەمەنییان دامەزراندووە زووتر دەستیان کردووە بە نووسینی کورتەچیرۆك. چونکە کورتەچیرۆك وەکو شیعر نییە چەند دێڕێك بێت و لەبەر کرێ یان خێرا بنووسرێتەوە. کورتە چیرۆك یان لە ڕۆژنامە و گۆڤارا چاپ دەکرێ یان کۆدەکرێتەوە و بە جیاوازی دەکرێ بە کتێب. جا لەبەرئەمە چاپەمەنی، بە تایبەتی گۆڤار لە پەرەسەندنی کورتەچیرۆکدا تەئسیرێکی گەورەی هەیە. یا بە جۆرێکی تر بڵێین ئەدەبی هەرگەل و میللەتێك دەبێ بگاتە پلەیەکی تایبەتی لە پێگەیشتن و بەخۆداهاتندا تا نووسینی چیرۆك و کورتەچیرۆك لە ناویدا ببێتە باو.

لە کوردستان، ئەو حکومەتانەی کە فەرمانڕەوایی بەسەردا دەکەن نەیانهێشتووە چاپ دامەزرێت و چاپەمەنی کوردی ببێ، چاپەمەنی کوردی کە ماوەیەکی کەم لە سەردەمی عوسمانیدا، وە هەروەها پاش ڕووخانی ڕژێمی عوسمانی ماوەیەکی کەمیش لە سووریە هەبوو زۆر تەنگەبەر و شپرزە و کەم تەمەن بووە. لەبەرئەوە نەیپەرژاوەتە سەر ئەم جۆرە کارانە لە عێراقی سەردەمی پادشایەتیدا کە ئیجازەی چاپەمەنی ئەدەبی کوردی دەدرا، چاپەمەنییەکە تووشی ئەوەندە کەندوکۆسپ دەهات نەیدەتوانی ماوەیەکی درێژ بژی، جێی خۆی بگرێ و وە دەرفەتی خزمەتکردنی ئەدەبی کوردی ببێ. هی هەرە تەمەن درێژیان ڕۆژنامەی حەوتەیی "ژین" وە گۆڤاری مانگانەی "گەلاوێژ" بوو.

ڕۆژنامەی "ژین" لە دوو پەڕەی بچووکدا چاپ دەکرا، بەشی زۆری بە ئاگاداری و شتی وا پڕ دەکراوە، "پیرەمێرد" پیر و تەنیابالْ بوو، کەمتر دەیپەرژا سەر کورتەچیرۆك، لە ڕاستیدا زۆر کەمیش یارمەتی دەدرا. بەڵام گۆڤاری گەلاوێژ مەیدانێکی فراوان و هەراوی هەبوو، وە خزمەتێکی باشی ئەدەبی کوردی، بە تایبەتی کورتەچیرۆکی کرد. ئەم گۆڤارە زیاتر ئاوڕی لە کورتەچیرۆکی وەرگەڕاو دەداوە. وە کارێکی زۆریش بەجێ بوو. کورتە چیرۆکی وای وەردەگێڕا کە بۆ چاوکردنەوەی لاوەکانی ئەوسا بەکەڵك بوو. وە بە ناوی ئەوە کە وەرگەڕاوەیە خۆی لە گێچەڵی حکومەت لادەدا. کاك برایم ئەحمەد خۆشی کورتەچیرۆکی تێدا دەنووسی، وە هی نووسەرانی دیکەشی چاپ دەکرد. ئەمە بووە هۆی ئەوە کە ئەو نووسەرانەی لە وزەیاندا بوو کورتەچیرۆك بنووسن دەست بکەن بە نووسین بەم پێیە دەتوانین ساڵی 1939 کە ساڵی دەستپێکردنی بڵاوبوونەوەی گۆڤاری گەلاوێژە بە سەرەتای نووسینی کورتەچیرۆك دابنێین لە کوردیدا. ئەمە وەکو بزووتنەوە لەم ڕستە ئەدەبییەدا. ئەگینا پێش ئەوەش بە چەشنی تاك و تەراك کورتەچیرۆك نووسراوە. بەڵام وەکو بزووتنەوەیەك ناژمێردرێ.

بە داخەوە، هیچ ژمارەیەکی گۆڤاری گەلاوێژ یا چاپەمەنی دیکەی ئەو سەردەمەم بەلاوە نییە. لەبەرئەوە بە چەشنی گشتی ڕێبواری لەم باسە دوام. ئەگەر کەسێك بیەوێ وردتر و قووڵتر باسەکە ڕوونکاتەوە دەتوانێ ژمارەکانی گەلاوێژ و ڕۆژنامەی ژین و هی دیکە بپشکنێ وە چەندایەتی و چلۆنایەتی ڕەوتی نووسینی کورتەچیرۆك لەوسادا ڕوونکاتەوە.

بەشی دووەم.. لە پرسیاری هەوەڵ "ئەو چیرۆکانەی هەوەڵجار دەمخوێندەوە؟".

کۆمەڵە چیرۆکەکەی کە (منفلوطی)ی میسری کردبوونی بە عەرەبی. چیرۆکێك بە ناوی (ئینسان)، چیرۆکێك بە ناوی (روزاموند)، تارتوف، گەلێ لەو چیرۆکانەی کە ئەوسا لە گۆڤاری (الهلال)ی میسریدا چاپ دەکران، گەلێ لە چیرۆکەکانی ماکسیم گورکی، چیخۆف، ئەلکساندر دوما، ڤیکتۆر هۆگۆ وە هی دیکە.

پرسیاری دووەم: ئاگاداریت بەسەر چیرۆکنووسەکانی هاوتەمەن و هاچەرختدا، وە ناوی بەرهەمەکانیان و ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانەی تێیاندا بڵاوکراونەتەوە؟".

کورتەچیرۆکەکانی کاك برایم ئەحمەد کە لە گۆڤاری گەلاوێژدا چاپکرابوون، لە دواییدا بە ناوی (کوێرەوەری) بە جیاوازیش چاپ کران. کۆمەڵە چیرۆکێکی کاك شاکر فەتاح کە بە ناوی "شەبەنگە بەڕۆژ" چاپ کرابوو، چیرۆکێکی ا. ب. هەوری بە ناوی "دڵداری و پەیمانپەروەری" کە وەکو نامیلکەیەك چاپ کرابوو، هێندێ لە چیرۆکەکانی شێخ مارفی بەرزنجی کە لە گۆڤاری "هیوا"دا چاپ کرابوون، هێندێ چیرۆکی (مەم)یش کە هەر لەو گۆڤارەدا چاپ کرابوون و هی دیکە.

پرسیاری سێیەم: "چیرۆکنووسین لای ئێوە هەر ئەنجامی بەهرە، یا خولیایەکی ئەدەبی بوو، یان بارێکی تایبەتی، چ کۆمەڵایەتی، چ ڕۆشنبیری، چ بیروباوەڕ وایکرد ئەوەی لە دڵتان دایە بە چیرۆك دایڕێژن؟".

وەکو لە سەرەتای ئەم نامەیەدا ئیشارەکم کرد، لە تەمەنی بیست ساڵیدا بووم، لەگەڵ ئامۆزایەکم کە بە داخەوە لەم ساڵانەدا لە کرماشان لە دنیا دەرچوو، لەلای مامێکمان (مەلا ئەحمەدی تورجانی زادە) لە مەهاباد دەمانخوێند. تۆرجانی زادە بۆ پێخوێندنی ئێمە میتۆد و شێوەیەکی تایبەتی بەکاردەهێنا. ڕێزمانی عەرەبی (نحو–صرف)ی فێردەکردین، دوای فێرکردنی هێندێ (قاعدە) یەکێ لە چیرۆکەکانیمەنفەلووتی پیشان دەدایین. دەبوو لەو چیرۆکەدا دیاری بکەین کە ئەو قاعدانە چۆن بەکارهێنراون. لە پاشان دەبوو تەواوی چیرۆکەکە بگێڕینەوە و ڕوونی کەینەوە مەبەستی نووسەر لە نووسینی ئەو چیرۆکە چ بووە. ئەگەر بمانزانیایە ئافەرینی دەکردین، ئەگەر نەمانزانیایە خۆی ئەو مەبەستەی بە درێژی بۆ ڕووندەکردینەوە و تێی دەگەیاندین. تۆرجانی زادە بایەخێکی زۆری

بە چیرۆك دەدا، خۆشی لە کتێب و گۆڤاراندا چیرۆکی بخوێندایەوە گەلێ جار بۆمانی دەگێڕایەوە و بە درێژی لێی دەکۆڵییەوە. ئەمە بووە هۆی ئەوە کە هەر لەو وەختەوە حەز لە چیرۆك بکەم. ماوەی چەند ساڵێکیش لە تاوی پۆلیسی ئەوسا لە "بازیان" خەریکی تووتنکردن بووم و لەناو وەرزێرەکاندا دەژیام، دەمدی کە وەرزێرەکان گەلێ نەقڵ و حیکایەتیان دەزانی وە زۆر بەتام و لەزەت بۆ یەکتریان دەگێڕاوە. لەمەش بۆم دەرکەوت کە چیرۆك لەناو کۆمەڵانی ڕەنجدەر و زەحمەتکێشی کورددا تەئسیرێکی زۆری هەیە. بەڵام ئەمە بەو شەرتە کە چیرۆك یان هەر بەرهەمێکی دیکەی ئەدەبی باری گەلایەتی ببێ.

بەرهەمی ئەدەبی کاتێ دەتوانێ ئەم خاسیەتەی ببێ کە لەو مەسەلە گرنگانەی تووشی کۆمەڵانی خەڵك هاتوون و، لە دیاردە گرنگەکانی ژیانی ئەوان بدوێ، وە لە ڕوانگەی سوود و مەسڵەحەتی کۆمەڵانی خەڵکەوە لەو مەسەلە و دیاردانە بکۆڵێتەوە.

خاسیەتی گەلایەتی داوا لە نووسەر دەکات کە نووسینەکەی سادە بێ، دەم و کاوێژی ڕەوان بێ، مەبەستەکان بە ڕۆشنی بخاتە بەرچاوان تا کۆمەڵانی خەڵك بە ئاسانی تێی بگەن.

ئەمانەش بوونە هۆی ئەوە لە کورتەچیرۆك، وەکو هۆیەك بۆ دەربڕینی ئەوەی کە لە دڵمدایە کەڵك وەرگرم.

ئەما ئەوەی کە لە دڵم دایە:

ژیان و موتالاّ و تەجروبە تێی گەیاندم هەر خوێندەوارێك کە پێدەنێتە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە پێویستە بۆ جاری دووەم بێتە دنیاوە. ئەم، وەکو ئەو کەسانەی کە بۆیان نەلواوە بخوێنن و پەروەردە ببن لێی قبووڵ ناکرێ بە لەدایکبوونی هەوەڵ جار بەسی بکات، بە چاوبەستراوی بە هەوراز و نشێوی ژیاندا بڕوات، وە بە چەشنی تەبیعی سەرەتایی لە دەرگای لانکە و بێشکەوە بێتە دنیاوە و لە دەرگای گۆڕەوە بۆی دەرچێ.

خوێندەوار کە جاری هەوەڵ بە دەست خۆی نەبووە، هاتووەتە دنیاوە جاری دووەم بەدەست خۆیەتی.

پێشینان گوتوویانە: "بزن بۆ شەوێك جێگای خۆی خۆش دەکات" خوێندەوار کە ئینسانیشە و خوێندووشیەتی دەبێ ئەو شوێنەی کە سەدان و هەزاران باوك و باپیران بۆیان بەجێهێشتووە، وە لەمەش دووا سەدان و هەزاران نەوە و تیرەشی لەوێدا دەژین خۆش بوێت، وە بۆ ئاوەدانی و بوژانەوەی ئەوی تیبکۆشێ. خوێندەوار دەبێ سەرنجی ئەوە بدات کە لە کام گەل و کۆمەڵە هەر بەو جۆرە کە خەرمان لە تەواوی دەنکە دەنکەی گەنمەکان پێکدێ گەل و کۆمەڵەکەی ئەویش لە یەکە یەکەی ئەو کەسانە پێکهاتووە، وە هەرکامێکیشیان لەبەرئەوە کە یەکێکە لەو گەل و کۆمەڵە ئەرکێکی زۆری دەکەوێتە سەرشان، کە ئەرکی هەرە گەورەیان ئەوەیە بۆ ئازادی و خێر و خۆشی و بەخۆداهاتن و پێگەیشتنی گەل و کۆمەڵ کاربکات.

خوێندەوار دەبێ بە وردی ڕوونیکاتەوە کە کامانەن لە تەواوی گەل و کۆمەڵەکەی زوڵم دەکەن: چ زوڵمی نەتەوایەتی، چ زوڵمی ئابووری، وە چ زوڵمی ئەدەبی و زانیاری. وە کامانەن لەو زاڵمانە پشتیوانی دەکەن مەسەلەن وەکو ڕژێمی ئێران و ئیمپریالیستەکانی پشتیوانی ئەو ڕژێمە. وە لە دژی تەواوی ئەوانە خەبات بکات.

هەروەها خوێندەوار پێویستە بڕوانێتە خودی کۆمەڵیش و بزانێ لە چ جۆرە چینێك پێکهاتووە. ئەو چینانەی ڕزیو و داوەشاون و بوونەتە بەرهەڵەستی پێشکەوتن و پێگەیشتنی کۆمەڵ وە مێژوو فەرمانی فەوتانی داون کامانەن، وە ئەو چینانەش کە خەریکی



بووژانەوەن و بەرەو پێگەیشتن دەڕۆن و دوواڕۆژی ڕووناك و ژیانی خۆشتر و باشتری گەل بەدەست ئەوان دەکرێ کامانەن وە دۆستان و پشتیوانانی ئەم چینانە کێن. لەگەڵ ئەم چینانە و دۆستانی ئەوان بێت و خزمەتی ئەوان بکات، وە بۆ ئەوەی خێراتر ببووژێنەوە هەوڵ بدات. لەم جۆرە سەرنجدان و وردبوونەوەیە تێگەیشتم ئەو حکومەتە کۆنەپەرست و زاڵمانەی حوکمڕانی بەسەر پارچەکانی کوردستاندا دەکەن دوژمنی کوردن. ئیمریالیزم پشتیوانی ئەوانە. خەبات لە دژی ئەوان و پشتیوانەکانیان ئەرکی سەرشانی هەموو خوێندەوارێکی کوردە. تێگەیشتم کە چینی دەرەبەگ و ڕیسەندۆڵی ئەو ڕزیو و داوەشاوە، بەرهەڵستی بووژانەوە و بەخۆداهاتنی کۆمەڵە. وە پێویستە بە هەموو تواناوە لە دژی ئەم چینە خەبات بکرێ. چینی خەریك بووژانەوە و ڕوو لە پێشکەوتن چینی کارگەر و وەرزێر و توێژی ڕووناکبیری پێشکەوتخواز و زەحمەتکێشەکانی دیکەیە، وە دۆستان و پشتیوانی ئەوان هێزە پێشکەوتووەکانن. خوێندەواری کورد دەبێ لەگەڵ ئەم چینانە بێت و شان بە شانی ئەوان و بۆ خێر و خۆشی گەل و بۆ ئازادی و ئاوەدانی نیشتمان تێبکۆشێ.

لە نەتیجەی ئەم سەرنجدان و وردبوونەوەیەدا ویستوومە بۆ خەبات لە دژی چینەکانی کۆنەپەرست و داوەشاو، وە بۆ خزمەتکردنی چینەکانی خەریك بووژانەوە و بەخۆداهاتوو بە پێی توانام لە کورتەچیرۆك کەڵك وەرگرم، وە ئەرکی سەرشانم ئەوەندەی لە وزەمدا بێ بەجێ بگەیەنم.

پرسیاری چوارەم "بە ڕوانینێکی ڕەخنەگرانە و، لە باری مێژووی ئەدەبەوە، بەلای ئێوەوە چیرۆکی کوردی بە چەند دەور یان قۆناغدا تێپەڕیوە، چ لە بارەی شێوە و چ لە بارەی ناوەڕۆکدا؟".

1–لێرەدا دوو ئەرك بە من سپێردراوە: یەکەم، لە باری ڕەخنەی ئەدەبییەوە، دووەم لە باری مێژوویی ئەدەبەوە. لە چیرۆکی کوردی بدوێم کە بە چەند وارگەدا تێپەڕیوە.

ئاشکرایە کە ئێمە نامانەوێ لە ڕوانگەی ڕەخنەی ئەدەبی بورژوازییەوە بڕوانینە شوێنەواری ئەدەبیمان. چونکە لە ڕەخنەی ئەدەبی بورژوازیدا بیروڕا و سوودی چینەکانی فەرمانڕەوا بایەخیان پێدەدرێ و دەخرێنە بەرچاو. لەبەرئەوە، ڕەخنەی بورژوازی بە زانستە و بە ئەنقەستە لەو ئەسەرە ئەدەبییەی کە نیشاندەری بیروڕای پێشکەوتووە، وە چینی کارگەر و ڕەنجدەر وریادەکاتەوە و هەستی نەتەوایەتی ڕەوای گەلە غەدرلێکراوەکان دەبزوێنێ –بە نادروستی دەکۆڵێتەوە. ڕەخنەی بورژوازی ئەسەری کۆنەپەرستی دەخاتەبرەو. یانی ئەو ئەسەرانە بە باش و بەنرخ دەزانێ کە لەواندا نابەرامبەری ئینسانەکان و دەستەڵاتی زۆردار و دەوڵەمەندەکان وەکش و ماتی گەلە ژێردەستەکان، بە پێویست و گرنگ زانراوە یان ئەسەری ئەدەبی بێ ناوەڕۆکی وا کە خوێنەر لە تێگەیشتنی هۆ و سەبەبەکانی بێعەدالەتی کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی هەڵدەکا وە لە خەبات بۆ پێکهێنانی نیزامی ڕەوای کۆمەڵایەتی دەیگێڕێتەوە.

2–لە باری مێژووی ئەدەبیشەوە، ئەگەر مەبەست ئەوە بێ کە مێژووی ئەدەبی بە ناوبانگی یەکێ لە گەلەکانی ئوروپا بکەینە ئەیارە و پێوانە بۆ سەرنجدانی ڕەوت و تێپەڕبوونی چیرۆکی کوردی بە وارگە و قۆناغەکانیدا لەو بڕوایەدام کە ئەمەش سەرناگرێ، وە تەواوی ئەو زاراوانەش وەکو: کەلاسیسم، ڕومانتیسم، سیمبولیسم و هی دیکە، غەیری ڕەئیالیسمی ڕەخنەگری کە بەکاردەهێندرێن، هیچیان نەك تەنیا لەگەڵ ئەدەبی کوردی، بەڵکو لەگەڵ ئەدەبی فارسی و عەرەبی و شتی واش ڕێك نەکەوێ، وە بەکارهێنانی ئەوانەیان بە چەشنی "مجازی"یە، یا بە ئیعتباری کەرتێك لە ماناکەیانە، یا بە مانای "لغوی" وشەکانە. چونکە مەسەلەن لە فەرانسە نزیکەی دوو سەد ساڵ لەمەوپێش شۆڕشی بورژوائی کراوە نیزامی دەرەبەگی و فیئودالی ڕووخێنراوە، ئەوسا نیزامی بورژوائی پێشکەوتوو بووە، پاشان پێشکەوتوویی لە کیس چووە، پاشان بۆتە نیزامی ئیستعماری وە ئاخرەکەی بۆتە نیزامی ئیمپریالستی.

ژێربینای ئابووری کۆمەڵی فەرانسە لەهەر سەردەمێك لەو سەردەمانەدا جۆرە سەربینایەکی ئەدەبی خواستووە کە هەرکامێکیان ناوێکی تایبەتی هەیە. بەڵام ئەدەبی کوردی و ئەم گەلانەی دیکە کە ئێستاش هێندێکیان لە نیزامی دەرەبەگیدا دەژین و، هێندێکیشیان تازە خەریکن لەو نیزامە ڕزگاریان بێ بەو وارگە و قۆناغانەدا تێنەپەڕیوە تا –بە تەواوی مانا وەبەر ئەو وشانە بکەوێ.

لێرەدا دەمەوێ داوای لێبوردن بکەم و، بە ڕێبواری و زۆر بە کورتی لە ڕەخنەی ئەدەبی و مێژووی ئەدەب بە چەشنی نوێ و عیلمی بدوێم:

1–ڕەخنەی ئەدەبی:

بریتییە لەو ئەسەر و وتار و نووسراوانەی کە لە ڕوانگەی سوود و مەسڵەحەتی ژیانی کۆمەڵایەتی وەخت و زەمانەوە لە ئەسەری ئەدەبی دەکۆڵنەوە و لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی مەسەلەکانی ئەم سەردەمە نرخی بۆ دادەنێن. ئەم ڕەخنەیە ڕوون دەکاتەوە کە ئەسەرە ئەدەبییەکە تا چ ڕادەیەك کۆمەکی چارەکردنی مەسەلە ژیانییەکانی گەل دەکا. ئەم ڕەخنەیە پیشان دەدا کە ئەو کارانەی لە ئەسەرەکەدا نوێندراون، یا ئەو دیمەنانەی لەودا لە ژیان کێشراون تا چ ڕادەیەك ڕاستەقینەن. ئەم ڕەخنەیە هەروەها نیشان دەدات کە نووسەرەکە بە بەکارهێنانی وەسائیلی هونەری توانیویەتی بگاتە ئەو ئامانجەی کە بۆ خۆی داناوە یان نا. ڕەخنەی ئەدەبی هۆیەکی کاریگەرە بۆ بەرزکردنەوەی ڕادەی کەیفییەت و چلۆنایەتی بیروڕای هونەری، وە دەبێ لەگەڵ ڕوونکردنەوەی لایەنە ئیجابییەکانی ئەسەری هونەری، کەم و کووڕییەکانیشی بە دەلیل و بەڵگەوە نیشان بدات.

2-مێژووی ئەدەب:

باسی پێگەیشتنی ئەدەب دەکا لە کاتی پەیدابوونیەوە تا ئەمڕۆ. مێژووی ئەدەب شوێنەواری خوڵقێنەری گەل و ئەشخاس دەگرێتەوە. ئەرکی بنەڕەتی ئەو ئەمەیە کە قانونییەتی مێژوویی مەوزوعی ڕەوت و جەرەیانی ئەدەب ڕوون کاتەوە. مەسەلەن لە ئەم یا ئەو ئەسەرە هونەرییە بکۆڵێتەوە، پایە و گرنگی نووسەرەکان دیاری بکا، وە گرنگی میتۆدە جۆربەجۆرەکانی ئەنواعی پێگەیشتنی ئەدەبی نیشان بدات.

ئەدەب لە هەموو جێگایەك لە پێوەندی لە پسان نەهاتوودا لەگەڵ تایبەتییەکانی ئابووری، سیاسی، کولتووری وە ئاڵوگۆڕەکانی دیکەی ژیانی گەلدا پێ دەگا.؟ وە ئا ئەمەیە کە دەبێتە هۆی ئەوەی گەلەکان و خەڵکە جیاوازەکان شوێنەواری ئەدەبی تایبەتی خۆیان بێ، وە دەبێتە هۆی ئەوە کە مێژووی ئەدەب مێژووەکانی شوێنەوارە ئەدەبییەکانی میللەتەکان جیاکاتەوە. مێژووی ئەدەب لە پێگەیشتنی ئەدەب لە وڵاتێکدا دەکوڵێتەوە، وە پێوەندی ئەو ئەدەبە و تەئسیرکردن و تەئسیر وەرگرتنی ئەو لەگەڵ ئەدەبی وڵاتانی دیکە ڕوون دەکاتەوە. مێژووی بە ڕاستی عیملی ئەدەب قانونایەتیەی جەرەیان و ڕەوتی ئەدەب و هونەر پیشان دەدا، یانی ئەو قانونایەتییەی کە لە پێوەندی ئەدەبیاتی میللی لەگەڵ پێگەیشتنی مێژووی گەل و میللەتێکی موعەین و موشەخەس هەڵدەقوڵێ- دیاری دەکا. ئەمەش لەسەر بنچینەی وەزعییەتی ئەو گەل و میللەتە دادەمەزرێ. چونکە لە تەواوی کۆمەڵەکانی چینایەتیدا پێگەیشتنی ئەدەبیاتی میللی تاقە ڕەوت و جەرەیانێك نییە. "لینین" دەنووسێ: "لە تەواوی ئەدەب و کولتوورەکانی میللیدا، دوو ئەدەب و کولتوور هەیە".

مێژووی ئەدەب لە کۆمەڵی چینایەتیدا، خەباتی چینەکانی بنەڕەتی لە دژی وەزع و، هەڵوێستگرتنی دژی وەزع لە ئەدەبدا – ڕوون دەکاتەوە. پێگەیشتنی میتۆدە جیاوازەکانی هونەری، جەرەیانەکانی ئەدەبی، وە تێپەڕبوونی مێژوویی ڕێبازە جیاوازەکانی ئەدەبی نیشان دەدات. گەلێ ئەرکی دیکەشی لە ئەستۆیە، کە لێرەدا دەرفەتی لێدووانیان نییە.

ئێستا لەژێر تیشکی ڕەخنەی ئەدەبی و، مێژووی ئەدەبدا، بە پێی ئەو پرسیارە لە بارەی کورتەچیرۆکی کوردی ئەم ئەرکانە دێنە پێشەوە:

1-لە ڕوانگەی سوود و مەسڵەحەتی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەم وەخت و زەمانەوە لە کورتە چیرۆکی کوردی بکۆڵینەوە، وە لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی گرنگترین مەسەلەکانی ئەم سەردەمە- نرخی بۆ دانێین.

2-ڕوونی کەینەوە کورتەچیرۆك تا چ ڕادەیەك کۆمەکی چارەکردنی ئەو مەسەلە ژیانییانەی گەلی کورد دەکا؟

3-ئەو ئاکارانەی لە کورتەچیرۆکدا نوێندراون. یان ئەو دیمەنانەی لەودا کێشراون و تا چ ڕادەیەك ڕاستەقینەن؟

4-نووسەرەکانی ئەو کورتە چیرۆکانە توانیویانە بە بەکارهێنانی وەسائیلی هونەری بگەنە ئەو ئامانجانەی بۆ خۆیانیان داناوە یان نا؟

5-ڕادەی چلۆنییەتی بیروڕای هونەرییان چۆنە؟

6-لایەنە ئیجابییەکانیان و کەموکوڕییەکانیان کامانەن؟

7-پێگەیشتنی کورتەچیرۆکی کوردی لە کاتی پەیدابوونییەوە تا ئەمڕۆ چۆن بووە؟

8-پایە و گرنگی نووسەرەکانی کورتەچیرۆك چۆنە؟

9-میتۆدە جۆربەجۆرەکانی کورتەچیرۆکی کوردی کامانەن؟

10-پێوەندی کورتەچیرۆکی کوردی لەگەڵ تایبەتییەکانی ئابووری، سیاسی، کولتووری وە ئاڵوگۆڕەکانی دیکەی ژیانی گەلی کورد چۆنە؟

11-کورتەچیرۆکی کوردی لە کام ئەدەبی دیکە تەئسیری وەرگرتووە، وە داخۆ تەئسیری کردۆتە ئەدەبی خەڵکی دیکە؟

12-لە کورتەچیرۆکی کوردیدا (بە ناوی ئەوە کە بەشێکە لە ئەدەبی کۆمەڵێکی چینایەتی، وە دەبێ دوو چەشنە کولتووری تێدا ببێ) دوو چەشنە کولتوورەکە کامانەن:

13-خەباتی نێوان چینە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵی کوردی، لە کورتەچیرۆکدا چۆن خۆی دەنوێنێ؟

14-هەڵوێست گرتنی دژی وەزع لە کورتەچیرۆکی کوردیدا چۆنە؟

15-جەرەیانەکانی ئەدەبی لە کورتەچیرۆکی کوردیدا؟

16-تێپەڕبوونی ڕێبازە جیاوازەکان لە کورتەچیرۆکی کوردیدا؟

ئەمانە لانی هەرە کەمی ئەو پرسیارانەن کە ڕەخنەی ئەدەبی و مێژووی ئەدەب، لە بارەی کورتەچیرۆکی کوردی دەیانهێننە پێشەوە. بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە پێویستە هیچ نەبێ بەشی هەرە زۆری کورتەچیرۆك لەبەردەستدا بێ، وە لە یەك بەیەکیان بکۆڵرێتەوە تا بتوانرێ بڕیارێکی گشتی بدرێ. هەزار حەیف و داخ من هیچی وام بەلاوە نییە! ئەگینا هەرچەند نەخۆشی و کار کەکەمتر وەختم بۆ دەهێڵنەوە، دیسان پەلەقاژەیەکم هەر دەکرد.

بەڵام لەژێر تیشکی ئەو قانونیاتییە ئەدەبییەدا کە باسمان کرد دەتوانین بڵێین:

گەلی کورد گەلێکە لە نیزامی فیئودال- بورژوائی دەژی. وە چەند چینی جۆربەجۆری تێدا هەیە: وەرزێر و دەرەبەگ وە توێژەکانی سەر بە چینی دەرەبەگ، چینی کارگەر کە تازە خەریکە سەقامگیر دەبێ، وە چینی بورژوا بە توێژەکانی سەربەخۆیەوە.

چینەکانی وەرزێر و کارگەر و بورژوا سوود و قازانجیان پێویست دەکا لە دژی دەرەبەگ خەبات بکەن. دەرەبەگیش لە دژی

ئەوان هەڵدەسووڕێ چینەکانی کارگەر و وەرزێریش مەسڵحەتیان پێویست دەکا لە دژی بورژواش تێکۆشن، ئەمیش لە دژی ئەوان هەڵدەسووڕێ.

گەلی کورد بە گشتی و بە هەموو چین و توێژەکانییەوە لە پێناوی مافی نەتەوایەتیدا تێدەکۆشێ. ئەم نەژاد و خەباتانە دەبێ هەموویان لە ئەدەبی کوردیدا (وە کورتەچیرۆکیش بەشێکە لەو) خۆیان بنوێنن.

جگە لەمانە هێندێ نووسەری بێ چین و کەمتەرخەمیش هەن کە گوێ نادەنە ژیانی کۆمەڵایەتی، وەبیریان بە ژیانی خۆیانەوە خەریکە، ئەمانیش هەستی دەروونی خۆیان (دڵداری بێ، تێشکان بێ لە ژیاندا، یا خۆشی و ناخۆشی ژیانی تاکی بێ) لە کورتەچیرۆکدا دەردەبڕن.

کۆمەڵی کورد لە حاڵی تێپەڕ بوون (انتقال)دایە، نیزامی دەرەبەگی هەڵوەشاوە چینی کارگەر زۆر پەرەی نەسەندووە، چینی بورژوا بە تەواوەتی سەقامگیر نەبووە، وە ناشتوانێ سەقامگیربێ. چونکە کشان بۆ لای سوسیالیزم زۆر بە تەوژمە., لەبەرئەوە لە کورتە چیرۆکیشدا وەکو تەواوی ئەدەبی کوردی گەلێ جۆرە بیروڕای جیاواز سەرهەڵدەدات وە هەر بەو جۆرە کە چینەکان خۆیان لە حاڵی شلکیدان، ئەمیش هێشتا شلکە، تەبیعییە ئەمەی کە دەیڵێین بە چەشنی گشتییە، ئەگینا ئەگەر قسە لە تاك تاکی کورتەچیرۆکەکان بێ. هی پێگەیشتوویان زۆر تێدا هەیە.

نووسەرەکانیش بە پێی وەزعی چینایەتی و ژیان و وریایی سیاسی خۆیان لە تەزادەکان و خەباتەکانی نێوان ئەو چینانە تەئسیر وەردەگرن، وە ئەم تەئسیرە لە چیرۆکەکانی ئەواندا بە جۆرێك لە جۆران خۆی دەنوێنێ. ئەو خەباتانەی خۆیان لە چیرۆکدا دەنوێنن زۆربەیان پێشکەوتووانەن. خەباتی گەل بە گشتی لە پێناوی مافە ڕەواکانی نەتەوایەتیدا، خەباتی وەرزێر و کارگە و بۆرژوا لە دچی دەربەگایەتی وە خەباتی کارگەر و وەرزێر لە دژی بورژوازی. لەبەرئەمە کورتە چیرۆکەکانیش زۆربەیان لە باری ناوەڕۆکەوە پێشکەوتووانەن.

لە باری شێوەوە:

ڕاستەکەی ئەوەیە نەمتوانی بە وردی بزانم مەبەست لە شێوە چییە. وە لە جیاتی کام زاراوەی ئەدەبی بەکارهێنراوە. داخۆ مەبەست لە شێوە (ستیل)ە، (کومپوزیسیون)ە، فورمە، یان زمانی هونەرییە؟ بەهەر جۆر با وای دانێین کە بە مانای قاڵبی داڕشتنی چیرۆك بێ.

ئێستا ئەگەر بگەڕێینەوە سەر وەڵامی پرسیارەکە، کە "کورتە چیرۆکی کوردی لە باری شێوە و ناوەڕۆکەوە بە چەند دەورا تێپەڕیوە؟ لام وایە دەتوانین بە چەشنی گشتی" بڵێین:

1–لە وارگەی (زەو–تولد) تێپەڕیوە.

2–لە دەوری کاڵ و کرچی و ساوایی تێپەڕیوە و گەیشتۆتە وارگەی لاوێنی.

3–لە وارگەی بێ ئامانجی و نووسین بۆ نووسین تێپەڕیوە و گەیشتۆتە وارگەی ئامانجداری.

4–لە باری (شێوە– قاڵبی داڕشتنەوە) لە شێوەی نەقڵ و حیکایەت تێپەڕیوە و کەوتۆتە قاڵبی تازەوە.

5–لە یاریکردن بە وشەش، زۆربەیان ڕزگاریان بووە.

پرسیاری پێنجەم: ئەمڕۆ چیرۆکی تازەی کوردی چۆن دەبینین؟

لام وایە وەڵامی پرسیاری چوارەم، وەڵامی ئەم پرسیارەشی تێدابوو.

بەڵام دەتوانین شتێکی لێ زیادکەین و بڵێین:

کورتەچیرۆکی کوردی لەگەڵ ئەوە کە لە توێی تێکڕای ئەدەبی کوردیدا خنکێنراوە تاقە چەند ساڵێکە دەرەتانی خۆنواندنی هەیە لە چاو کورتەچیرۆکی فارسی و عەرەبی کە ئەو هەموو دەرەتانە بێ سنوورە یان هەبووە و هەشیانە، بەش بە حاڵی خۆی زۆر لە دووا نییە. ئەمەی کە دەیڵێین دیارە لە باری کەیفییەت و چلۆنایەتییەوەیە، نەك لە باری کەمییەت و چەندایەتییەوە.

کورتەچیرۆکی کوردی دوواڕۆژێکی ڕوناکی بۆ چاوەڕوانی دەکرێ، وە هیواداری ئەوەی لێ دەکرێ کە بە خێرایی پێ بگات. بەڵام ئەمڕۆ لەگەڵ ئەوەش کە کورتە چیرۆکی باشمان هەیە، کورتە چیرۆکی واشمان زۆرە کە بە سەنگ و تەرازووی تەیئووری ئەدەبی نایەتەوە، هی واشمان کەم نییە کە فورمالیسم و سیمبولیسم و شتی وا وەبیر دەخەنەوە. دەردی ئەمانە هیچیان زۆر گران نییە، بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار هەموو شتێك جێگای خۆی دەگرێتەوە. بەڵام دەردی زمانی گەلێ لە کورتە چیرۆکەکان زۆر گرانە. لە ڕاستیدا زمانی گەلێ لەو چیرۆکانە کەمتر لە زمانی عادەتی کوردی دەچێ، دەڵێی کەسێکی بێگانە، کە تەواو کوردی فێرنەبووبێ نووسیونی. ئەم دەردە دەردێکی زۆر گرانە ئەگەر بێت و چارەی نەکرێ، وە هەروا بڕوات لەوانەیە زمانەکە بشێوێنێ. یان بە لانی کەمەوە ڕەنجی ئەو نووسەرانە بە فیڕۆ دەڕوات و کەس نووسراوەکانیان ناخوێنێتەوە.

لە کۆتاییدا پێویستە بڵێم لەبەرئەوە کە دەستم ناگاتە کورتەچیرۆکەکان نەمتوانی بۆ هەر مەبەستێك لەو مەبەستانەی باسم کردن نموونە پیشان بدەم. ئەگەر چیرۆکی زۆریشم بەلاوە بوایە دیسان لێرەدا مەیدانی ئەو هەر نەدەبوو. چونکە باسەکە پتر لەوەی کە دەرفەت هەیە درێژ دەبووەوە.

سەرچاوە: گۆڤاری "نووسەری کورد"، بەغدا، ژ 10، ئەیلوولی 1973.

# بەرهەمێکی بڵاونەکراوەی چیرۆکنووسی شەهیدی کورد حەسەن قزڵجی*

محەمەدی مەلا کەریم

بنووس و چیرۆکنووسی کورد شەهید حەسەن قزڵجی، لە ساڵانی چلەوە تا دوا چرکەی ژیانی بە دڵ و بە گیان بەوپەڕی لێبووردییەوە بۆ خێر و خۆشیی میللەتی کورد و بۆ برایەتی ڕاستەقینەی گەلان تێکۆشاوە. لە سەردەمی کۆماری جوانەمەرگی مەهابادا یەکێك بووە لە ڕۆژنامەنووسە بەتوانا و چالاکەکانی. پاش ڕووخاندنی کۆماری ناوبراو پەنای هێناوەتە کوردستانی عێراق و تا پاش گیرانی یەکەمجاری شێخ لەتیفی حەفید لە دیوەخانی ئەوا میوان بووە و ماوەیەکیش لە یەکێ لە گوندەکانی بازیان جووتیاری کردووە، لە سەرەتای ساڵانی پەنجاکاندا هاتووەتە بەغدا و لەوێ کاری کردووە و ژیاوە. لە ساڵی 1953دا پۆلیسی چەرخی پاشایەتی لە بەغدا لەگەڵ زەبیحی گرتویەتی و داویەتەوە دەست پۆلیسی ڕژێمی شای ئێرانەوە. لە کرماشان بە هۆی کاربەدەستێکی گەورەی خزمییەوە دەرفەتی ئەوەی بۆ ئەڕەخسێ لەدەست پۆلیسی شا ڕزگاری ببێ و لە ڕێگای سنە و هەورامانەوە بگەڕێتەوە بۆ کوردستانی عێراق و تا شۆڕشی 14ی تەمووز لە هەڵەبجە ماوەتەوە، پاشان هاتووەتە بەغدا و لای مام هەژاری شاعیری گەورەی کورد لە ستۆدیۆکەیا لە شەقامی (الکفاح) بە وێنەگرییەوە خەریك بووە. لە 1961دا ڕژێمی قاسم ویستوویە بیداتەوە دەست ئێران، بەڵام بە هۆی هەندێ پیاوی چاکەوە توانراوە کارێك بکرێ بەوەندە دەستی لێهەڵگرن کە خۆی عێراق بەجێبێڵێ و مافی پەنابەریی لە بولگاریا بۆ وەرگیراوە و چووەتە سۆفیا و ئیتر تا پاش ڕووخانی ڕژێمی شا لەوێ ژیاوە. لە 1979دا گەڕاوەتەوە نیشتمان و ماوەیەك لە بۆکان زێدی خۆی و باوباپیری ژیاوە و ئەنجا چووەتە تاران و لەوێ وەك ڕۆژنامەنووسێکی پێشکەوتنخوازی کورد کاری کردووە و ڕۆژنامەی هەفتانەی (مەردوم)ی کوردیی بەڕێوەبردووە. دوای پەردە لە ڕوو هەڵماڵرانی یەکجاری ڕژێمی ئێران کەوتووەتە بەر شاڵاوی دامودەزگای ئاخوندە کۆنەپەرستەکان و پاش ئازار و سزادانێکی سەختی دڕندانە، لە یەکێ لە سیاچاڵەکانی تارانا گیانی پاکی لە ساڵی 1985دا سپاردووە.

من خۆم، حەسەن قزڵجیم بۆ یەکەمجار لە 1959دا ناسی. لەوساوە بووم بە دۆستێکی ڕاستەقینەی و تا لە بەغدا بوو هەموو جارێ ئەچوومە لای لە ستۆدیۆی وێنەگرییەکەی. لە 1977دا مانگێکم لە سۆفیا لەگەڵی بەسەر بردووە. لە پاش دەرچوونی بەیانی ئازاری 1970وە و تا گەڕانەوەی بۆ نیشتمان پەیتاپەیتا چیرۆك و نووسین و وەرگێڕانی لە بولگاریاوە ئەنارده لام و منیش لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانی عێراقا بۆم بڵاوئەکردەوە.

ئەم وەرگێڕانەی کەوا ئێستا بڵاوی ئەکەمەوە، یەکێکە لەو بەرهەمانەی، بەڵام وەختی خۆی لەبەرئەوەی کەسانێکی تریش هەر ئەم بابەتەیان وەرگێڕابووە سەر کوردی و بڵاویان کردبوەوە، لای خۆم ڕامگرت و بڵاوم نەکردەوە. ئێستاکە ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو بڵاوکراوانەدا تێپەڕیوە وەچەی نوێ مەگەر چۆنها ئەگینا نەیخوێندووەتەوە و، بۆئەوەیش کە بەرهەمێکی بەپێزی قزڵجیی شەهید لە ناو نەچێ، بە جوانم زانی پێشکەشی خوێندەوارانی ئازیزم بکەم و، بەم کارە ئەو بنووس و وەرگێڕ و چیرۆکنووسە هەڵکەوتووەیش بخەمەوە یادی خوێندەواری کورد.

شایانی وتنە کۆمەڵە چیرۆکێکی قزڵجی بە ناوی (پێکەنیی گەدا)وە دووجار بە پێشەکییەکی جوانی شاعیری گەورەی کورد مامۆستا هێمنەوە بڵاوکراوەتەوە. جارێکیان لە 1972دا لە لایەن (بنکەی پێشەوا)وە و، جارێکیش لە 1985دا لە لایەن بنووسی ئەم چەند دێڕەوە.

**مەرگی فەرمانبەر**

**چیخۆف**

شەوێکی خۆش، ئیوان دیمیتر یۆیچ چێرڤیاکۆف، فەرمانبەری عەدلییە لە ڕیزی دووەمی تئیاتردا دانیشتبوو، بە دووربینە

دەستییەکەی، کپ و بێدەنگ تەماشای نواندن نامەی "ئاقووسەکانی کرنوێل"ی دەکرد و لە خۆشییانا بە خەیاڵ بە ئاسماندا دەگەڕا بەڵام کوتووپڕ.. بە ڕاستی لە چیرۆکەکاندا ئەم وتەیە: "بەڵام کوتووپڕ" زۆر دەبینرێ. بێئینسافی ئەکەین نووسەرەکان هەقیانە. چونکە ژیان لە ڕاستیدا پڕە لە ڕێکەوتی تێبینی نەکراو.. ئاخرەکەی کوتووپڕ ڕووکاری چێرڤیاکۆف چرچولۆچ بوو، چاوی ئاڵۆزا، پشووی لێبڕا. دووربینە دەستییەکەی لە چاوی دوورخستەوە.. ئابتشێ.. وەکو دیتت پشمی. پشمین لە هیچ جێگەیەك و لە هیچ کەس قەدەغە نییە. وەرزێرەکان، سەرۆکەکانی پۆلیس، جاری وا هەیە کاربەدەستە پایەبەرزەکانیش دەپشمن. چێرڤیاکۆڤیش هیچ تەریق نەبۆوە. بە دەستەسڕ لووتی خۆی خاوێن کردەوە. بەڵام سەبارەت بەوە کە پیاوێکی بەئەدەب بوو ڕوانییە دەوروبەری خۆی تا دڵنیا بێ کەسی سەخڵەت نەکردووە. لێرەدا تووشی خەجاڵەتی هات و تەریق بۆوە لە ڕیزی پێشەوە پیرەمێردێك لە بەردەمی ئەو بە سەبرێك بە دەسکێشەکانی سەرە ڕووتاوەکەی و ملە ئەستوورەکەی خاوێن دەکردەوە و لەبەرخۆیەوە بۆڵەبۆڵی بوو. چێرڤیاکۆڤ پیرەمێردەکەی ناسی: سەرتیپی ئەهلی بوو، ناوی بریزژاڵۆف بوو، لە وەزارەتی ڕێوبان کاری دەکرد. لە دڵی خۆیدا گوتی: پریشکم پرژاندە ئەو پیاوە. هەرچەند سەرۆکی من نییە و، سەرۆکی کەسێکی ترە، بەڵام باش نییە. دەبێ عوزرخوایی لێ بکەم. چێرڤیاکۆف کۆکی و سەری بردە پێشەوە و بە ئەسپایی بە گوێی سەرتیپیدا چپاند:

–جەنابی سەرتیپ، ببوورە، من بە ئەنقەست پڕیشکم نەپرژاندە ئێوە.

–قەی ناکا، هیچ نییە.



—توخوا ببووره. خوا دەزانێ نەمدەویست..

—ئاغا، فەرموو دانیشە. وازبێنە با گوێمان لێ بێ. چێرڤیاکۆف خۆی زۆر بە خەجاڵەت و شەرمەزار زانی. بزەیەکی گەوجانە کەوتە سەرلێوی و دووبارە دەستی کردەوە بە تەماشاکردنی شانۆی تیئاترەکە. تەماشای دەکرد، بەڵام ئیتر ئەو کەیف و لەزەتەی پێشووی نەبوو. زۆر شپرزە و پەشێو بوو، کاتی پشوودان خۆی گەیاندە بریزژاڵۆف. تاوێك بەدەوریدا هەڵخولا، پاشان غیرەتی نا بەر خۆی و شەرمی نا بەلاوە و بە سەرتیپی گوت:

—جەنابی سەرتیپ، من پڕیشکم پرژاندە ئێوە.. ببوورە.. من ئاخر..

—ئاخ، دە بیبڕەوە، هەر لە بیریشم نەماوە، کەچی تۆ هێشتا واز نایەنی! چیرڤیاکۆف بە چاوێکی بەدگومانییەوە ڕوانییە ڕووکاری سەرتیپ و لە دڵی خۆیدا گوتی.. "دەڵێ لەبیرم نەماوە، بەڵام نگریسی و ناڕەسەنی لە چاوی دەبارێ. تەنانەت فیزی نایەنێ قسەش بکا. ئاخر دەبێ تێی بگەیەنم کە من هەرگیز حەزم نەدەکرد.. ئەمە شتێکی تەبیعییە.. ئەگینا وا خەیاڵ دەکا کە من ویستوومە تفی لێ بکەم. ئەگەر ئێستاش وا خەیاڵ ئەکا، قسەی تێدا نییە پاشان ئەمەی بە خەیاڵدا دێ.

چێرڤیاکۆف کە چووەوە ماڵەوە کردەوەی گەوجانەی خۆی بۆ ژنەکەی گێڕاوە. لای وابوو ژنەکەی سەرسەرەکی گوێی لێ گرت و بە گرنگی نەزانی. ژنی چێرڤیاگۆف نەختێ ترسا، بەڵام کە تێگەیشت بریزژاڵۆف سەرۆکی مێردەکەی نییە دڵی حەساوە. سەرەڕای ئەوەش بە مێردەکەی گوت:

—بچۆ عوزرخوایی لێ بکە. ڕەنگە لای وابێ تۆ ڕێوشوێنی هەڵسوکەوت و تێکەڵی نازانی و، ناتوانی لەناو خەڵکدا جێی خۆت بکەیەوە.

—ڕاستە، تەواو وایە. عوزرخواییم لێکرد، بەڵام کردەوەی ئەو عەجایب بوو، تەنانەت تاقە قسەیەکی حیسابیشی نەکرد. جگە لەوە جێگاکەش بۆ قسەکردن نەدەبوو.

چێرڤیاکۆف سبەینێ جلوبەرگی نیوەڕەسمی تازەی کردەبەری، سەری شانە کرد و چووە لای بریزژاڵۆف. لە هۆدەی چاوەڕوانیی سەرتیپ، هێندێ کەس کە بۆ کاری خۆیان هاتبوون دانیشتبوون. سەرتیپ خۆی خەریکی کۆکردنەوەی نامە و عەرزوحاڵەکان بوو. دوای ئەوە کە بە شکات و داوای چەند کەس ڕاگەیشت، چاوی بە چێرڤیاگۆف کەوت.

فەرمانبەری عەدلییە بەو دەموکاوێژەی کە ڕاپۆرتی پێ دەدەن، گوتی:

—جەنابی سەرتیپ ئەگەر لە بیرتان بێ لە تیشاتر من پشمیم و پڕیشك پەڕییە ئێوە.. ببوو..رە.

—ئەم قسانە چن؟ مەگەر خوا خۆی بزانێ تۆ چەندە شڕی و بڕی دەڵێی!

چێرڤیاگۆف ڕەنگی چڕوچاوی بزڕکاو لە دڵی خۆیدا گوتی: "نایەوێ قسە بکا، وا دیارە تووڕەیە. نەخێر نەدەبوو ئەوە بقەومێ. ئێستاش ناکرێ هەروا بمێنێتەوە، دەبێ تێی بگەیەنم".

کە سەرتیپ بە عەرزوحاڵی هەمووان ڕاگەیشت و بەرەو هۆدەکەی خۆی کەوتەڕێ، چێرڤیاکۆفیش کەوتە دوای و نووزەنووز گوتی:

—من سەبارەت بە هەستی پەشیمانییە کە بە خۆمدا دەپەرمووم جەنابتان سەغڵەت کەم. ئێوە، جەنابی سەرتیپ خۆتان دەزانن کە من نیازێکم نەبوو.

—تۆ منت کردۆتە گەپچاڕ!

سەرتیپ لە هۆدەکەوە دەرکەوت. چێرڤیاکۆف لە دڵی خۆیدا گوتی: ئێرە جێگەی گەپوگاڵتە نییە. سەرتیپ، بەڵام نایەوێ تێبگا. ئێستاکە وای لێ هات منیش لەم کابرا بە فیز و دەعیەیە عوزرخوایی ناکەم، قیروسیا، نامەی بۆ دەنووسم، بەڵام خۆم نایەمە لای. خوا شایەتە ئیتر پێم نا نێمە ئێرە.

چێرڤیاکۆف بە دەم ئەم بیر و خەیاڵانەوە گەڕاوە ماڵەوە. ئەوەندەی هەوڵی دا نەیتوانی ئەو نامەیە ڕێکخات کەوا دەیەویست بۆ سەرتیپی بنووسێ. ئاخرەکەی ناچار بوو خۆی بچێتەوە لای سەرتیپ.

کە سەرتیپ بە چاوی پرسیارەوە ڕووانییە بیچمی چێرڤیاکۆف، چێرڤیاکۆف بە نوزەنووزەوە گوتی:

—من دوێنێ هاتم جەنابتانم سەخڵەت کرد، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوەی فەرمووتان بە هیچ کلۆجێ نیازی گاڵتە و پێکەنینم نەبوو. من عوزرخوایی ئەوەم کرد کە پشمیم و پڕیشکم پرژاندە ئێوە. بە هیچ جۆرێ نیازی پێکەنین بە خەیاڵمدا نەهات. من چۆن دەوێرم پێبکەنم؟ ئەگەر وای لێ بێ ئێمەمانان پێبکەنین، ئیتر ڕێز و حورمەتی پیاوی گەورە چۆن دەمێنێ؟

سەرتیپ کە لە تووڕەیی یا ڕەشوشین هەڵگەڕابوو، دەلەرزی، گوتی:

بڕۆ، لاچۆ لەبەرچاوم!

چێرڤیاکۆف بە دەنگێکی زۆر نزم و ترس و لەرزەوە پرسی:

—چتان فەرموو؟

—سەرتیپ کە بە جارێ لە دین دەرچووبوو، زرم، لاقی لە زەوی کوتا و دووبارە نەڕاندی:

—بڕۆ، لاچۆ لەبەرچاوم!

چێرڤیاکۆف جەرگ و هەناوی داکەوت، گوێی زرینگاوە، چاوی کەوتە ڕەشکەوپێشکە. پاشەوپاش بۆ لای دەرگاکە کشاوە و خۆی گەیاندە جادە. بە لەقەلەق بەرەو ماڵ کەوتەڕێ. کە گەیشتە ماڵەوە، بێئەوەی جلوبەرگە نیوەڕەسمییەکەی داکەنێ، لەسەر قەرەوێڵەکەی پاڵکەوت و.. مرد.□

سەرچاوە: گۆڤاری "بەیان"، ژ 170، 1993دا بڵاوبۆتەوە.□

# حەسەنی قزڵجی
# یەکێکە لە ڕابەرانی تەکنیکی چیرۆکی کوردی*

**شیرین. ك**

ئەم کۆمەڵە کورتە چیرۆکانەی مامۆستا "حەسەنی قزڵجی" لە چواردە چیرۆك پێکهاتووە.. بە پێی ناوەڕۆك واتە بە پێی ئەو مەسەلە و کێشە و گیروگرفتانەی تیایدا باسی کردووە دەیکەم بە سێ بەشەوە..

1–ئەو چیرۆکانە کە تیایدا باسی کێشە و گیروگرفتەکانی لادێکانی کوردستان دەکات.. ئەو چیرۆکانەش ئەمانەن:

"پێکەنینی گەدا.. شەهیدی زوڵمە کفن و شۆردنی ناوێ. ئاغا وەجاخی ڕوونە.. کەشکۆڵی جادوویی. خەمڵی پەمو. نە دیداری حاجی نە خەوی مزگەوت. نووشتەکەی ئامینەخان"

2–تەنیا دوو چیرۆکی باسی کێشەکانی شارستانی دەکات ئەو دوو چیرۆکەش بریتین لە عادەتی بازاڕ، سەرفیترە.

3–بەشی سێهەم ئەو چیرۆکانەن تیایدا ڕاستەوڕاست باسی دێهاتەکانی کوردەواری دەکات لە سەردەمێکی تایبەتیدا.. ئەو چیرۆکانەش ئەمانەن:

"هێلکەی هادی خان.. قورئان خوێندن لە باتی بەرتیل.. تاج و تەختی کوێخا هۆمەر.. چای دیوەخان"

دەبینین چیرۆکنووس زوربەی تەرخان کردووە بۆ شیکردنەوە و لێکۆڵینەوە لەو کێشە جۆراوجۆر و گیروگرفتانەی لە لادێکانی کوردستاندا هەن، تەنانەت چیرۆکە سیاسییەکانیشی هەر لە لادێکاندا ڕوودەدات و پەیوەندییان بە کێشە ئاڵۆزەکانی لادێکانەوە هەیە.

پاڵەوانانی چیرۆکەکانی مامۆستا "حەسەنی قزڵجی" هیچ کامێکیان لای خوێنەوارێکی کورد نەناسیاو نین.. بەڵکو هەموویان لە چینە جیاوازەکانی کۆمەڵی کورد هەڵبژێردراون بە تایبەتی بەشی زۆری چیرۆکەکانی باسی چینی چەوساوە و زەحمەتکێشی لادێ دەکات، هەروەکو "حسین عارف" دەڵێ:

"بێگومان بەشی زۆری بەرهەمی چیرۆکیشمان لەم بابەتەیە بەڵام کەسێك وەك "حەسەنی قزڵجی" بە شارەزایی ورد و تاقیکردنەوەی زیندوو ڕاست و ئاگادارییەکی زیرەکانە لە نزیکەوە لەم باسە نەدواون، هۆی ئەمەش ئاشکرایە.. ئەوان وەك ڕۆشنبیرێکی موچەخۆری بچووك یان گەورەی میری، ماوەیەکی زۆر یان کەم لە لادێیدا بەسەربردووە، دڵسۆزی و دڵپاکی و هەستی مرۆڤایەتی و ڕادەی تێگەیشتن و دواجار مەبەست و ئامانجی سیاسی جووڵاندوونی یا بڵێین لە ناخەوە هەژاندوونی و دەستیان داوەتە قەڵەم و ئەو چیرۆکانەیان هێناوەتە بەرهەم. ئەم لە پاڵ ئەو خاسیەتەی ئەوانیشدا لە شارەزاییەکی وردی تایبەتی خۆیەوە سەبارەت بە پێچ و پەنا و بنج و بناوانی باسەکە دەستی داوەتە قەڵەم و ئەم "پێکەنینی گەدا"یەی هێناوەتە بەرهەم.

ئەگەر سەیری چیرۆکەکانی بەشی یەکەم بکەین، دەبینین چیرۆکنووس باسی مەسەلەی ئاغا و دەرەبەگ و زوڵم و زۆر و چەوساندنەوەی جووتیاران و کۆمەڵی دواکەوتووی لادێ دەکات.. بەڵام دیسانەوە لە هەر چیرۆکێکدا یان دوو چیرۆکدا بە جۆرێك مەسەلەکە دەخاتە ڕو و باسی لایەنێکی مەسەلەکە دەکات.

1–لە چیرۆکی "پێکەنینی گەدا"دا و "شەهیدی زوڵمە کفن و شۆردنی ناوێ" باسی مەسەلەیەکی زۆر گرنگ دەکات. ئەویش مەسەلەی کۆچکردنی جووتیارەکانە لە لادێکانەوە بۆ شار لەناو زوڵم و زۆر و نەبوونی و هەژاری بەو هیوایەی لە شاردا ئیشوکار زۆرە و ئیش بدۆزنەوە.. زۆر جار ڕووناکی و گەورەیی شار هەڵیان دەخەڵەتێنێ و ڕایان دەکێشێ بەڵام نازانن شار گورگی زۆر دڕندەتری لێیە لە پشتەوە زەفەریان پێدەبات، بۆیە کاتێ بە خۆیان دەزانن کەوتوونەتە ژێر دەست و پێوە و ئەو تۆزە مرۆڤایەتییەی هەیان بوو ئەوەشیان لە دەست چووە و سڕراونەتەوە..

یەکەم: لە چیرۆکی "پێکەنینی گەدا"دا..

"حەمەڕەشی" جووتیار، شارەزوور بەجێ دەهێڵێ و دەچێتە شاری هەڵەبجە پاش ئەوەی لەبەر نەهاتی ساڵەکە "زەویەکەی نایەتە بەرهەم، هەژاری و برسێتی و نەخۆشی ژنەکەی و کوڕەکەی لە ناو دەبەن.. خۆشی بە نەخۆشی و برسێتی ڕوودەکاتە شار تا کارێك بدۆزێتەوە و پێی بژی.. بەڵام کاری چی؟ وەکو چیرۆکنووس دەڵێ:

"خەڵکی کرێکاری دەویست کە هەر لە بەیانییەوە تا ڕۆژئاوا پشوو نەدا وەکو خولخولە هەڵخولێ".

بەم جۆرە "حەمەڕەش"ی جووتیار هەمیشە فێربووبوو بە ڕەنجی شان و بازووی خۆی بژی، پاش ئەوەی ماوەیەك بۆ ئیش دەگەڕێ و نایدۆزێتەوە، برسێتی زۆری بۆ دەهێنێ و ناچار دەست لە خەڵکی پان دەکاتەوە وفێری سواڵکردن و گەدایی دەبێ.. لە کۆتایی چیرۆکەکەدا "حەمەڕەش" دەبینین بە ڕۆژێکی ساردی زستان بە باوە بەفر کرێوە دەکات، حەمەڕەش هەموو گیانی لە قوڕ و پیسیدایە لە دەرگای ماڵان دەدات بۆ نان.. چیرۆکنووس کۆتایی چیرۆکەکە بە دوو سێ حیواری کورت دەهێنێتەوە لە نێوان "حەمەڕەش" و خزمەتکاری یەکێ لە ماڵە دەوڵەمەندەکان کە حەمەڕەش بۆ نان لە دەرگاکەیان دەدات.. حیوارەکە وەکو نووکتەیەك وایە، مرۆڤ دەخاتە پێکەنین. بەڵام پێکەنین بەو یاسا ڕزیو و بۆگەنانەی "حەمەڕەش" و هەزارەهای وەکو حەمەڕەش دروست دەکات..

خزمەتکارەکە ناوی سەعەیە بەسەر حەمەڕەشدا دەقیژێنێ..

–بڕۆ بەڕێی خۆتەوە کابرا.. خانم لە ماڵ نییە.. چۆتە حەمام..

حەمەڕەش سەرنجی بەژن و باڵای خزمەتکار دەدات و، لێوە چرچەکانی تا لای بناگوێی لێك ڕەوینەوە و شەویلاگەکانی لەبەر یەك ترازان.. ئەگەر ئینسانێکی ساغ و تێر و تەسەل بوایە زوو دەزانرا خەریکە پێبکەنێ بە دەنگێکی کورت و بچڕەوە گوتی..

تۆ گوێت پێوە نەبوو من داوای نانم کرد خانمی چی؟! من برسیمە.. شتێکم گەرەکە بیخۆم. شتێکم گەرەك نییە گەمەی لەتەك بکەم..

چیرۆکی دووەمی "شەهیدی زوڵمە کفن و شۆردنی ناوێ"

لەم چیرۆکەدا وەرزێرێك لە یەکێ لە ناوچەکانی کوردەواریدا بە هۆی قات و قڕی و گرانیی یەکێ لە ساڵەکان، ئەو ساڵە باران نابارێ و خەلە گران دەبێ و باری ڕەنجبەر و ئیشکەران هێندەی تر خراپ و نالەبار دەبێ، لەبەرئەوە وەرزێری برسیی بێئیش ناوچەکەی جێدەهێڵێ و ڕوودەکاتە شار، کاتێ لە شار نزیك دەبێتەوە و چاوی بە ڕووناکی و قەڵەباڵغی شار دەکەوێ وەرزێری ساویلکە و دڵپاك زۆر دڵی خۆش دەبێت و خێرا هەر بە خەیاڵ ئیش دەدۆزێتەوە پارە کۆدەکاتەوە و دەنێرێ بە شوێن خێزانەکەیدا و ئەوانیش دائەمەزرێنێ و ژیانیان بەختیار دەبێ.. بەڵام هەر زوو خەو و خەیاڵەکانی دەڕەوێتەوە و لە کۆڵان و بازاڕەکانی شاردا ناشارەزایانە دەسووڕێتەوە و نەخۆش و برسی هەرچەند دەکات لە ڕووی نایەت دەست لە کەس پان بکاتەوە داوای هیچ بکات لە خەڵکی ناچار ڕوودەکاتە مزگەوت تا خێرەومەندێك خێری پێبکات.. بەڵام وادیارە مرۆڤێکی هەژاری برسی وەکو ئەم لە هیچ شوێنێ جێی نابێتەوە، بۆیە هەر زوو بۆی دەردەکەوێ جێی لەو شارە گەورەیەدا نابێتەوە و بەرەو قەراغ شار دەکەوێتە ڕێ، بەڵام گیانێکی برسیی نەخۆش چەند بڕەکات چەند خۆی دەگرێت، لە کۆتاییدا لە قەراغ شار دەکەوێ و دەمرێ.. چیرۆکنووس دیسانەوە لە کۆتایی ئەم چیرۆکەدا شارەزایانە بە دوو سێ حیوار لە نێوان، کابرای مجێووری مزگەوتەکەدا و حاجییەکی بازرگانی ناو ئەو شارە نەفسییەتی ئەو جۆرە دڕندانەی ناو شار ئاشکرا دەکات، کاتێ کابرای مجێور دەچێتە لای حاجی بازرگان تا پارچەیەك قوماشی بداتێ بۆ کفنی کابرای مردوو، حاجی زۆر بە ئاسایی وەکو باسی مەسەلەیەکی بازرگانی بکات بە کابرای مجێور دەڵێ:

باشە پەلە مەکە با بازاڕمان ببێ ئەوسا وەرەوە کفنی بۆ ئەکەم..

چیرۆکی سێهەم.. ((نە دیداری حاجی نە خەوی مزگەوت..))

لەم چیرۆکەشدا، لە سەرەتاوە باسی کۆمەڵی دواکەوتووی لادێ و زوڵمو زۆری ئاغاکان دەکات.. "بایز"ی جووتیار لەناو هەژاری و بێگار و گزیر و ئاغا، لادێکەی بەجێ دەهێڵی و لەگەڵ ژنەکەیدا دەچێتە سەر چیرۆکنووس دەڵێ:

"بایز هەموو ڕۆژێ دەچووە کرێکاری.. ژیانیان لە چاو ئەو وەختە کە لە کێچ ئاوا بوون گەلێ باشتر بوو. وردە وردە نەختێ پووتیان پاشەکەوت کرد. بایز لە دێهاتی شاروێران شارەزا بوو.. ئەم ماوەیەش لە سابلاخ نەختێ چاوی کرابووەوە، دەستی کرد بە هاتوچۆی لادێ، هێلکە و مریشك و ڕۆن و پەنیر و میوە و سەوزی و شتی وای دەکڕی و دەیهێنایە سابلاخ دەیفرۆشتەوە. تا ئاخری دوکانێکی بە کرێ گرت و بووە دوکاندار. ئەمجار خانوویەکی سەربەخۆشی گرت"

چیرۆکنووس بەردەوامە و دەڵێ: "بایز کوڕێکی سەر ڕاست بوو. فڕوفێڵی لە کڕیارەکان نەدەکرد، زۆری پێنەچوو ئاشنا و ڕۆشنایەکی زۆری پەیدا کرد. خەڵکی کێچ ئاوا ئەو دەوروبەرە سەودا و مامەڵیان لای بایز بوو. خزم و دۆست و برادەرەکانی کە دەهاتنە شار لای ئەو میوان دەبوون. لە ماوەی ئەم چەند ساڵەدا دوو منداڵیشیان بوو. ئیتر خانووەکە بچووك بوو جێگایان نەدەبووەوە. لەگەڵ خەزاڵ تەگبیریان کرد کە خانوو یەك بکڕن".

بەم جۆرە چیرۆکنوس هەروا بە ئاسانی "بایز"ی وەرزێری ساویلکە دەکات بە دوکاندارێکی شاری و سەری بە کڕین و فرۆشتنەوە قاڵ دەکات.. بەڵام نازانین بایزی وەرزێر کە تازە لە لادێوە هاتووە شار و بوو بە کرێکار، چۆن چۆنی پارەی پاشەکەوت کرد.. دیارە هچ ڕۆژێ بۆ ئیش نەگەڕاوە و هەموو ڕۆژێك بە ڕێکوپێکی شتی هەبووە و پارەیەکی باشیشی وەرگرتووە..

پاش ئەوە بایز لە نێوان شار و لادێدا هاتوچۆ دەکات و شت دەکڕی و دەفرۆشێتەوە، هەر لەم ئیشەوە دەوڵەمەند دەبێ، پاش ئەوەی لە شار چاوی دەکرێتەوە و وردە وردە فێری فڕوفێڵ و درۆ و دەستبڕین دەبێ خەڵکە ساویلکەکانی لادێ هەڵدەخەڵەتێنێ.. نەك لەبەرئەوەی کوڕێکی سەرڕاست بوو فڕوفێڵی لە کڕیارەکان

نەدەکرد.. چونکە هیچ دەوڵەمەندبوونێکی لە پڕ ئەنجامی سەرڕاست نیـە، بـەڵکو بـە پێچـەوانەوە.. ئەمـەش مەسـەلەیەکە هـەموو کـەس دەیزانێ و ئیتر پێویست ناکات چیرۆکنووس بەو جۆرە (مبڕرات) بۆ گۆڕان و دەوڵەمەندبوونی پاڵەوانەکەی بهێنێتەوە.

بێگومان "بایز" وردە وردە لە جووتیارێکی ساویلکەوە دەبێت بە دووکانـدار و وردە بۆرژوایـەك، بـەڵام مەسـەلەکە بـە زۆری ڕواڵەتـە، ئـەگینا بـایز لـە ناخیـدا هێشـتا ڕەگ و ڕیشـەی نەفسـییەتی جووتیارێکی زۆر تیایە واتە (بایز) وەکو وردە بورژوایەکە وڵاتێکی زراعـی هەڵسـوکەوت دەکـات نـەك وەکـو بۆرژوایـەکی وڵاتێکـی پیشەسازی پێشکەوتوو..

بەم جۆرە دەبینین چیرۆکنووس بە پەلە ڕووداوەکان یەك بە دوای یەکدا پاڵپێوەدەنێ تا بگاتە کۆتایی، کۆتاییەکەشی بە نووکتەیەك دەهێنێتـەوە کـە خـەڵکی دەیـزانن و بیسـتراوە هەرچـەندە ئـەم تۆزێـك گۆڕیویێتی.. ئەمەش ئەوەیە:

"کاتـێ بـایز لـەناو شـەڕ و هـەرای هـەردوو ژنەکـەی لێفەکـەی هەڵدەگرێ و دەچێتە مزگـەوت بنوێ.. دەبینـێ "حـاجی ڕەحیم"یش لـەوێ خـەوتووە.. ئـەو حـاجی ڕەحیمـەی هەمیشـە "بـایز" پێـی خەڵـەتابوو وایـدەزانی لەبـەر دینـداری خـۆی هـەموو ڕۆژ لـە پـێش ئەوەوە لە مزگەوتە، نەیدەزانی ئەویش لە تاو شەڕ و هەرای هەردوو ژنەکەی ڕادەکات.. حاجی ڕەحیم پێی دەڵێ:

"وەرە برالە وەرە. ئا لەوێ بۆ خۆت بخەوە تایەفەی حاجی کەریم هەروان نەختێ تووندە تەبیاتن. خوشکی حاجیش لەگەڵ من و ژنە گەورەکەم هەروایە.. خوا هەڵدەگرێ، هەر من بە تـەنیا لـە مزگـەوت بخەوم؟"

بایز لە وەڵامدا دەڵێ:

"ئەگەر ئەمشەو ڕۆژم لـێ دەبێتـەوە ئیتر نـە دیـداری حـاجی و نـە خەوی مزگەوت".

ڕای وایــە ئــەم وتەیــە و وەڵامدانەوەیــەی بــایز نیشــانەی پاشگەزبوونەوەی "بایز"ە و بڕیاری گەڕانەوەیە بۆ لادێکەی.. بەڵام ئایا ئەم وەڵامەی بایز تا چ ڕادەیەك ئەم واتایە دەدات بە دەستەوە؟ ئایا چۆن دەگەڕێتـەوە پاش ئەوەی چەند ساڵێك لە شاردا ژیاوە و ماڵ و سامانێکی باشی پێکـەوە ناوە؟ ئایا ئەگـەر بشگەڕێتەوە بۆ لادێ دەتوانـێ وەکو جاران بە ئاسایی بژی؟، نـەخێر "بایز" لـەوە دەرچـووە وەرزێڕێکـی سـاویلکە بـێ هـەروەکو جـاران.. ئایـا ئـەم ڕاکردنـەی تـەنیا لـە دەسـت ژنـە تازەکـەی نییـە چـونکە پـێش ئـەم ڕووداوە بە هیچ جۆرێك نابینین "بایز" لە شار بێزار بێت و حەز بە گەڕانـەوە بکـات بـۆ لادێ، هەرچـەند ئـەم ڕووداوە بەسـە بۆئـەوەی "بایز" تێبگەیـەنێ تا چ ڕادەیـەك ئەو کۆمەڵـەی تیایـدا دەژی لەسـەر فڕوفێڵ و درۆ بنیات نراوە..

بـەڵام بـە گەڕانـەوەی بـۆ لادێ لـە دەسـت ژنـە تازەکـەی ڕزگـاری ناکات، بێگومان ڕێـی تـر هەیـە بـە هۆیـەوە خـۆی لـێ ڕزگـار بکـات.. هەرچـۆنێ بـێ مـن ئـەم وەڵامـەی "بـایز" بـە بڕیـاردان دانـانێم بـۆ گەڕانەوەی بۆ لادێ، چونکە ڕووداوەکانی چیرۆکەکە وا دەگەیەنێ کە "بایز" تازە لەوە دەرچووە بگەڕێتەوە لادێ..

ئەوەی دەمێنێتـەوە ئەوەیـە.. ئـەم چیرۆکە لـە ڕووی "زەمانـەوە" باسـی ماوەیـەکی دوور و درێـژ دەکـات لـە ژیـانی پاڵەوانەکەیـدا، کـە چـەند ساڵێك دەخایـەنێ، بێگومـان ئەمـەش بـۆ مـەوزووعی "ڕۆمـان" باشـترە تـا چیرۆکێکی وا کـورت، لەبەرئـەوە باسـەکان و ڕووداوەکـان زۆر بە پەلە بە دوای یەکدا دێن و دەچن و چیرۆکەکە لاواز دەنوێنێ..

ب-"بیهێنە ئەما ناوی مەبە" "ئاغا وەجاخی ڕوونە"..

لـەم دوو چیرۆکەدا بـە ئسلوبێکی [کۆمیـدی- گاڵتـەجاڕ-سـاخر] باسـی ئەقڵییـەت و نەفسـییەت و فـەراغی فیکـری ئاغاکـان دەکـات، هەروەها ئەقڵ و نەفسییەتیان شیدەکاتەوە ئەو ئەقڵ و نەفسییەتەی بە هیچ جۆرێك لەگەڵ ڕێڕەوی پێشکەوتن و مرۆڤایەتیدا ناگونجێ بە ڕادەیەك هەندێ جار هەڵسوکەوت و قسەکردنیان وەکو هەڵسوکەوتی مرۆڤێکی ساویلکە پیشان دەدات.

لە چیرۆکی "بیهێنە ئەما ناوی مەبە"دا..

باسی یەکێ لە ناوچەکانی کوردەواری دەکات کە لەبەر نەبوونی و زوڵم و زۆری ئاغا و بێدەرامەتی خـەڵکی بێدەرامـەت دەبن بـەڵام لـە جیاتی هەموو بیرکردنەوەیەك و چارەسەرکردنێك خـانمی ژنـی داوای لێدەکات بچێتە سـەر (سـەیدی زەمبیل) تـا خـوا دەرویان لێبکاتـەوە. چـیرۆکنووس ئـەقڵی سـووکی ئـەو کوێخایـە لـەو کردەوەیـەدا دەردەخـات کاتـێ لەگـەڵ خزمەتکارەکەیـدا دەچـنە سـەر سـەیدی زەمبیل، شەو لـە مزگـەوت کـە دەمێنێتـەوە کـەس نایـەت بـە لایانـدا و شەو سەرمای دەبێت هیچ نابێ بیدا بە خۆیدا هەرچەند داوای شتێك دەکا بیدا بـە خۆیـدا، خزمەتکارەکـەی دەڵـێ: لـە جلـە ئێسترێك زیـاتر هیچـی تـر نییـە، لـە سـەرەتاوە تـووڕە دەبـێ جنێـوی پێـدەدات، بـەڵام کاتێ ناچار دەبێ جلی ئێسترەکە بە خۆیدا با خزمەتکارەکەی دەڵێ:

"باشە بیهێنە ئەما ناوی مەبە"

لە چیرۆکی "ئاغا وەجاخی ڕوونە"دا..

دیسانەوە باسی ئەو فەراغـە گەورەیـە دەکات کـە لـە ژیـان و بیری ئـەو ئاغـا و بەگانـەدا هـەبووە، مـاڵ و سـامان و زەوی و تەنانـەت ئادەمزادیشیان لە باوك و باپیرانیانەوە بۆ ماوەتەوە..

هەموو ژیانیان بەتاڵی و تەمەڵییە، لەبەرئەوە هەمیشـە خۆیـان بـە شـتی بێکـەڵك و پڕوپووچـەوە خـەریك کـردووە.. بێگومـان ئەمـە لـە سـەردەمێکا وای لێـدێ کـە ئاغـا و دەرەبـەگ و یاسـاکانیان دەوری مێـژووییان بەسـەر دەچێت و کۆمـەڵ پێویسـتی بـەوە دەبێـت ڕژێـم و یاسـایەکی نـوێ بنیـات بنـێ و ژیـانی ببـات بـەڕێوە، بـەڵام ئاغـا و دەرەبەگ بە هەموو ڕێگەیەك دەیانەوێ پارێزگاری هەموو ئەو یاسا و

خووڕەوشتانە بکەن کە چینەکەیان بەردەوام پێدەدات و هەروا بە ئاسانی تەسلیم نابن..

لەم چیرۆکەدا "ڕەشید ئاغا" کە ئاغایەکی لاوە و تازە باوکی مردووە و بووە بە ئاغا "بەشەو قومار و بە ڕۆژ خەریکی ڕاووشکار بوو، تاقە هونەرێك کە بووی ئەوە بوو لە زمانی تاژی دەزانی".

چیرۆکنووس لەم چیرۆکەدا وەکو باسی ئەو فەراغە فیکرییەی ئاغاکان دەکات بە جۆرێك وەکو مرۆڤێکی دەبەنگ و خاوەن هەوەس پیشانیان دەدات.. هەر لەو کاتەدا، باسی دەست و پێوەندەکەی ئاغا دەکات کە باری نالەبار و نائاسایی ژیانیان فێری جۆرەها فرویێل و دووڕوویی کردوون، ئەوەتا لە کاتێکدا "ئاغا ڕەشید" بیانوو بە کوێخا عەولا دەگرێ داوای مەتاڵی لێ دەکات تا ڕاوبکات و تاژی تێبەردا، کوێخا عەولا باش دەزانێ وەختی ڕاو نییە و بە هیچ جۆرێك ناتوانێ تەماڵی بۆ بدۆزێتەوە لەبەرئەوە ناچار پەنا دەباتە بەر فروفێڵ و کەروێشکی ماڵی بۆ دەخاتە ماڵەوە ئاغای زیرەکیش بەسەریا تێدەپەڕێ و بە دڵی خۆشەوە ڕاوی خۆی دەکات..

ج-کەشکۆڵی جادوویی..

لەم چیرۆکەدا، چیرۆکنووس ویستوویەتی لە ڕێی بەکارهێنانی حەکایەتێکی فۆلکلۆرییەوە باسی مەسەلەی چەوساندنەوەی جووتیار و زوڵم و زۆری ئاغاکان بکات و باری دواکەوتووی لادێکان پیشان بدات، واتە چیرۆکنووس لەم کارەیدا ویستوویەتی حەکایەتەکە وەکو ڕەمز بەکاربهێنێ، بەڵام بە داخەوە نەیتوانیوە حەکایەتەکە بخاتە پلەی ڕەمزەوە، بەڵکو چیرۆکەکە زۆرتر لە چیرۆکێکی گوێ ئاگردان دەچێت، هەرچەندە هەندێ بیروباوەڕی پێشکەوتووخوازانەی تیایە بەڵام دیسانەوە بیروباوەڕەکان ئەوەندە بە زەقی هاتووە لە هونەری چیرۆکەکەی کەم کردۆتەوە.. وەکو ڕووداو و حیوارێکی ئاسایی و گونجاو لەگەڵ بەشەکانی تری چیرۆکەکەدا ڕێك نەکەوتووە.. بەڵکو وەکو بە زۆر سەپێنرابن بەسەر ڕووداو و کەسەکاندا وایە..

لە چیرۆکەکەدا باسی ئاغایەکی بە دەسەلات و بەزەبروزەنگمان بۆ دەکات بە هەموو جۆرێك جووتیار و خەڵکی لادێکەی دەڕووتێنێتەوە و دەیانچەوسێنێتەوە جووتیارەکانیش بێدەسەلات و لاواز و بێ "وەعیی"ن..

پاڵەوانی چیرۆك "وەیسە" لاوێکە لە منداڵییەوە هەژار نەبووە و سارد و گەرمی ژیانی زۆر نەدیووە بەڵام لەپڕ لە ماوەیەکی کەمدا زۆر کارەساتی لە توانای خۆی گەورەتری بەسەر دێ.. دەرد دەکەوێتە ڕانەکەیانەوە و هەژار دەبن "یارە"ی باوکی لە "بێگار"دا دەکەوێ و دەمرێ.. پاش ئەویش مامی هەر لە داخی براکەی و لەبەر نەبونی و پیری و نەخۆشی دەمرێ "وەیسە"ی لاو، ژنەکەی و دایك و خەسووەکەی بەسەردا دەکەوێ ناچار بە هەموو جۆرێ کاردەکات و.. دەچەوسێتەوە و بێدەنگە لەبەر خاتری خێزانەکەی بەڵام "ئەم قوربەسەرە هەر کردەی ئەم بوو بردەی شەیتان، تا نانی پەیدا دەکرد شەکروچا نەبوو.. تا چەوری و بەرەچێشتی دەست دەخست، جلوبەرگی نەبوو.. سەری لێشێوا".. تا ڕۆژێك بە ڕێکەوت لەسەر کانییەکی دوور لە ئاوایی تووشی پیرەمێردێك دەبێت و پیرەمێردەکە "کەشکۆڵێکی جادوویی" دەداتێ.. چی داوا بکات ئەو کەشکۆڵە بۆی جێبەجێ دەکات.

چیرۆکنووس دەڵێ: وەیسە بەمە زۆر خۆشحاڵ دەبێت و وا دەزانێ ئیتر نەگبەتی و هەژاری بەری دەدات بەڵام ئایا کەشکۆڵی جادوویی ئەو مەسەلە ئاڵۆز و مێژووییەی "وەیسە" و هەزارانی وەك "وەیسە" چارەسەر دەکات؟..

تەنانەت ئەگەر بە قەدەر ژمارەی هەموو چەوساوەکان کەشکۆڵی جادوویی دابەش بکرێت بە سەریانا، دیسانەوە ئەوە هەر چارە نییە بەڵکو هەژاری و نەگبەتی "وەیسە" و ئەوانەی وەك وەیسەن و خراپترن زۆر لەوە قووڵتر و ئاڵۆزترە کە "کەشکۆڵی جادوویی" چارەی بکات.. هەرچەندە من لەوە دڵنیام کە چیرۆکنووس ئەمە لە من باشتر دەزانێ و مرۆڤێکی پێشکەوتووخوازە.. هەرچۆنێ بێ ڕووداوەکانی چیرۆکەکە "منطقی" نین نەك لەبەر ئەوەی ڕووداوی خەیاڵی تێدایە، بەڵکو هەروەکو لە سەرەتاوە وتم مەبەستم ئەوەیە ئەفسانەکە نەچۆتە پلەی ڕەمزەوە.. دەبینین زۆر شاعر و چیرۆکنووس و هونەرمەند لە زۆر بەرهەمیانا "ئەفسانە و حەکایەتی فۆلکلۆری" بەکاردێنن، هەرچەندە هەر هەموو ئەو ئەفسانە و حەکایەتانە بە پێی عیلم منطقی نین بەڵام ئەگەر ئەدیبەکە یان هونەرمەندەکە بە توانا بێ لە کارەکەیدا دەتوانێ ئەفسانەکە یان حەکایەتەکە بخاتە پلەی ڕەمزەوە و خوێنەوار بە هیچ جۆرێ هەست بە نا "منطقی" ڕووداوەکان نەکات.. بەڵام مامۆستا حەسەنی قزڵجی لەم چیرۆکەیدا نەیتوانیوە حەکایەتەکە بە جۆرێ دابڕێژێ خزمەتی بیروباوەڕەکانی بکات، بەڵکو چیرۆکەکە بە سادە و ساکاری ماوەتەوە بێگومان بەکارهێنانی ئەفسانە کارێکی ئاسان نییە، ئایا ئەفسانەکە یان حەکایەتەکە نەتەوەیی بێ یان لە نەوەیەکی ترەوە وەرگیرابێت.. واتە هی نەتەوەی نووسەر نەبێ و خواسترابێ، لە هەردوو حاڵدا توانایەکی زۆری دەوێ بۆ خستنییە خزمەتی نووسەرەوە.

د-"خەمڵی پەموو".. نووشتەکەی ئامینە خان..

لەم دوو چیرۆکەدا باسی دیاردەیەکی زۆر ئاشکرا و باو دەکات لەناو کۆمەڵی کوردەواریدا کە ئەویش مەسەلەی شێخایەتی و مرید و ئەو هەموو دەستبڕین و درۆزنی و فروفێڵەیە کە بە ناوی شێخایەتی و ئاینەوە دەکرێت بۆ چەوساندنەوەی خەڵکی ساکار و هەژار و ڕووتانەوەیان.. دەوڵەمەندبوون و پارە پەیداکردن لەسەر حسابی ئەو خەڵکە ساکار و سادانەی بڕوایان هەیە و کوێرانە شوێنیان کەوتوون.

له چیرۆكی یەكەمیاندا "خەملّی پەموو"

چیرۆكنووس تیایدا یەك ڕوون ئەم مەسەلەیە ڕوون دەكاتەوە و دەیخاتە ڕوو بەڵام ئەم لایەنە زۆر گرنگە ئەویش ئەوەیە زۆرجار ئەو شێخ و مەلایانە دەبنە دەست و پێوەند و داردەستی ئەو ئاغا و بەگ و كاربەدەستانەی هەژاران و بێدەسەڵاتان دەچەوسێننەوە و لەسەر حسابی ئەوان پارە كۆدەكەنەوە و زۆرجار دەورێكی كۆنەپەرستانە دەبینن لە مەسەلە نەتەوایەتییەكاندا و لە مەسەلە كۆمەڵایەتییەكاندا دەبنە پارێزەری ئەو یاسا و خووڕەوشتە كۆن و ڕزیوانەی بەردەوامی دەدەن بە چەوسانەوە و دواكەوتن..

لەم چیرۆكەدا "سۆفی نامیق" جووتیارێكی هەژاری خاوەن ماڵ و منالّە كاتێ وەختی پەموچنین دێ، وەكیلەكانی بەگ دێن و خەملّی پەمووەكە دەكەن و هیچ بۆ (سۆفی نامیق) نامێنێتەوە، ئەویش ناچار پەنا دەباتە بەر "شێخ" ناچاری بكات و تكای بۆ بكات لای بەگ، بەڵام لەبەرئەوەی "بەگ" و "شێخ" هەر لە زووەوە هەردووكیان ڕێككەوتوون لەسەر چەوساندنەوەی هەژاران لەبەر ئەوە "شێخ" لە جیاتی هەموو یارمەتی و چارەسەركردنێك دەڵێ:

"عیلاج نییە. سۆفی نامیق، زەمانەكەی خراپ بووە، خوا خراپتر نەدا".

كاتێك سۆفی نامیق بە نابەدڵی هەڵدەستێت و دەڕوا بە دەم ڕێگەوە دەڵێ:

"هەزار قەزا و قەدەر بێ پەمگی خۆمی نادەمێ"

بێگومان ئەم قسەیەی "سۆفی نامیق" هەرچەندە قسەیەكی سادە و ساكاریش بێت، خۆی لە خۆیدا، یاخیبوونێكە لەو بارەی تیایدا دەژی و ڕەتكردنەوەیەكی ئەو یاسا و ڕژێمانەیە ژیانی دەبەن بەڕێوە هەرچەند چیرۆكنووس كۆتایی بە چیرۆكەكەی دەهێنێ بەبێ ئەوەی بزانین پاڵەوانی چیرۆك "سۆفی نامیق" چی بەسەر دێ؟ ئایا دەتوانێ بەرامبەر بە بەگ و پیاوەكانی بوەستێتەوە؟ ڕەنگە لای نووسەر ئەوە گرنگ نەبێ كە ئێمە ئاگادار بكاتەوە لە ئەنجام و ئەوەندە بە بەس بزانێ.

(چیرۆكی دووەم "نووشتەكەی ئامینەخان")

بۆ یەكەم جار چیرۆكنووس لەم چواردە چیرۆكەیدا ئافرەت دەكات بە پاڵەوانی چیرۆكەكەی.. دەبینین "پیاو" پاڵەوانە لەهەر سیازدە چیرۆكەكەی تریدا و ئافرەت هیچ دەورێكی ئەوتۆی نییە، بەڵكو چیرۆكی وای هەیە ناوی ئافرەتی هەر تیا نییە.

ئەم چیرۆكەش ڕاستەوڕاست باسی مەسەلەی شێخایەتییە و ئەو هەموو درۆ و فڕوفێڵەی پێوەی بەستراوە.. هەرچەندە لەم چیرۆكەیدا "شێخ ئەحمەدی كانی پانكە" نووشتە و دوعا بۆ خەڵك دەكات و ژیانی لەسەر ئەوە وەستاوە بە دیاری و خێری خەڵكی دەژی و فڕوفێڵەكانی نەگەیشتۆتە ڕادەیەك خەڵكی بچەوسێنێتەوە خەڵكیش بە هیچ جۆرێ بە چەوسێنەری دانانێن بەڵكو خۆشیان دەوێت و ڕێزی لێدەگرن.

"ئامینەخان" تاقە كچی باوكێتی و لەبەر دەستیا فێری دەرمان دروستكردن و بەكارهێنانی دوعا و نووشتە بووە هەرچەندە خوێندەوارە.. ئامینەخان نموونەی ئافرەتێكی چەوساوەیە بە هەموو جۆرێ لە كۆمەڵدا، قوربانیی ئەو هەموو خووڕەوشتە كۆنانەیە كە لە كۆمەڵدا ڕەگیان داكوتیوە.. پاش مردنی باوكی براكانی هەر زوو ماڵ بەش دەكەن و پەڕەوازە دەبن و "ئامینەخان" بە تەنیا بە دیار برا بچووكەكەیی و دایكە پیرەكەیەوە جێدەهێڵن.. ناچار بۆ ئەوەی خۆی بژێنێ بە تایبەتی دوای مردنی دایكی دەست دەكات بە وەی دووعا و نوشتە بۆ خەڵكی بكات. بەم جۆرە "ئامینە خان" بۆ یەكەم جار خۆی بە تەنیا و ڕاستەوڕاست تێكەڵ بە خەڵكی دەبێت و هەست بە گرانی و ئاڵۆزی و ناخۆشی ژیان دەكات.. كاتێك كوڕوكاڵ و ژنە دڵتەڕەكان دێنە لای داوای دوعای شیرینی لێدەكەن و باسی دڵداری بۆ دەكەن هەموو برینەكۆنەكانی لاوێتی دێتەوە سوێ، لەبەرئەوەی زۆر جوان نەبووە، لەبەرئەوەی كچی شێخ بووە، ئەو جووتیار و وەرزێرانە نەیاندەوێرا بێنە خوازبێنی لەبەرئەوە ساڵ دێت و دەڕوا، گۆڕانی خۆش خۆش لە ژیانی ئەوانەی دەوروپشتیا ڕوودەدات تەنیا ئەو نەبێ هەروەكو خۆی دەمێنێتەوە. ڕۆژ بە ڕۆژ تەنیاییەكەی قوڵتر و سامناك تر دەبێتەوە، بێ باوك و دایك بێ كەسوكار و یار و مێرد دەمێنێتەوە، براكانیشی كاتێ دەزانێ خەڵكی ڕوویان كردۆتە "ئامینەخان" و دیاری و خێری بۆ دەبەن و جێی باوكیانی گرتۆتەوە بەو بارە ڕازی نابن و جۆرەها قسەو قسەلۆكی شوێن دەخەن و تا كارێك دەكەن خەڵكی لێی بتەكنەوە ئیتر ئایا ئامینەخان چی بكات باشە؟!

ئافرەتێكی بە سالاّچووی، هەژاری بێ ئیش و كار، بێكەس و تەنیا لە كۆمەڵێكی وا دواكەوتووی ئاڵۆزدا، سەرئەنجام بە كوێ دەگات؟!

چیرۆكنووس دەڵێ:

"ئیتر ئامینە خان كە هاتوچۆكەری نەما و دیاریی لێ بڕا ناچار بوو خۆی بە ماڵانەوە بگەڕێ و لە كاتی نوخشەشدا بە خەرمانەوە بگەڕێ نووشتە بكات دوعا بخوێنێ و شت دەستخا".

ئافرەتێكی وا چەوساوە، هەموو خۆزگە و حەزەكانی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە دڵیا ناشتووە.. لە كۆتایی چیرۆكەكەیدا، هەموو چەوسێنەرەوەكانی، هەموو ئەو یاسا و خووڕەوشتە كۆنانەی ژیانی دەبەن بەڕێوە، هەر هەموویان ڕەت دەكاتەوە و پێیان پێدا دەنێت.. بە وەی كاتێك نووشتەیەك دەكات بۆ یەكێ لە كوڕ و كاڵەكان "ڕەشیدی كوڕی مام هەباس" تا كچێكی پێ ڕازی بكات، ڕەشید زۆر باوەڕی بە نووشتەكەی ئامینە خان نابێ "ئامینە خان"یش تا ڕازی بكات دەڵێ:

ئەو نووشتەیەی بۆ تۆم کردوون بەسەری باوکم بیخەیتە کۆشی ئافرەتێکی دینداری وەکو منیشەوە کە لە سایەی خواوە لە ڕێگەی هیچیشا نیم ناچارە دەنگ ناکات.

ڕەشیدی هەرزەکاریش ئەم هەلە لە دەست خۆی نادات و نووشتەکە دەخاتە کۆشی، ئامینەخانیش تا خۆی بە درۆ نەخاتەوە دەنگ ناکا!

بێگومان هەرچەندە ئەم کارەی "ئامینە خان"، کارێکی سلبی و ساکارو بێ سوودە هیچ لە مەسەلەی چەوساندنەوەکەی کەم ناکاتەوە.. بەڵام ئەم کارە خۆی لە خۆیدا تۆوی ڕەتکردنەوە و یاخیبوونی ئافرەتێکی چەوساوەیە لە هەلومەرجێکی تایبەتیدا.. هەموو خۆزگە و حەزەکانی هەڵدەچن، هەموو عەیبە و خووڕەوشتێکی چەسپاو لەلای شلۆق دەبن پێیان لێوەنێ..

چیرۆکنووس ئەم هەموو ڕووداو و کێشە دەروونی و کۆمەڵایەتییە لە چیرۆکەکەدا بە ئسلوبێکی کۆمیدی گاڵتەجاڕ دادەڕێژێ بە ڕادەیەک وەکو نووکتەیەکی لێ دێ و خوێنەر وا هەست دەکات، چیرۆکنووس بە هیچ جۆرێ بەشداری خەم و کێشەکانی پاڵەوانەکەی ناکات. چیرۆکنووس ئەگەر بیویستایە دەیتوانی ئەم چیرۆکە بە ئسلوبێکی تر دابڕێژێ و بیکات بە سەرکەوتووترین چیرۆکی کۆمەڵە چیرۆکەکەی..

"بەشی دووەمی چیرۆکەکانی"

بەشی دووەمی چیرۆکەکانی.. باسی کێشەکانی شارستانی دەکات ئەم بەشە تەنیا دوو چیرۆکە.. "عادەتی بازاڕ".. "سەرفیترە"

ئەم دوو چیرۆکە باسی چینێکی تری کۆمەڵ دەکات کە ئەویش چینی بۆرژوایە، چیرۆکنوس تا ڕادەیەکی زۆر توانیویەتی بچێتە ناو ناخی ئەو جۆرە مرۆڤانەوە و باسی باری نەفسی و ئایدۆلۆژییان بکات و پەردە لەسەر فروفێڵەکانیان داماڵێت.. پاڵەوانی هەردوو چیرۆکەکەی یەکێکە لەو بازرگان و خاوەن خانانەی ناو بازاڕ و خانەکانی شار، ئەوانەی جووتیار هەژار و ساویلکەکان هەڵدەخەڵەتێنن و بە ئارەزووی خۆیان دەیانڕووتێننەوە، هەروەها بە جۆرێک ئەو کاتب و حەمالانەی بەردەستیان دەچەوسێننەوە زۆر چەپەڵتر و نامرۆڤانەتر لە چەوساندنەوەی ئاغاکان بۆ مسکێنەکانیان، جگە لەوەی بە هەموو جۆر و ڕێگایەک کریار و خەڵکە هەژار و سادەکان دەخەڵەتێنن و تا بتوانن زۆرتر قازانج بکەن و پارە کۆبکەنەوە..

لە چرۆکی یەکەمدا "عادەتی بازاڕ"

سێ نمونەی مرۆڤی تێدایە.. یەکەم "عبدالقادر ئەفەندی" بۆرژوایەکی خاوەن خانە و پارە و دەوڵەتێکی باشی هەیە.. دووەم کاتبەکەی بەردەستی کە لاوێکی خوێندەوارە و هوشیارە و هەست بە زوڵم و زۆر و فێڵ و تەڵەکەبازییەکانی "عبدالقادر ئەفەندی" و ئەوانەی وەکو ئەون دەکات و هەست بە چەوسانەوەی خۆی و هەموو ئەوانەی وەکو خۆی وان و خراپ تریشن دەکات.. دەبینین کاتێک "عبدالقادر ئەفەندی" فێڵ لە کریارەکانی دەکات و بە هەموو جۆرێك دەیەوێ بیانخەڵەتێنێ و زیاتر قازانج بکات "ئەم کاتبە لاوە" بێدەنگ نابێت و بەرپەرچی دەداتەوە لێی یاخی دەبێت، کەواتە ئەم "کاتب"ە نموونەیەکی "ایجاب"ییە لە چیرۆکەکەدا و تۆوی یاخیبوون و ڕەتکردنەوەی تیادایە.. هەر لەبەر ئەمە "عبدالقادر ئەفەندی" پێش ئەوەی مانگ تەواوبێ پارەکەی دەداتێ و دەری دەکات، چونکە تێدەگات لاوێکی وەکو ئەو کاتبە بێدەنگ نابێت و بە ئارەزووی ئەو ناجوڵێتەوە.. هەرچەندە جوانتر وابوو لە کۆتایی چیرۆکەکەدا کابرای "کاتب" خۆی واز لە ئیشەکەی بهێنێت پاش ئەوە لە فێڵ و تەڵەکەبازییەکانی خاوەن خان شارەزا دەبێت چونکە بەو جۆرە چیرۆکەکە سەرکەوتوو تر و شۆڕشگێڕانەتر دەبوو..

نموونەی سێهەم لە چیرۆکەکەدا کابرای حەماڵە، کە مرۆڤێکی هەژاری چەوساوەیە جگە لەوەی نەخوێندەوار و نەزانە، بەڵام نموونەیەکی "سلبی"یە چونکە هەستێکی تەواو قووڵی نیە بەرامبەر چەوسانەوەکەی بەڵکو زۆر جار وا هەست دەکات و وای بە بیردا دێت کە دنیا هەر وایە و ئەم هیچی پێ ناکرێ و ناتوانێ هیچ لە مەسەلەکان بگۆڕێ. بەڵکو هەمیشە هەوڵی ئەوە ئەدات بە هەموو جۆرێ "عبدالقادر ئەفەندی" ڕازی بکات، تا دەری نەکات، چونکە لێی ڕوونە کە جارێکی تر هەروا بە ئاسانی ناتوانێ ئیشێکی تر بدۆزێتەوە، بێگومان بێدەسەڵاتی و هەست نەکردنی تەواوی کابرای حەماڵ بەو بارە خراپە و نالەبارەی خۆی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی نەخوێندەوارە جگە لەوەی خاوەن ماڵ و منداڵە.. ئەرکێکی گەورەی بەسەر شانەوەیە. بە کورتی چیرۆکنووس لە ڕێی ئەم سێ پاڵەوانەوە توانیویەتی چیرۆکێکی سەرکەوتوو بەرهەم بهێنێ تیایدا ئەو کێشە و گیروگرفتانەی دەستنیشان کردووە.

لە چیرۆکی دووەمدا "سەرفیترە" لەم چیرۆکەدا "حاجی عەلی" بازرگان، فلسە، فلسە ئەو پارە و سامانەی ناوەتە سەریەک و کۆی کردۆتەوە لە پێناویدا جۆرەها فروفێڵ و تەڵەکەبازی کردووە بە ئاشکراو بە دزی.. "میرزا سالح"ی خزمیشی کردووە بە کاتب لای خۆی بە مانگانەیەکی کەم.. "میرزا سالح"یش کابرایەکی نیمچە خوێندەوار و خۆی دەکات و هەموو ڕۆژ بە بەرچاوییەوە ئەم و ئەو دەڕوتێنێتەوە و خەڵکی هەڵدەخەڵەتێنێ، بەڵام بێدەنگە و چاری ناچارە خاوەن ژن و ماڵە جگە لەوەی خوێندەوار و (وعی)ەکەی ئەوەندە نییە پاڵی پێوە بنێت ئەو بارەی خۆی ڕەت بکاتەوە و لێی یاخی ببێ.

چیرۆکەکە باسی ئەوە دەکات کاتێک حاجی ناچار دەبێت سەرفیترە بدات، لەبەرچاوی ماڵ و منداڵەکەی دەڵێ ئەیدەم بە "میرزا سالح"ی کاتبم "مەلا لە مزگەوت دەیگوت خێر و حەسەنات بۆ خزم باشە.. میرزا سالحیش خزمی خۆمانە".

بەڵام دوایی بۆ بەیانییەکەی لە بازاڕ حیسابێکی وا ئاڵۆز و توجارانە لەگەڵ "مرزا سالح"دا دەکات بە ڕادەیەك لە سەرفیترەکە هیچی بۆ نامێنێتەوە.. بۆیە لە کۆتاییدا میرزا سالح بە زەردەخەنەیەکەوە دەڵێ:

"جا بۆچی بەو ڕبعە دینارە سەرفیترەی ساڵێکی دیکەم لێ سەلەم ناکەی".

"حسێن عارف" دەڵێ: چیرۆکی سەرفیترە وێنەیەکی کوتومتی "عادەتی بازاڕ"ە چیرۆکنووس دەبوو یەکێکیان پەڕ بکات.. ئەمە تا ڕادەیەکی زۆر ڕاستە.. چونکە ناوەڕۆکی هەردوو چیرۆکەکە هەر یەك مەسەلەیە و بەڵام ئەوەی ئەم دوو چیرۆکە جیادەکاتەوە و وایان لێدەکات بە ڕای من کە چیرۆکنووس نابێ هیچیان پەڕ بکات ئەوەیە لە چیرۆکی "عادەتی بازاڕ"دا پاڵەوانی دووەم واتە "لاوە کاتبەکە" وەکو وتم پاڵەوانێکی (اجابی)یە و بەرگێکی شۆشگێڕانە دەکات بە بەر چیرۆکەکەدا سەرکەوتوو تری دەکات بەڵام چیرۆکی دووەم "سەرفیترە" پاڵەوانەکەی دووەم واتە "میرزا سالح"ی کاتب نموونەیەکی "سلبی"یە لەبەرئەوەی چەوساوەیە بەڵام نە زۆر هەست بە چەوسانەوەکەی دەکات و نە بەرپەرچی ئەو چەوسێنەرەوانە دەداتەوە.

"هێلکەی هادی خان"

ئەم چیرۆکە باسی یەکێ لەو ئاغا و بەگە دەوڵەمەندانە دەکات کە بە (اعیان) دەناسران.. خاوەن دێ و زەوی و زارێکی زۆر بوون، بێگومان ئەم جۆرە مرۆڤانە زۆریان دەبنە داردەستی بێگانە و



کاربەدەستان بۆ چەوساندنەوە ڕووتاندنەوەی خەڵکی.. پاڵەوانی چیرۆك "هادی خان"، خاوەنی دێی "نشور" یەکێك بووە لە وانەی بە هەموو ڕێگەیەك خەڵکی ڕوتاندۆتەوە، چیرۆکنووس دەڵێ:

"بێجگە لە پیتاك وپووشانە و کاوڕانە و خورییانە و مورانە و فڕوجانە و.. هتد، ڕێگەیەکی نوێی داهێنابوو بۆ ڕووتاندنەوەی جووتیارەکان" کە تا ڕادەیەك مایەی پێکەنینە ئەوەش ئەوە بوو "کونێکی خڕی کردبووە تەختەیەك، کاتێ خەڵکی هێلکەکان دەهێنن خزمەتکارەکەی تەختەکە دەگرێ بە دەستەوە لەبەرچاوی "هادی خان" ئەندازەی دەگرێ هەر هێلکەیەك بە کونەکەوە نەچوو وەری دەگرێ، ئەوەی بە کونەکەشەوە نەوەستا نایەوێت و خاوەنەکەی ناچار دەکات بیباتەوە بیگۆڕێتەوە بە هێلکەی قەڵەو" جا سەبارەت بەمە هێلکەی گەورە لەو ناوەدا ناوبانگی دەرکردبوو بە هێلکەی "هادی خان"..

چیرۆکنووس لە سەرەتاوە تا کۆتایی چیرۆکەکە چەند نموونەیەکی ئەو زوڵم و زۆر و چەوساندنەوەیە دەخاتە ڕوو لە چەند هەڵوێست و ڕووداوێکی تایبەتیدا، وەکو چاوچنۆکی و بەرتیل سەندنی ژەندرمەکان و ئازاردانی خەڵکی لەو ڕێگاوبانەدا.. جۆرەها وێنەی تری لەم بابەتە.. بەڵام ئەوەی شایانی باسە لێرەدا وەکو "حسێن عارف" دەڵێ: لەم چیرۆکەدا سەرهەڵدانی ئەفەنییە ڕۆشنبیرەکانی شار لێرەدا مەغزایەکی تایبەتی دەگەیەنن و ئیشارەتدانێکی هوشیارانەیە بەو دەورەی لێیان چاوەڕوان دەکرێ"

چیرۆکی "قورئان خوێندن لە باتی بەرتیل"

دیسان ئەم چیرۆکەش هەر باسی باری ئاڵۆزی ناوچەکانی کوردەواری دەکات.

چیرۆکەکە بەوە دەستپێدەکات "گروهبان ڕەزائی" پێویستی بە پێنج سەد تمەن دەبێ تا بۆ "سەرهەنگ" واتە لە خۆی گەورەتری بنێرێ. بەڵام هەرچەند دەکات ناتوانێ لە ماوەیەکی وا کەمدا کە "سەرهەنگ" بۆی دیاریکردووە بە دەستی بهێنێ، جا بۆ چارەسەرکردنی ئەم حاڵە دوو ژاندرمەی کارامەی قاڵ بوو لەدەستبڕین و تاڵانیدا تەرخان دەکات بۆ ئەم ئیشە کە یەکێکیان "حسێن قوولی" ناوە قاڵ بووە لەم جۆرە کارانەدا بەری ئەداتە ئەو دێهاتانەی ئەو ناوچەیە، سا بە خۆشی بێ یان بە زۆر ئەو پارەیەیان لێ کۆبکاتەوە.. لە کۆتایی چیرۆکەکەدا دەبینین.. "حسێن قوولی" پارەکەی کۆکردۆتەوە، بەڵام دەیەوێ شتێکیش زیادە بۆ خۆی کۆبکاتەوە دڕندانە دەنیشێتە ماڵ و حاڵی ئەو خەڵکە، دەچێتە ماڵی مەلایەکی هەژار و داوای چەند تمەنێك دەکات بەڵام پاش بردەوبێنەیەکی زۆر ماڵی مەلا و بە یارمەتی دراوسێکەیان لە "سێ" تمەن زیاتر یان پێ هەڵناسوڕێ، بەڵام ژاندرمەکە هەروا بە ئاسانی دەست هەڵناگرێ بە مەلا دەڵێ:

"مامۆستا لەبەر خاتری قورئانەکە ئەوا وەری دەگرم، دایکم دوو سێ مانگە مردووە، لە جیاتی دوو تمەنەکەی دیکە قورئان بۆ دایکم بخوێنە".

چیرۆکی "چای دیوەخان"..

چیرۆکنووس باسی تاقیکردنەوەیەکی سەیر دەکات بە ئسلوبێکی کۆمیدی، کاتێك وردە بۆرژوایەکی ناو شار دەیەوێ بگەڕێتەوە لادێ لە هەڵسوکەوتدا لاسایی ئاغایەك بکاتەوە.. دەبینین چیرۆکنووس وەکو چیرۆکەکانی پێشووی ڕاستەوڕاست باسی مەسەلە سیاسییەکان ناکات بەڵکو باسی ئەو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە نائاساییانە دەکات.

لە چیرۆکەکەدا "میرزا ئەوڕەحمان"ی جاوفرۆش بووە، لە بری قەرز دێیەك لە یەکێ لە ئاغاکان دەسێنێت و دەچێتە دێیەکە و دەبێ بە "ئاغا میرزا ئەوڕەحمان".. بە هەموو جۆرێ دەیەوێ وەکو ئاغایەکی ڕەسەن هەڵسوکەوت بکات و لاسایی ئاغاکان دەکاتەوە لە ژیانی ڕۆژانەیدا.. بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی ڕوودانی گەلێ هەڵوێست و ڕووداوی سەیر سەیر، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جیاوازیە گەورەیەی لە نێوان نەفسیەتی ئاغایەك و وردە بۆرژوایەکدا هەیە، چونکە ئەو بارە ئابووری و کۆمەڵایەتییەی نەفسیەتی ئاغایەك دروست دەکات ئەو بارە کۆمەڵایەتی و ئابورییەی نەفسیەتی وردە بۆرژوایەك دروست دەکات، بەڵام شتێکی ئاسایی تر و گونجاوتر ببوایە بە "میرزا ئەوڕەحمان" و پێشدا ئاغا بوایە و بهاتایەتە شار و ببوایە بە "میرزا ئەوڕەحمان" و ببوایە بە بازرگان و وردە بۆرژوا، چونکە ئەم گۆڕانە بەردەوامی ڕوودەدات لە کۆمەڵدا، هەرچەندە گۆڕانی نەفسیەتی ئاغایەکی گۆڕانێکی تەواو ماوەیەکی زۆری دەوێ و هەمیشە ڕەگ و ڕیشەی بیرە کۆنەکەی پێشووی لادەمێنێتەوە بە تایبەتی لە کۆمەڵی ڕۆژهەڵات و کوردەواریدا، چونکە هێشتا لە لای کورد شاری پیشەسازی گەورە و پەیوەندی کۆمەڵایەتی بۆرژوازی نەچەسپاوە..

دەبینین "میرزا ئەوڕەحمان" کاتێ دێتە لادێ ناچارە وەکو هەموو ئاغایەکی ڕەسەن هەڵسوکەوت بکات.. بۆ نموونە دەبێ دیوەخانی هەبێت و هەرچیش بێت بۆ دیوەخانەکەی دەبێت چاشی بداتێ.. بەڵام هەر زوو خۆی لە بیر دەچێتەوە و وەکو بازرگانێکی ناو بازاڕەکانی شار بیری لێ دەکاتەوە و دەکەوێتە حساب کردن و دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ئەم دیوەخان و چایە مەسرەفێکی زیادە و بێ هودەیە و پارەی بە فیڕۆ دەچێ جا چاکتر وایە یەکێ لە فێڵەکانی بخاتە کار و تا خۆی لێ ڕزگار بکات چونکە ناکرێ دیوەخان هەڵگرێ وازبێهنێ.. فێڵەکەی سەر دەگرێ و لە سەرەتاوە بە ڕێکوپێکی دەڕوا و مەسرەفی کەم دەبێتەوە و دڵی خۆش دەبێت، بەڵام هەر ئەم فێڵەی تووشی هەڵوێستێکی کۆمیدی دەکات و سەری لێ دەشێوێنێ "کاتێك ڕۆژێکیان ئەفسەرێك و چەند ژاندرمەیەك دێنە دێکە بۆ میوانی ئاغا ئەم لێرەوە نیوە ڕۆح دەبێت و بە هەموو جۆرێ دەیەوێ ڕازیان بکات بێگومان ئەم مەرایی کردن و ترسنۆکییەی "ئاغا میرزا ئەوڕەحمان" نیشانەی ئەو پەیوەندییە چەپەڵ و پیسەی نێوان هەردوولایە، کە هەردوو لایان ڕێکەوتوون لەسەر چەوساندنەوەی خەڵکی.. دەبینین لە چیرۆکەکەدا "ئاغا" زوو زوو بانگی چایچییەکەی دەکات تا چا بهێنێ، چایچی ساویلکەش

هەر وەکو ئاغا چۆنی فێرکردبوو هەر وەکو جاران وەڵام دەداتەوە جارێك دەڵێ: شەکر و قەند نەماوە، جارێك ئاوەکە ساردە، جارێکی تر چا نییە.. هتد.. لە ئەنجامدا ئاغا دەشڵەژێ و شپرزە دەبێت و ئارامی لێ دەبڕێ و ڕادەکاتە چێشتخانەکە و بەسەر چایچیدا هاوار دەکات..

–وەڵلا و بیللا بە ڕاستیمە.. تێکە.

کۆمەڵە چیرۆکەکە لە ڕووی ڕوخسارەوە

1–لە ڕووی زمانەوە

چیرۆکەکانی بە زمانێکی کوردی پاکی ڕەوان نووسیوە بە زمانێکی سادە و ساکاری وا کە هەموو کوردێك خوێندەوار بێ یان نەخوێندەوار لێی تێدەگات..

کوردییەکەی شەقڵی شێوەی موکریانی بە ئاشکرایی پێوە دیارە، بێگومان لەبەرئەوە خۆی لەم ناوچەیەدا ژیاوە و زۆربەی چیرۆکەکانی لەم ناوچەیەدا ڕووی داوە.. بەڵام ئەو چیرۆکانەی لە ناوچەکانی تری کوردستانا ڕوویداوە، چیرۆکنووس (حوار)ەکانی بەو شێوە زمانە نووسیوە، بۆ نموونە لە چیرۆکی "پێکەنینی گەدا"دا، کابرا خەڵکی شارەزوورە دەبینین چیرۆکنووس ئەو بەشە شێوە زمانە بەکاردەهێنێ لە کاتێکدا پاڵەوانەکە قسە دەکات واتە لە کاتی (حوار)ەکاندا.. هەروەها لە چیرۆکی "خەملی پەموو"دا دیسانەوە کاتێك یەکێ لە پاڵەوانەکانی چیرۆکەکە خەڵکی هەورامانە، دەبینین چیرۆکنووس، شێوەی هەورامی بەکاردەهێنێ لە (حوار)ەکەیدا جا ئەم کارەی چیرۆکنووس ئەوە دەگەیەنێ کە شارەزایی هەیە لەو شێوانەی زمانی کوردیدا..

2–وەسف کردن

دەبینین چیرۆکنووس درێژدادڕی دەدات بە وەسف کردنەکانی بە تایبەتی لە دەستپێکردندا کە زوربەیان بە لاپەڕەیەك یان دوانی وەسفکردنی کات و شوێن و سەر و سیمای کەسان و هەڵسوکەوتیان دەستپێدەکات بۆ نموونە لە چیرۆکی "عادەتی بازاڕ، پێکەنینی گەدا"

بەڵام ئەوەی جێی سەرنجڕاکێشانە "حەسەنی قزڵجی" هەرچەندە لەسەر ئەو وەسفکردنە کلاسیکییە ڕۆشتووە بەڵام لە سنووری ئەو وەسفکردنەدا هونەرمەندانە و وەستایانە هاتۆتە مەیدانەوە و وەها مامەڵە لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا دەکات کە کەمتر وەڕسی و بێزاری ببەخشێت بە خوێنەوار.. "چونکە لە زۆر شوێندا نزیك دەبێتەوە لە وەی وەسف کردنەکەی تێکەڵ بە جەوهەری چیرۆکەکە بکا و بۆ ناوەوەی کارەساتەکان بیانکات بەو دیو سنورا و دوا جار تیشکیان پێبداتەوە و بۆ دەرەوە کە بە مە لە نێو چیرۆکنووسەکانی سەر بەو ڕێبازەکاندا، دەچێتە ڕیزی پێشەوە و ڕاستگۆتر شوێنی خۆی داگیر دەکا.. بۆچی؟ چونکە ڕاستگۆ تر مامەڵە لەگەڵ کەرەستەکەی بەردەستیا دەکا".

3–کەسانی "پاڵەوانی" چیرۆکەکە

چیرۆکنووس بە شێوەیەکی ڕووکەشی مامەڵە لەگەڵ کەسانی چیرۆکەکانیدا دەکات واتە تەنیا کردار و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەیان پیشان دەدات لەبەرئەوە "حواری داخلی" (مەنەلۆگ"ی تیا نابینین لەم چواردە چیرۆکەیدا (دوازدە) چیرۆکی بە زمانی (چیرۆك بێژ) "الراوی"یەوە دەگێڕێتەوە و تەنیا "دوو" چیرۆکی بە زمانی پاڵەوانی چیرۆکەکەوە دەگێڕێتەوە.. بێگومان گێڕانەوە بە زمانی "چیرۆك بێژەوە" پێویست بە توانایەکی هونەری و ڕۆشنبیری هەیە و لە شێوەی گێڕانەوەی "بە زمانی پاڵەوانی چیرۆکە"وە پێشکەوتووترە.. بەڵام ئەم ڕێبازە هەندێ جار وا لە چیرۆکنووسێك دەکات ببێ بە بار بەسەر پاڵەوانەکانیەوە و هەندێ بیروباوەڕی خۆی بە سەریانا بسەپێنێ، بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی لە هونەرمەندی چیرۆکەکە کەم بکاتەوە بەڵام لە زوربەی چیرۆکەکانی ئەم کۆمەڵە چیرۆکەیدا هەست ناکەین چیرۆکنووس خۆی سەپاندبێ بەسەر پاڵەوانەکانیا بەڵکو پاڵەوانەکان زیندوون و بەشداری ڕووداوەکان دەکەن و کار لە ڕووداوەکان دەکەن و ڕووداوەکانیش کاریان تێدەکات و بەڵام چیرۆکنووس وەکو وتم بە شێوەیەکی ڕووکەشی مامەڵە لەگەڵ پاڵەوانەکان دەکات..

4–بەکارهێنانی ئسلوبێکی کۆمێدی گاڵتەجاڕ "ساخر" بۆ باسکردنی مەسەلەکان، بێگومان ئەم ڕێبازی گاڵتەپێکردن و تەوس و پلار تێگرتنە بۆ مەبەستی لەسەرکردنەوە و پشگیری کردنی چەوساوەکان و ڕیسواکردنی چەوسێنەرەکان، ڕێبازێکی پایە بڵندە لە هونەری چیرۆکنووسیندا، چونکە زیاتر سەرنجی خوێنەر ڕادەکێشێ و لە ناخەوە دەیانهەژێنێ و کاردەکەنە سەر بیروهۆشی..

ئەو سەرچاوانەی بۆ نوسینی ئەم توێژینەوە سودیان لێ وەرگیراوە:

1–پێکەنینی گەدا "حەسەنی قزڵجی" .1972

2–حەسەنی قزڵجی لە "پێکەنینی گەدا"دا، مامۆستا حسێن عارف لە ڕۆژنامەی "بیری نوێ" ژمارە (267) (168) ل (4)ی هەردوو ژمارەکە..

ژێرەر لە گۆڤاری "ڕۆشنبیری نوێ"، بەغدا، ژ 71، 1978، ل 45–55دا بلاوبووەتەوە.

**پۆزش:**

**لە ژمارەی ڕابردوی رۆڤاردا بابەتێکی نووسەری بەڕێز کاك (عادل شاسواری) بەناوی (ئەلفو بێی کوردی لە نێوان بەڵێو نەخێردا) بڵاوبۆتەوە، بەهۆی هەڵەی هونەریەوە ناوی نوسەری بەڕێز پەڕیوە، بۆیە داوای لێبوردن لە ناوبراو و خوێنەرانی بەڕێز دەکەین .**

# مرنا حەسەنێ قزڵجی*

**جۆیس بلوو**

نڤیسکارێ ناڤدارێ کوردستانا ئێرانێ، حەسەنێ قزڵجی د تەمووزدا بۆری دا د زیندانێن ئێرانی دە ل ژێر شکەنجێ مر. ستی جۆیس بلوو، پرۆفە سۆرا زمانێ کوردی لە زانینگەها پاریسێ ژیانا وی ب بیر تینە.

حەسەن مەلا عەلی قزڵجی د 15 ئیلۆن 1914دا ل گوندەکی ناڤچەیا ناڤبەرا بۆکان و مەهابادێ هاتبوو دنێ. قزڵجی ناڤێ گوندەکی نێزیکێ پەنجوێنێ، ل کوردستانا ئێراقێیە. کالکێ وی، مەلا عەلی، تەرکا ڤی گوندی کربوو و هاتبوو ناڤچەیا بۆکانێ ل گوندێ تورجانێ ب جه بوبو. ب جیواربونا ڤێ مالباتا خوەندەیان، تورجان بو ناڤەندەکا دینی و چاندی یا گرنگ. د وەلاتێ موکریان دە دبێژن: "مالباتا قزلجی‌یان وەکی وەردەکانن“ تێژکێن کو نوو ژ هێکە دەردکەڤن ب سەربەستی مەلەڤەنی دکن".

ڕاستە کو ئەڤ مالبات گەلەك خوەندا و زانا گهاندییە ژ بۆ نەتەوەیێ کورد.

حەسەنێ پچوك ل بەر دەستێن مامێن خوە فێری زانستیێن ئیسلامی، فارسی و عەرەبی دبە. لێ ئەو هێ د خۆرتانی یا خوەدا بریار ددەکو ئەوێ مەلاتی نەکە، بدە سەر ڕێیەك دن.

دوێ دەمێ دە، رەزاخان ل سەر حوکم بو و رامیارییا (سیاسەتەك) وی مەهاندنا کوردان بو. حکومەتا تەهرانێ دەست دا بو سەرمال و ملکێن سەرۆکێن کوردان و وان سرگون کری بو، کارمەندێن عەجەم شاندبو کوردستانێ. ڤان کارمەندێن ب بەرتیلخوری و هشکاهییا خوە گوندیێن کورد زەحف دێشاندن. د سالێن 1926–1930 دە کورد د بن سەرۆکاتی یا ئیسماعیل ئاغا سمکۆ دە سەرێ هەڵقینن لێ د 1930 دە سمکۆ ب بێ بەختی تێکوشتن. د 1932 دە سەرهلانینا جافەر ئاغا سولتان ژی تێ پەرچقاندن. شاه هەمو تەشکیلاتێن جڤاکی و ئەدەبێن کوردی و ب کارانینا ڕەسمی‌یا زمانێ کوردی قەدەخە دکە و، د بەر دە ژی، ل چار ئالیێن وەلاتێ کوردا قەرەقۆلێن جەندرمان ب جه دکە.



خوەندایێن کورد وەکی مەلا ئەحمەدێ فەوزی، سەیفێ قازی، قازی محەمەد، قازی بۆکان، شێخ ئەحمەدێ سریلائاوا و گەلەك ڕوسپیێن دن دجڤین تەشکیلاتەکە ڤەشارتی داتینن ژ بۆ پاراستنت و پێشڤە برنا زمان و ئەدەبیاتا کوردی. ب هەزار زەحمەت و دژوارییان تەشکیلات ژ ئێراقێ کۆڤار و پرتوکێن کوردی تینە ئانین و ل خۆرتێن کورد بەلاڤ دکە. کۆمەك ژ وان خۆرتێن ناڤچەیا بۆکانێ سپارتبون مەلا ئەحمەدێ فەوزی: ئەوێ ئەڤ خۆرت ببن چاکترین هێڤیێن گەلێ کورد و ئێرانێ. د ناف وان دە حەسەن قزلجی یەك ژ چێترین شاگرتێن مەلا ئەحمەدێ فەوزی هەبو.

د شەڕێ جهانیێ دووەمین دە، هێزێن سۆڤیەتی باکورێ ئێرانێ، یێن بریتانی ژ نیڤرۆییێ وێ ئیشخال کربون. د ناڤبەرا هەردو ناڤچەیێن ئیشخالکری دە، کەرییەك ژ کورستانا ئێرانێ " no mans Land" ئانگۆ نە ملکێ کەسی بو، ژ هەر دەستەلاتی بیانی دور بو. ل وێ دەرێ پارتییا دەمۆکراتا کوردستانا ئێرانێ تێ دامەزراندن و حەسەن قزلجی ژی دبە ئەندامێ پارتییێ. د چلە 1946، پارتی ل مەهابادێ کۆمارا کوردستانێ ئیعلان دکە و پێشەوایێ پارتییێ قازی محەمەد د بە سەرۆك کۆمار. پێکانینێن ڤێ کۆمارێ نیشان ددن کو تەنێ حکومەتە کە نەتەوی خزمەتا گەل دکە. د دەمەکی کورت دە چەندین تشت هاتن پێکانین! تەنێ د وارێ وەشانێ دە، کۆڤارێن کوردستان، هاوار، ئاگر، هەلاڵە و نیشتمان هاتن دەرخستن. ڕۆژا ئیعلانا کۆمارێ، قازی محەمەد ل مەهابادێ خوەندە گەهەکە بلندا کەچان ڤەکر. حەسەن قزلجی بو سەرنڤیسکارێ کۆڤارا هەلاڵە، کو بە تایبەتی ژ بۆ کەچان دەرکەت. ئەوی وساژی د کۆڤارا کوردستان دە دنڤیسی.

هێمن (محەمەد ئەمین شێخول ئیسلام) کو یەك ژ دۆستێن نێزیکترینێن حەسەن قزلجی بو ب دلۆڤانی[1] ڕۆژەکە زڤستانا 1946 ب بیر تینە! دنیا گەلەك ساربو. ڕۆژ زوو چێ بوو، شەڤ تاری د کوچەیەك مەهابادێ دە ب سەر هێمن دە هاتبو. بایەك جەمدی لەشێ وی دتەڤی زەند و ئەوی، ب هێمن هەولا خوە، خوە دلەزاند ژ بۆ خوە بگهینە ستارەکێ. ژ نشکاڤا، چاڤێ وی ب قازی محەمەد دکەڤە. پێشەوا ل بەر دەریێ مالا خوە دچو و دهات، د دەستێ وی دە هەژمارا ڕۆژێ یا کوردستانێ و ئەو ب دەنگەکی بلند ب یەك ژ نڤیسکارێن ڕۆژنامێ رە دئاخڤی. "ئەز ژ سەرما درجفیم، دبێژە هێمن، و من د بەر خوە دە سلاڤ ل وان کرو خوە لە زاند. ئەوی من دیت.. و ئەزژوان دور، کەتبوم گاڤا کو دەنگێ وی هاتە گوهێن من".

–تە دیت، قیرییا، تشتێ کو ڤی قزلجییی نڤیسییە؟

من کورتە چیرۆکا نەفیسا کو وێ ڕۆژا د ڕۆژنامێ دە دەرکەوتبو باش دناسی.

–بەڵێ، بێگومان، من ئەو خوەند. ب ڕاستی گەلەك هێژایە.

–ڕاستە، گۆت هەڤالێ نڤیسکار، ئەو پرخوەش، لێ گەلەك کێم دنڤیسە!

پێشەوا قازی سەرێ خوە هێژاند، بشیری و پێ رەژ سەعدی شیرازی دوو بەیت خوەند[2].

من بهیست کو ل وەلاتێن ڕۆهەلات چل سال خەبات دڤێت ژ بۆ چێکرنا شەربکەکی فەرفوری.

د باژارێ بەغدایێ دە، ڕۆژێ ژ وان سەد چێ دکەن. گەلۆ تونها رومەتا ڤی شەربکی دزانی؟

سەرۆك کۆمار دفرکی و ل من دنهێرت:

–خوەزی د ناڤ مەدە کەسێن وەکی وی زەحف بونا! و بەری کو



ئەو بەرسڤا من ببهیسە، ئەوی وەکی کوژ خوە رە بپەیڤە، گۆت:

–کو ئەم سەرنجوە بونا ئەویٚ چەندین قابلیەت خوە نیشان دانا!

پشتی ڤەکشینا لەشکەریٚن سۆڤیەتی ژ ئیٚرانیٚ، حکومەتا تەهرانیٚ هیٚزیٚن خوە شاند سەر کۆمارا کوردی و سەرۆکیٚن وی داگرتن. قازی محەمەد، سەیفی قازی و سەدری قازی د بەربانگا 31 ئادار 1947 ل مەهابادیٚ دالەقاندن. لیٚ گەلیٚ کورد توجار ڤان میٚرخاسان ژ بیر نەکر. هەڵبەستڤان و هۆزان وان دستریٚن، گۆرا قازی محەمەد بو زیارەتگەهەکە پیرۆز ژ بۆ هەمو گەلیٚ کورد.

ژ بۆ حەسەن قزلجی و ژ بۆ دۆستیٚن وی یٚن هەڵبەستڤان هەژار و هیٚمن دەربەدەرییەکە دریٚژ و تژی جەفا دەست پیٚکر. غەیری سورگونیٚ ڕیٚیەك نەمابو. ئەو دچە ئیراقیٚ و ل ور نهیٚنی دژی. د شونا کو دکەڤە بیٚهیٚڤیتییٚ، حەسەن قزلجی دڤیٚ دەما تاری و دژوارده، دناڤ تونەبو نیٚ دە، دەست ب جیٚرباند نیٚن نوو دکە.

ئەو ڕاستی عەلائەدین سەجادی و ئیبراهیم ئەحمەد د بە و ئەڤ راست هاتن د بە کانییا نویتیان. ئەڤ هەردو نڤیسکار گوه نادن ئوسولیٚن کەڤنارەییٚن ئەدەبیاتیٚن فارسی و عەرەبی، ڕەمز و بەلاغەتیٚ ددن ئالی. حەسەن قزلجی ژی بالا خوە دده ژیانیٚ، ژیانا کوچیٚ، یا هەر ڕۆژیٚ، یا کوردان، دده سەر شۆپا ڕیالیزمیٚ. ڕیالیزما وی ژی تایبەتییە، نیٚرییا وی گەلەك نیٚزیکی قەوماندنیٚن ڕۆژانەیە، ئەو د هەوا گەرم و متەوازییا کوردیٚن ژ ڕیٚزیٚ دە دلڤە.

کورتە چیرۆکیٚن حەسەن قزلجی د کۆڤاریٚن بەغدایێ دە، و نەمازە د کۆڤارا هیوا (1957–1963)[3] ئاکو حافز ئەلقازی دەردخست، دە بەلاڤ دبن. پرانیا وان تیٚن وەرگەڕاندنە عەرەبی.

د سالا 1963، د دەما کو کوردیٚن ئیراقیٚ ژ بۆ ڕزگارییا خوەیا نەتەوەیی، دبن سەرۆکتییا مەلا موستەفا بارزانی دە، شەڕ دکرن، حەسەن قزلجی ئیٚراقیٚ دتەرکینە دچە سۆفیاییٚ جەم مالباتا خوە. ل ویٚ دەریٚ، ب سایا زانینا زمانیٚن بولگاری و ڕووسی، د ڕادیۆ بولگارستان دە دخەبتە. دبەر دەژی ژ کۆڤاریٚن کوردییٚن ئیراقیٚ رە نڤیسساران دشینە[4].

هەڤالیٚن حەسەن قزلجی، وەکی عەبدوڕەحمان قاسملوو، هەژار، هیٚمن و هنیٚن دن، نڤیساریٚن وی دجڤیٚنن و د 1972دە، د ناڤ وەشانیٚن بنکەی پیٚشەوا (وەشانیٚن پارتییا دەمۆکراتا کوردستان ئیٚرانی) بەرهەڤۆکا پیٚکەنینی گەدا[5] دەردخن.

کورتە چیرۆکیٚن حەسەن قزلجی ژ ئیعتیبارا خوە تشتەك وندا نەکرنە. ل ناڤچیٚ گەلەك گوهراندنیٚن سیاسی جیٚ بون لی، د بنگەهیٚ دە، جڤاکا کوردی پر نەگوهرییە. کول و ژانیٚن ویٚ هیٚ دۆم دکن: لەبەنگازییا گوندییان، کەدخوری و ستەما بەگ و شیٚخان، زۆردەستییا دەولەتیٚ. قزجلی ب زمانەکیٚ گەلەری و دەوڵەمەند دنڤیسینە و میٚرخاسیٚن وی ژ خەلکیٚنە. بویەریٚن ژیانا وان، ب بیرانینا فلان ئەداتان باوەرییا گەلەری نیشان ددن کو نڤیسکار کوراهییٚن ژیانا گەلیٚ خوە باش دناسە. گوندی ژ دەین و بیٚشان نکارە پشتا خوە ڕاست بکە: وەکی جۆت بەندیٚن گوندی نشوریٚ، د چیرۆکا هیٚلکەی هادی خانی دە، کو مەجبورن ژ ئاغاییٚ گوند رە پیتاك، پوشانە، رونانە، کاوڕانە، خوریانە، مووانە، فڕووجانە، بیٚگارانە بدن و ب سەردە بیٚشەك ب ناڤیٚ تاپۆ، کو نیڤ ئان سیٚیەکا هاتنە زاد، مەیوە ئان سەبزەیە، بدن. ئوگاڤا کو گوندییٚ بەلەنگاز نکارە ژ بن ڤان بیٚشان ڕانە، ئاغا ئان نیشانەییٚ وی دەست دانینن سەرماڵیٚن وی. بەڤی ئاوایی، د پیٚکەنینی گەدا دە، حاجی ساڵح دەست داتینە سەر گاییٚن جۆتیٚن گوندییەکی بەخت ڕەشیٚ کو زادیٚ وی کولیان خوارییە. مالباتا گوندی پەریشان دبە: زارۆیی خوریا دمرە، ژنك ژی تاییٚ و ژ دەردان! گوندی دەست ب پارشیٚ دکە، دکەڤە سەر ڕییان و وەکی گەلەك گوندییٚن بەلەنگاز خوە داڤیٚژە بازیٚڕ، ب هیٚڤییا پەیداکرنا کارەکی.

حەسەن قزلجی ڕەخنە ل ون دگرە. د نوشتەکەی ئامینە خان دە ژنکەك ژار، ژنیٚن بەلەنگازیٚن دن رە نڤشتان چیٚ دکە ژ بۆ دەرمان کرنا هەمو دەردیٚن وان!

تەڤی ریالیزمیٚ حەسەن قزلجی دده خەیال و ئەفسانیٚ ژی. کەشکۆڵی جادوویی چیرۆکا غەمگینا گوندییٚین پەریشانیٚن بن نیریٚ ئاغایەکیٚ غەدارە. کوریٚ مالباتا گوندی ب سایا کەشکۆلەکی جادوویی و ب سەر ئەردیٚ باڤ و کالیٚن خوە ژ ئاخا دستینە.

پشتی کەتنا ڕەژیما شاه، حەسەن قزلجی د 1979 دە ڤەگەریا بو ئیرانیٚ. ئەو ئەندامیٚ پارتییا تودە بو و ژ 1979 پیٚڤە بەرپرسیاریٚ ڕۆژناما نامەیێ مەردوم بو. ئەو د شەباتا 1984 دە هاتبو گرتن. ژویٚ دەمیٚ دە هایا هەڤالیٚن وی ژیٚ تونە بو. ب مرنا تراژیکا حەسەن قزلجی گەلیٚ کورد یەك ژ کوڕیٚن خوەیٚن سادق و وەفاکارتر و ئەدەبیاتا کوردی و جهانیٚ چیرۆك نڤیسەکی مەزن ونداکرن.

1–پیٚشگۆتنا هیٚمن د پیٚکەنینی گەدا، ل 8.

2–گولستان.

3–نوشتەکەی ئامینەخان، هیوا، ژ 30، 1960– کەشکۆڵی جادوویی، هیوا، ژ 31، 1961– شەهیدی زوڵمە کفن و شۆردنی ناویٚ، هیوا، ژ 33، 1961.

4–بنیٚڕە، لە بارەی هەندیٚ لە نهیٚنییەکانی ڕیٚزمانی کوردی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، جلد 5، بەغدا، 1977، ل 113–134.

5–دڤیٚ بەرهەڤۆکا 149 ڕوپەلدا چاردە کورتە چیرۆك هەنە. چاپا دووەمینا ڤیٚ بەرهەڤۆکیٚ دڤان نیٚزان دە ل ئیٚراقیٚ دەرکەت و بەرهەڤۆك ل ئیرانیٚ ژی د چاپیٚ دەیە.

سەرچاوە: گۆڤاری "هیٚڤی" پاریس، ژ 4، ئەیلوولی 1985.

